# ڕوونکردنەوەی
# ( اَلْعَقِيدَةُ الطَّحاوِيَّةُ )
( للإمام الطحاوي )

## لە سەر ڕاڕەوی
## ( أهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَماعَةِ )

(مَذْهَبُنا جاءَ حَلِياً خالِصا * مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ تَخَلَّصا)

دانانی
**عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی**

چاپی سێیەم
پوختەو زیادکراوە

شعبان-١٤٢٨ی کۆچی
گەلاوێژ-٢٧٠٧ی کوردی
ئاب-٢٠٠٧ی زایینی

لە سەر ئەرکی کتێبخانەی حاجی‌قادری‌کۆیی- لە هەولێر- چاپ کراوە

ژمارەی سپاردن- لە بەڕێوەبەرایەتی‌گشتی‌کتێبخانەکان-(٩٢٣) سالی(٢٠٠٧)

ناوی کیتاب: **ڕوونکردنەوەی (العقیدة الطحاویة).**
دانەر: **عبداللە عبدالعزیز هەرتەلی.**
چاپ: **سێیەم.**
تیراژ: (٢٠٠٠) **دانە.**

***دانراوەکانی تری دانەر:***

١- **ڕوونکردنەوەی (متن فتح القریب).**
٢- **ڕوونکردنەوەی (الأربعین النواویة).**
٣- **(عەقیدەی ئیسلامی).**
٤- **هۆنراوەی (ئیمان و ئیسلام).**
٥- **چەند گوڵێك لە (گوڵزاری ئیسلام).**
٦- **ڕوونکردنەوەی (منهاج الطالبین) لە (٥) بەرگدا.**
٧- **ڕوونکردنەوەی (قطر العارض فی الفرائض).**
٨- **چۆنیەتی حەج و عومرە.**

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

## تکایە بە وردی بیخوێنەوە

اَلْحَمْدُ لِلّه نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِه مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنا، مَنْ يَهْدِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، اَللَّهُمَ صَلِّ عَلى مُحَمَّد وَعَلى آلِ مُحَمَّد كَمَا صَلَّيْتَ عَلى إِبْراهِيمَ وَعَلى آلِ إِبْراهِيمَ فِي الْعَالَمِينَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، وَسَلِّمْ تَسْليماً كَثِيراً.

ئەی موسوڵمانی بەڕێز، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُوا﴾ آل عمران:١٠٣، دەست بە ئایینی خواوە بگرن‌و پەرتەوازە مەبن. واتە: لە قورئان‌و حەدیس‌و کۆمەڵی موسوڵمانی جیا مەبنەوە. هەروەها ئەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ آل عمران:١٠٥، ئێوە -ئەی موسوڵمانان- وەکو جولەکەو دیانەکان مەبن کە پەرتەوازە بون‌و لە ئایینی خودا -بە هەوەسی خۆیان- ڕای جیا جیایان گرتە بەر، پاش ئەوەی بەڵگەی ئاشکرایان بۆ هات: کە یەککۆمەڵی باشەو پەرتەوازەیی خراپە، ئەم پەرتەوازەچیانە سزایەکی گەورەیان بۆ ئامادە کراوە.

پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ تَفَرَّقُوا فِي دِينِهِمْ عَلَى ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ مِلَّةً، وَتَفْتَرِقُ هَذِهِ الأُمَّةُ عَلَى ثَلاثٍ وَسَبْعِينَ مِلَّةً -يَعْنِي الأَهْوَاءَ- كُلُّهَا فِي النَّارِ إِلاَّ وَاحِدَةً: وَهِيَ الْجَمَاعَةُ، وَفِي رِوَايَةٍ: مَا أَنَا عَلَيْهِ الْيَوْمَ وَأَصْحَابِي﴾ رواه الترمذي، والحاكم، جووەکان‌و دیانەکان لە ئایینی خۆیاندا پەرتەوازە بون‌و بوونە حەفتاو دوو گرۆه، ئوممەتی منیش پەرتەوازە ئەبێ‌و ئەبێتە حەفتاو سێ گرۆه -بە هەولو هەوەسی خۆیان- ئەو گرۆهانە گشتی بۆ دۆزەخە، تەنها یەك گرۆه نەبێ: کە کۆمەڵە، ئەو کۆمەڵەی لە سەر ڕێبازی ئێستای من‌و (صحابة)ی منە.

ئینجا بزانە: لە ووشەی (أَهْلَ الكِتَاب)و (هَذِهِ الأُمَّة) دەر ئەکەوێ کە مەبەست بەم گرۆهانە: گرۆهی ئایینین، نەك گرۆهی (علماني)!!!، چونکە لە کاتی پەرتەوازەی جوو و دیانەکان (علمانية) نەبو، (علماني)یەکانی ئێستاش بە ناوی ئوممەتی ئیسلام گرۆهەکەی خۆیان پێك ناهێنن. ئینجا لە بەر ئەوەی ئەم حەفتاو دوو گرۆهە ئایینیانە گشتی گومڕاو سەرلێشێواون، بە (أَهْلُ البِدْعَةِ وَالضَّلاَلَة) ناو ئەبرێن.

هەروەها تاکە کۆمەڵەکەی لە سەر ڕێبازی پێغەمبەرﷺو (صحابة)کانە، بە (أَهْلُ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَة) ناو ئەبرێن، چونکە باوەڕیان بە قورئان‌و حەدیسە (صحيح)کانی پێغەمبەرﷺ

هەیە-کە لە (بخاري)و (مسلم)و (ترمذی)و (نسائي)و (أبوداود)...هتددایە-و باوەڕیان بە (خلافَةالرَّاشدین) هەیە: کە (أبوبکر و عمر و عثمان و علي)یەو لە ڕیزی ئەم چوار خەلیفانە لانادەن‌و گشت (صحابة)ی پێغەمبەرﷺ بە دادپەروەر ئەناسن‌و ڕێز لە گشت زانایانی (السَّلَف الصَّالح)(١) ئەنێن‌و لە یەکدەنگی (إجماع)ی زانایانی ئیسلام دەرناچن ...هتد: کە لەم عەقیدەدا باسی ئەکەین، إنْ شاءَ الله تعالی.

ئینجا بزانە: ئێستا چەند گرۆهێك لەم حەفتاو دوو گرۆهەی (أهْلُ البدْعَة وَالضَّلاَلَة) لە وڵاتانی ئیسلامدا هەنە، کوردستانی ئێمەش چەند گرۆهێکی لەم حەفتاو دوو گرۆهەی تێدایە: وەکو (شیعَة)و (خَوارج)و (مُجَسِّمة)و (مُشَبِّهَة)و...هتد، ئینجا ئەم گرۆهانە بۆ چەسپاندنی (بدعة)و (ضلالة)و گومڕاکردنی موسوڵمانان: سیاسەتی (حَصْرالمَصادر) (٢) -واتە: (کورتکردنەوەی سەرچاوەکانی زانست لە چەند سەرچاوەیەکی تایبەتدا)- بە کار ئەهێنن‌و بە شێوەیەکی وەها هێرش ئەکەنە سەر زانایانی ڕابردووی ئیسلام: کە لاوەکانی ئیسلام وایان لێبێ: (ئەفەندی)یەکی خاوەن شەهادەی ئەوروپی، بە زاناترو بەڕێزتر

(١)-مەبەست بە (السَّلَفُ الصَّالح): زانایانی سەدەی یەکەم‌و دووەم‌و سێیەمی کۆچی‌یە، هەروەك لە شوێنی خۆیدا باسی ئەکەین، إنْ شاءَ الله تعالی.

(٢)-سیاسەتی (حَصْر المَصادر) ئەوەیە: سەرکردە، یان مامۆستا، یان هەر ئەندام حزبێکی‌تر، چەند سەرچاوەیەکی تایبەت بۆ قوتابی دیاری بکەن‌و لە سەرچاوەی زانستەکانی‌تر قەدەغەی بکەن، یان لە لای ناشیرین بکەن: تاکو-جگە لە سەرچاوەکانی دیارکراو- باوەڕی بە هیچ سەرچاوەیەکی‌تری زانست نەبێ‌و نەشتوانی زانستێکی وەها وەدەست بێنێ: کە ڕێگەی ڕاستی پێ بدۆزێتەوە، تاکو بەردەوام لە شوێنکەوتنی کوێرانەدا بمێنێتەوە، کەواتە: هەرکەسێك سەرچاوەی هەمەجۆر بخوێنێتەوە، شارەزای ڕاستی ئەبێ‌و چەوتی ئەوانیشی بۆ ئاشکرا ئەبێ‌و شوێنکەوتەیان نابێ، کەوابوو: ئەم سیاسەتە بۆ بەرژەوەندی ئیسلام نیە، بەڵکو بۆ بەرژەوەندی کەسێکی، یان گرۆهێکی، یان مەزهەبێکی چەوت‌و ناڕەوایە، کە نایانەوێ چەوتییان ئاشکرا ببێ؟ نەوەك دۆست‌و لایەنگریان کەم ببنەوە.

جا ئەی موسوڵمانی خۆشەویست، وا بە چاوی خۆت ئەبینی: کە گرۆهەکانی (البدعة والضلالة) چۆن پێت ئەڵێن: تەنها ئەم نامیلکەیە بخوێنەوەو ئەڵێن: ئەم کتێبە باش نیەو مەیخوێنەوە، ئەو هەموو کتێبانەی (عَقیدَة)و (تفسیر)و (شرح حدیث)و (شەریعەتی ئیسلام) لە لای ئەوان گشتی ناتەواو و باوەڕ پێنەکراوە، تەنها چەند نامیلکەیەکی ڕەنگاو ڕەنگ نەبێ: کە سەرانی خۆیان -بۆ مەبەستێکی تەسکی مەزهەبی- نووسیویانە، ئەوەندە دوژمنی (أهْلُ السُّنَّة وَالجَماعَة)ن: کە هیچ ڕێزێك بۆ (إجماع) یەکدەنگی زانایانی (السَّلَفُ الصَّالح) دانانێن‌و لایان وایە: ئەو هەموو زانا بەڕێزانە گشتی لە هەڵەدا ژیاون‌و لەسەر هەڵە مردون‌و تەنها خۆیان لە سەر ڕێگەی ڕاستن، جا ئێمە لێیان ئەپرسین: ئایا ئەگەر ئەو هەموو زانا بەڕێزانە بە هەڵەدا چوبن، ئێوە ڕێگەی ڕاستتان چۆن دۆزیەوە؟ ئایا ئەگەر بگونجێ ئەو هەموو زانایانە بە تێکڕایی بە هەڵەدا بچن، چۆن پێغەمبەرﷺ ئەیفەرموو: ﴿إنَّ الله لاَ يجْمَعُ أُمَّتي عَلَى ضَلاَلَة﴾ رواه الترمذي، خوای گەورە ئوممەتی من لە سەر گومڕایی کۆ ناکاتەوە؟، کەوابوو: ئەم حەدیسە بەڵگەیە: کە ئێوە گومڕان‌و لە (إجماع)ی زانایان دەرچوون ﴿وَمَنْ شَذَّ شَذَّ إلَى النَّـار﴾ رواه الترمذي، هەر کەسێك لە یەکدەنگی زانایان دەرچێ: بەرەو دۆزەخ دەر ئەچێ!. ڕوونکەرەوە.

تەماشا بکەن لە زانایەکی (السلف الصالح)ی خاوەن شەهادەی پێغەمبەرﷺ[٣] بە تایبەتی لە کوردستاندا بە ناوی (السَّلف الصَّالح) بانگەوازیەکی وا ئەکەن: کە لاوەکانیان لە ڕێبازی (أَهْلُ السُّنَّة وَالجَماعَة) لادەن‌و بەرەو گومڕایی (أَهْلُ البدْعَة وَالضَّلاَلَة) ئەیانبەن.

(حُذَيفة)ﷺ، لەم بابەتە پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ کردو گوتی: ﴿...فَهَلْ بَعْدَ هَذَا الْخَيْرِ مِنْ شَرٍّ؟ قَالَ: نَعَمْ دُعَاةٌ عَلَى أَبْوَابِ جَهَنَّمَ مَنْ أَجَابَهُمْ إِلَيْهَا قَذَفُوهُ فِيهَا، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ صِفْهُمْ لَنَا، قَالَ: هُمْ مِنْ جِلْدَتِنَا، وَيَتَكَلَّمُونَ بِأَلْسِنَتِنَا، قُلْتُ: فَمَا تَأْمُرُنِي إِنْ أَدْرَكَنِي ذَلِكَ؟ قَالَ: تَلْزَمُ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ وَإِمَامَهُمْ، قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُمْ جَمَاعَةٌ وَلاَ إِمَامٌ؟ قَالَ: فَاعْتَزِلْ تِلْكَ الْفِرَقَ كُلَّهَا وَلَوْ أَنْ تَعَضَّ بِأَصْلِ شَجَرَةٍ حَتَّى يُدْرِكَكَ الْمَوْتُ وَأَنْتَ عَلَى ذَلِكَ﴾ رواه الشيخان، ئایا لە پاش ئەو چاکەیە خراپە ئەبێ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ،

[٣] یەکێك لەو زانایانەی هەڵگری شەهادەی پێغەمبەرنﷺ (خَوارِجْ) دژایەتی ئەکەن: ئیمام (أَبوالحَسَنْ الأَشْعَرِی)یە، ئیمامی (أَشْعَرِی) یەکێکە لە زانایانی (السَّلَفُ الصَّالح) چونکە لە سەدەی سێیەمدا لە ساڵی (٢٦٠)ی کۆچی لە دایك بووە، خوای گەورە تەمەنی درێژ کردوە، تا (٢٣) ساڵیشی لە سەردەمی (خَلَفْ) تەواو کردوە، چونکە لە ساڵی (٣٢٤)ی کۆچی‌دا وەفاتی کردوە، کەوابوو: لە سەر مەزهەبی (سَلَفْ)و (خَلَفْ) بەرگری لە (عَقیدَة)ی ئیسلام کردوە.

ئیمامی (أَشْعَرِی) هاوچەرخی ئیمامی (الطحاوي) بوو، ئەژادیشی ئەچێتەوە سەر حەزرەتی (أَبومُوسَى الأَشْعَرِی‌ﷺ) کە یەکێکە لە (صحابە) بەڕێزەکانی پێغەمبەرﷺ ئەو بەڕێزە لە پێشدا (معتزلة) بوو، بەڵام تۆبەی کردو، گەڕاوە سەر ڕێڕەوی (أَهْلُ السُّنَّة وَالجَماعَة)، لە فقەکانی ئایینیش هاتە سەر مەزهەبی (الشَّافعی)، لەگەڵ ئیمام (أبومنصورالماتردی)—کە ئەویش هاوچەرخی خۆی بوو و لەسەر مەزهەبی (الحنفی) بوو— بەرگرییان لە (عَقیدَة)ی ئیسلام ئەکرد.

ئیمامی (أَشْعَرِی) کتێبی (الإبانة عن أصول الديانة)ی لە سەر ڕێڕەوی (السلف) دانا، ئینجا کە دیتی (أَهْلُ البدْعَة) خۆیان تێکەڵی (متشابهات القرآن) ئەکەن‌و ئەڵێن: خوا ئەندامو لاشەو شوێنی هەیە، ناچار—بۆ دەمکوتکردنی ئەوانە— کتێبی (اللمع فی الرّد علی أهل البدع)ی دانا، کە دوایین دانراویەتی لە سەر ڕێڕەوی (أَهْلُ السُّنَّة وَالجَماعَة)، شێوەی (خَلَفْ)ی تێدا بەکار هێناوە.

دەربارەی هۆزی (الأشعري) پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿نِعْمَ الْحَيُّ الأَشْعَرِيُّونَ، لاَ يَفِرُّونَ فِي الْقِتَالِ وَلاَ يَغُلُّونَ، هُمْ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُمْ﴾ رواه الترمذي، واتە: باشترین هۆز: (أَشْعَرِی)یەکانن، لە جەنگدا نایەزن‌و دزیش لە تاڵان ناکەن، ئەوان لە منن‌و منیش لە ئەوانم. ئەو شەهادە بەرزە—کە ئەفەرموێ: ﴿هُمْ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُمْ﴾ رواه الشيخان أيضاً— گەورەترین سەربەرزییە بۆ ئیمامی (أَشْعَرِی)و، هۆزەکەی.

ئینجا بزانە: دژایەتی (أَهْلُ البدْعَة) —بە تایبەتی (خَوارِجْ)— ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئیمامی (عَلی)ﷺ، واتە: (خَوارِجْ) لە لەشکری ئیمامی (عَلی) جیا بونەوەو گوتیان: (عَلی) کافر بووە، هەروەها (أَبومُوسَى الأَشْعَرِی)ش کافرە، چونکە نوێنەری ئیمامی (عَلی) بووەو بە(تحکیم) ڕازی بوو، جا لەو ڕۆژەوە (خَوارِجْ) لەگەڵ (أَشْعَرِی)یەکان بوونە دوژمن، واتە: چونکە ئەژادی (أَبوالحَسَنْ الأَشْعَرِی) ئەچێتەوە سەر (أَبومُوسَى الأَشْعَرِی)، ئێستاش (خَوارِجْ) هەر دژایەتی ئەکەن‌و ئەڵێن: (عَقیدَة)ی (أَشْعَرِی) خراپە، هەروەها ئەڵێن: (أَشْعَرِی)یەکان لە (أَهْلُ السُّنَّة وَالجَماعَة) نین، جا ئەی موسوڵمانی بەڕێز، لەو ڕوونکردنەوەیەدا بۆت ئاشکرا بوو: کە (أَبوالحَسَنْ الأَشْعَرِی) یەکێکە لە زانایانی (السَّلَفُ الصَّالح)و لە سەر ڕێڕەوی (أَهْلُ السُّنَّة وَالجَماعَة)یە، بە ناهەق (خَوارِجْ) دژایەتی ئەکەن‌و بوختانی پێ‌ئەکەن‌و ڕاستی چەوت ئەکەن. ڕوونکەرەوە.

کۆمەڵێکی بانگەوازکار لە سەر دەرگەی دۆزەخن هەرکەسێك بە دەم بانگەوازیەکەیان بچێ فڕێی ئەدەنە ناو دۆزەخ. گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمان ڕوون بکەوە: ئەو بانگەوازکارانە چۆنن؟ فەرمووی: ئەوانیش لە هۆزی ئێمەنەو بە زمانی ئێمە گفتوگۆ ئەکەن. گوتم: چ فەرمانێکم پێ ئەکەی ئەگەر ئەو وەزعەم گەیشتێ؟ فەرمووی: کۆمەڵی موسڵمانانو پێشەوای موسڵمانان بگرەو لێیان جیا مەبەوە. گوتم: ئەگەر کۆمەڵو پێشەوایان نەبو، چی بکەم؟ فەرمووی: خۆت لەو هەموو گرۆهانە جیا بکەوە بە گشتی، هەرچەند بە ددان بنکە دارێك بگری تا ئەمریت، تۆ لە سەر ئەم جیابوونە بمێنەوە.

ئەی موسڵمانی بەڕێز: ئەم پەرتەوازەیەی (أَهْلُ البِدْعَة وَالضَّلاَلَة) ئەنجامی ئەدەن، گشتی بۆ قازانجی (کُفْر)ەو بە پشتیوانی (کُفْر)ە، چونکە (کُفْر) بۆ زاڵبوون بە سەر ئیسلامدا بەرنامەی داناوەو ئەڵێ: (فَرِّقْ تَسُدْ) پەرت بکە گەورە ئەبی. هەروەها ئەڵێ: (حَارِبِ الإِسْلاَمَ بِالإِسْلاَم) بە ئیسلام جەنگ لەگەڵ ئیسلام بکە.

بەڵێ: (کُفْر) زۆر بایەخ بە (أَهْلُ البِدْعَة وَالضَّلاَلَة) ئەداو بە ناوی ئیسلام چەند مەڵبەندێکی جۆراو جۆری خێرخوازییان بۆ ئەکاتەوە، هەر لە ڕێگەی ئەم مەڵبەندانەش چەند قوتابخانەی بە ناو بانگەوازی ئیسلامی ئەکەنەوەو لە وانەکاندا ژەهر تێکەڵی هەنگوین ئەکەنو ئەڵێن: ئێمە تایبەتی ئیسلام نوێ ئەکەینەوەو (بدعة)و (ضلالة) لەناو ئەبەین، ئێمە تەنها ڕەفتار بە قورئانو حەدیس ئەکەین. (بەڵام لە ڕاستیدا: هیچ لە قورئانو حەدیس نازانن، مەزهەبی ئەوان (طابور)ی پێنجەمە لە ناو ئیسلامدا).

ئینجا ئەی موسوڵمانی خۆشەویست: پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری ئێمەی کردوەو ئەفەرموێ: ﴿عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ﴾ رواه الترمذي، ئێوە ڕێبازی منو هەر چوار (خليفة)کانی دوای من بگرنە بەر. شتێکی ئاشکرایە: ڕێبازی پێغەمبەر ﷺو چوار خەلیفەکان لە ڕێگەی (السلف الصالح)ەوە گەیشتۆتە ئێمە، لەو پێڕاگەیاندنەدا ئەوان هیچ خیانەتیان نەکردوە، ئینجا لەوانیشەوە چینی (خَلَفْ) بە پوختەکراوی زانستی ئیسلامیان لە ناو کتێبەکانیاندا تۆمار کردوەو بە بێخیانەت قورئانو حەدیسیان ڕوون کردۆتەوە.

ئەو زانایانەی ئیسلام: چینی (سَلَفْ)و (خَلَفْ) هەردووکیان میراتگری پێغەمبەرن ﷺ، بۆیە ئەگەر زانایانی (سَلَفْ) لە سەر بڕیارێکی شەرعی ئیسلام یەکدەنگ بوبن، زانایانی (خَلَفْ) وەکو قوتابیەکی دڵسۆزی ئیسلام ڕێزیان لە (إجماع) یەکدەنگی (سَلَفْ) ناوەو ڕەفتاریان پێ کردوە، کەوابوو: واجبە ئێمەش ملکەچی (إجماع) یەکدەنگی (سَلَفْ) بینو ڕەفتاری پێ بکەین، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ لاَ يَجْمَعُ أُمَّتِي عَلَى ضَلاَلَة، وَيَدُ اللهِ مَعَ الْجَمَاعَة، وَمَنْ شَذَّ شَذَّ إِلَى النَّار﴾ رواه الترمذي، خوای گەورە

ئوممەتی من لە سەر گومڕایی کۆناکاتەوە، دەستی یارمەتی خوا لەگەڵ کۆمەڵدایە، هەرکەسێك لە (إجماع) یەکدەنگی زانایان دەرچێ گومڕا ئەبێ‌و بەرەو ئاگر دەڕنەچێ.

ئەی موسوڵمانی خۆشەویست: منیش-وەکو قوتابیەکی(السلف الصالح)- بۆ ڕوونکردنەوەی ڕارەوی (أَهْلُ السُنَّةِ وَالْجَماعَةِ) ویستم خزمەتێك پێشکەش بە لاوی کوردی موسوڵمان بکەم، بۆیێ ناوی خوام هێناو دەستم کرد بە ڕوونکردنەوەی (العَقِيدَةَ الطَّحاوِيَّة) کە یەکێکە لە (عَقيدَة)ەکانی باوەڕپێکراو، ئیمامی (أَبُو جَعْفَرِ الطَّحاوِي) لە سەر ڕارەوی (أَهْلُ السُنَّةِ وَالجَماعَةِ) دایناوە[١].

ئینجا بە پشتیوانی خوای گەورە، بە شێوەیەکی وەها ڕوونی ئەکەمەوە: کە بانگەوازکارانی (البِدْعَةِ وَالضَّلالَة) دەمکوت ببن‌و چیتر لاوەکانی کوردی موسوڵمان تەفرە نەدەن‌و سەریان لێنەشێوێنن، بە شێوەیەکی وەها-بە یارمەتیخوا- ڕوونی ئەکەمەوە: کە لاوی کوردی موسوڵمان بە بەڵگە دڵنیا بکاو وەهای لە (عَقيدَة)ی (أَهْلُ السُنَّة) شارەزا بکا: کە بە بەڵگەی بەهێز مەیدان بخوازێتەوەو بە بانگەوازکارانی(البدعة والضلالة) بڵێ: (ئەوە ئەڕێو ئەوە گەز). سوپاس بۆ خوا، فێڵبازی ئێوەمان بۆ ئاشکرا بوو، جارێکیتر بە گوتەی سەرقۆڕو بێ ئاڵۆزی ئێوە هەڵناخەڵەتێین.

ئینجا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم (عَقيدَة)یە، سوودم لە چەند سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو وەرگرت، وەکو:

١)-(الإعتقاد) على مذهب السلف وأصحاب الحديث. دانراوی ئیمامی (البيهقي) چاپی یەکەم، ساڵی (١٤٠١)ی کۆچی (دار الآفاق الجديدة) بيروت.

٢)-(شرح صحيح مسلم) دانراوی ئیمامی (النواوي) چاپی حەوتەم، (١٣٢٧)ی کۆچی -بهامش القسطلاني- (دار أحياء التراث العربي) بيروت.

٣)-(فتح الباري شرح صحيح البخاري) دانراوی ئیمام (إبن حجر العسقلاني) چاپی یەکەم (١٤١٠)ی کۆچی، (دار الكتب العلمية) بيروت.

٤)-(الإتقان في علوم القرآن) دانراوی ئیمام (جلال الدين السيوطي)، چاپی (١٩٧٣)ی زایینی، (المكتبة الثقافية) بيروت.

---

[١]- عەقیدەی (الطَّحاوی) دانراوی ئیمام (أبوجعفر أحمد بن محمد الطحاوي)یە، ئەم بەڕێزە یەکێکە لە زانایانی (السَّلَفُ الصَّالِح) چونکە لە سەدەی سێیەمدا لە ساڵی (٢٣٩)ی کۆچی لە دایك بووە، خوای گەورە تەمەنی درێژ کردوە، تا (٢٠) ساڵیشی لە سەردەمی (خَلَفْ) تەواو کردوە، چونکە لە ساڵی (٣٢١)ی کۆچی وەفاتی کردوە، کەواتە: ئەم بەڕێزەش هاوچەرخی ئیمامی (أشْعَرِی) بوو، لە گێڕانەوەی حەدیس بە باوەڕ پێکراو ناسراوە، لە (فقه)ی ئیسلامیدا دەستێکی باڵای هەبوو، چونکە دەرسی (فقه)ی لە لای ئیمامی (المزني) خوێندوە، کە خاڵی خۆی بوو و قوتابی ئیمامی (الشَّافِعِی) بوو، بەڵام: کە تەمەنی بووە (٢٠) ساڵ: چووە سەر مەزهەبی ئیمامی (الحَنَفِی)، کەواتە: ئیمامی (الطحاوي) بە شەرعزانێکی (الحَنَفِی) ناسراوە، خوا لە هەموانیان ڕازی بێ، آمین.

٥)–(فتح المبين شرح الأربعين النواوية) دانراوی (إبن حجر الهيتمي)، چاپی (١٣٢٠)ی کۆچی، (المطبعة العامرة الشرفية) مصر.
٦)–(شرح العقيدة الطحاوية) دانراوی (إبن أبی‌العز الدمشقی) چاپی سێیەم، (١٤١٢)ی کۆچی، (مؤسسة الرسالة) بیروت.
٧) (تحفة المريد علی جوهرة التوحيد) دانراوی (ابراهيم البيجوري) چاپی (١٣٢٠)ی کۆچی، (المطبعة اليمنية) مصر.
٨)–(نثر اللآلی علی نظم الأمالي) دانراوی (السيد عبدالحميد الألوسي) چاپی (١٣٣٠)ی کۆچی، (مطبعة الشابندر) بغداد.
جگە لەمانەش، لە چەند سەرچاوەیەکی‌تر سوودمان وەرگرتووەو لە شوێنی خۆی‌دا ئاماژەیان بۆ ئەکەین، هەر سەرچاوەیەکیش–کە ناوی ئەهێنین– لاپەڕەکەش دیاری ئەکەین، تاکو دڵنیا ببی‌و بە ئاسانیش شوێنی باسەکە بدۆزیەوە، بەڵام ئەی موسوڵمانی بەڕێز ئاگاداریە: هەر کاتێك ئاماژە بۆ سەرچاوەیەك ئەکەم–ئەوە لە هەموو شوێنێکدا– وا ناگەیەنێ: کە من دەققی فەرموودەکەی ئەوم وەرگێڕاوە، بەڵکو بە زۆری مەبەستم ئەوەیە: پوختەی باسەکەم کردۆتە کوردی. هەروەها بە زۆری ئەبینی: دوو سەرچاوە، یان زیاترم نووسیوە، چونکە باسەکەم لە گشتیان پێك هێناوەو بە پوختەکراوی نووسیومە، کەوابوو: ئەگەر گومانت لێپەیدا بوو–بۆ دڵنیایی– بڕوانە گشت سەرچاوەکانی باسەکە، بەم ئاماژەیە: (ل) واتە: لاپەڕە، (ب) واتە: بەرگ.
ئینجا ئەگەر فەریکە خوێندەوارێکی تەفرەدراو، یان بانگەوازکارێکی (البدعة والضلالة) گوتی: ئەم سەرچاوانە جێگەی باوەڕ نین، یان گوتی: ئەو زانایانە شارەزای (عَقِيدَة) نین، لە وەڵامی‌دا بڵێ: ئەی جەنابی پێنەگەیشتووی ناتێگەیشتووی سەدەی پانزەمی کۆچی، جەنابت سەرت لێشێواوەو لە کاروانی میراتگرانی کۆچکەرﷺ بەجێ ماوی، پێی بڵێ: ئەو زانا بەڕێزانە شۆڕەسواری مەیدانی میراتی پێغەمبەرن‌وﷺ قوتابی قوتابخانەی (أَهْلُ السُّنَّة وَالجَمَاعَة)ن‌و بە پەیڕەوی (السلف الصالح) پێگەیشتون، بەڵام جەنابت پیادەی مەیدانی تۆپی پێی‌و قوتابی قوتابخانەی (علمانية)ی سەدەی بیستەمی زایینی‌و بە ئامیلکۆکەی ڕەنگاوڕەنگ پێناگەیی‌و هەر بە فەریکی ئەمێنیەوە، گومانم نیە: جیاوازی ئەوان‌و ئێوە ئاسمان‌و ڕیسمانە، بەڵام داخەکەم (نادان) بە ناوی سارد‌و شیرین ئەڵێ: تاڵە. (چاوێشیش) ڕقی لە تیشکی ڕۆژە.

عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی
هەولێر –کوردستان
محرم ١٤١٦ی کۆچی

بسم الله الرحمن الرحيم

اَلْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، قَالَ العَلاَّمَةُ حُجَّةُ الإِسْلاَمِ أَبُوجَعْفَرَ الْوَرَّاقُ الطَّحَاوِى -بمصر- رحمه الله: هَذَا ذِكْرُ بَيَانِ عَقِيدَةِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ عَلَى مَذْهَبِ فُقَهَاءِ الْمِلَّةِ: أَبِي حَنِيفَةَ النُّعْمانِ بنِ ثَابِتِ الْكُوفِيِّ، وَأَبِي يُوسُفَ يَعْقُوبَ بنِ إِبْرَاهِيمَ الأَنْصَارِى، وَأَبِي عَبْدِاللهِ مُحَمَّدِ بْنِ الْحَسَنِ الشَّيْبَانِي رضوان الله عليهم أجمعين، وَمَا يَعْتَقِدُونَ مِنْ أُصُولِ الدِّينِ وَيَدِينُونَ بِهِ رَبَّ الْعَالَمِينَ: نَقُولُ فِي تَوْحِيدِ اللهِ مُعْتَقِدِينَ بِتَوْفِيقِ اللهِ: إِنَّ اللهَ وَاحِدٌ لاَ شَرِيكَ لَهُ،

---

## لەبارەی ﴿باسی تاك و تەنیایی خوا (تَوْحِيدُ اللهِ تَعَالَى)﴾

ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(نَقُولُ فِي تَوْحِيدِ اللهِ) ئێمە دەربارەی (تَوْحِيدِ اللهِ) یەكخوا ناسین= باوەڕ بە تاكو تەنیایی خوا، ئەڵێین: (مُعْتَقِدِينَ بِتَوْفِيقِ اللهِ)-بە پشتیوانیخوا- باوەڕمان هەیە (إِنَّ اللهَ وَاحِدٌ) خوای گەورە یەكە (لاَ شَرِيكَ لَهُ) هاوبەشی نیە: نە لە زاتو سیفەتدا، نە لە پەروەردگاریدا، نە لە خوایەتیدا.

(ابن أبيالعزّ) ئەفەرموێ: یەكەم بانگەوازی هەموو پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام، بۆ یەكخواناسین بوو، واتە: باوەڕ بە تاكو تەنیایی خوا، خوایگەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لاَإِلَهَ إِلاَّأَنَا فَاعْبُدُونِ﴾ الأنبياء:٢٥، لە پێش تۆوە ئەی محمدﷺ هەر پێغەمبەرێكمان ناردبێ، وەحیمان هەر بۆ ناردوە: كە جگە لە خۆم هیچ خوایەك نیە، كەوابوو: بمپەرستن. (شرح الطحاوية) ل٢١ ب١.

ئینجا لە دوای یەكخواناسین، بانگەوازیەكەیان بۆ لقەكانی ئاین بوو: وەكو نوێژو ڕۆژوو و حەرامو حەلاڵ...هتد ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: لَمَّا بَعَثَ النَّبِيُّﷺ مُعَاذاً إِلَى نَحْوِ أَهْلِ الْيَمَنِ، قَالَ لَهُ: إِنَّكَ تَقْدَمُ عَلَى قَوْمٍ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، فَلْيَكُنْ أَوَّلَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَى أَنْ يُوَحِّدُوااللهَ تَعَالَى، فَإِذَا عَرَفُوا ذَلِكَ، فَأَخْبِرْهُمْ: أَنَّ اللهَ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمِهِمْ وَلَيْلَتِهِمْ...﴾ الحديث رواه البخاري، لەو كاتەی پێغەمبەرﷺ (مُعاذ)ی ناردە لای (يَمَنْ) پێی فەرموو: تۆ ئەچیتە لای گەلێكی خاوەن (كتاب) واتە: جولەكە، ئەبی یەكەمجار بانگیان بكەی: تاكو خوای گەورە بە تاكو تەنیا بناسن، ئینجا كە باوەڕیان هات: خوا تاكو تەنیایە، پێیان بڵێ: خوای گەورە پێنج نوێژی لە سەر واجب كردون لە هەموو شەوو ڕۆژێكیاندا.

(ابن حجر العسقلاني) لە (السمعاني) ئەگێڕێتەوە: هەركەسێك وا تێبگا: كە بانگەوازی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام، تەنها بۆ ڕوونكردنەوەی لقەكانی ئاین بووە، ئەمە وا ئەگەیەنێ: كە تەنها عەقڵ بانگەوازی بۆ ناسینی خوا ئەكا، نەك پێغەمبەر، ئەمەش وای

لێدێ كه هەبوون و نەبوونی پێغەمبەرﷺ بۆ خواناسین یەكسان بێ، ئەم تێگەیشتنە هەڵەیەش بەسە بۆ گومرابوون، بەڵێ: عەقڵ ڕێنموونی ئەكا بۆ یەكخواناسین، بەڵام لەم كارەدا سەربەخۆ نیە. (فتح الباري) ل٤٣٧ ب١٣.

كەواتە: یەكەم بانگەوازی پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام بۆ (التوحید) یەكخواناسین بوو، ئینجا بۆ لقەكانی ئاین: وەكو چۆنیەتی خواپەرستی و حەرام و حەڵاڵ و...هتد، ئەم یەكخواناسینە و چۆنیەتی خواپەرستی و حەرام و حەڵاڵ گشتی لە ڕێگەی پێغەمبەرانەوە عليهم الصلاة والسلام زاندراوە، بە بەڵگەی ئەو ئایەت و حەدیسەی رابردووو و چەندانیتر.

## ﴿ جۆرەكانی یەكخوا ناسین=أنواعُ التَّوحِید ﴾

بزانە: (وَحْدانیَّـة) تاكوتەنیایی خوا، سێ جۆرە: ١- تاكوتەنیایی لە زات و سیفەتدا، ٢- لە پەروەردگاری(رُبُوبیَّة)دا، ٣- لە خوایەتی (أُلوهیَّة)دا.

١-(وَحْدانیَّة) تاكوتەنیایی: لە (ذات)و لە (صِفات)، واتە: خوای گەورە یەكە لە زاتی خۆیدا و بەش بەش نیە، لە سیفەتەكانیدا هاوێنەی نیە، (فتح الباري) ل٤٢٧ ب١٣.

كەوابوو: زاتی خوای گەورە لە پارچە و ئەندام پێك نەهاتوە و هاوێنەشی نیە، هەروەك ئەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ الشوری:١١، هیچ شتێك هاوێنەی خوا نیە، كەوابوو: خوای گەورە لاشە (جِسم) نیە، هەروەها تاكو تەنیایە لە (صِفات)ی زاتی خۆی و لە (صِفات)ی كردارەكانیدا، واتە: لە هیچ سیفەتێكدا هاوبەش و هاوێنەی نیە، هەروەك خۆی ئەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾ بڵێ: خوای گەورە یەكە لە زات و سیفەتدا، هاوبەشی نیە ﴿وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾ الإخلاص، خوای گەورە هاوێنە و هاوكاری نیە.

٢-(وَحْدانیَّة) تاكو تەنیایی لە پەروەردگاری (رُبُوبیَّة)دا، واتە: خوای گەورە بە تەنها ئەم بوونەوەرەی دروست كردوە و بە تەنها بەڕێوەی ئەباو بە تەنها ئەم خەڵكە ڕزق ئەداو ئەیژیێنی و ئەیمرێنی...هتد، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿قُلْ أَغَيْرَ اللهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ﴾ الأنعام:١٦٤، بڵێ: ئایا-جگە لە (الله)- پەروەردگارێكیترم بوێ؟ ئەو (الله)یە، پەروەردگاری هەموو شتێكە. كەوابوو: هەموو شتێك دروستكراوی خوایە، شتی دروستكراویش بۆ پەروەردگاری ناگونجێ و نابێتە هاوبەشی دروستكەری خۆی.

٣-(وَحْدانیَّـة) تاكو تەنیایی لە خوایەتی (أُلوهیَّـة)دا، واتە: تەنها خوای گەورە مافی پەرستن (عبادة)و دادڕەوایی (حاكمیَّة)ی هەیە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا إِلَهًا وَاحِدًا لاَإِلَهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ التوبة:٣١، فەرمانیان پێ نەكرابو تەنها ئەو فەرمانە نەبێ: یەك خوا بپەرستن، جگە لەو خوایە هیچ خوایەكیتر نیە،

پاكی بۆ خوا لەو هاوبەشییەی ئەوان ئەیكەن. هەروەها ئەفەرموێ: ﴿وَلاَ يُشْرِكُ فِي حُكْمِه أَحَدًا﴾ الكهف:٢٦، خوای گەورە هیچ كەسێك ناكاتە هاوبەش لە بڕیاری خۆیدا.
كەوابوو: جگە لە خوا هیچ پەرستراو (مَعْبُود)و هیچ دادوەر (حاكم)ێك نیە: كە مافی حەڕام كردنو حەڵاڵ كردنی هەبێ.

ئیمامی (النَّواوي) دەربارەی ووشەی (عِبادة) پەرستن، ئەفەرموێ: (عِبادة): گوێڕایەڵیو ملكەچییە، جا ئەگونجێ: مەبەست بە (عِبادة) لێرەدا ناسینی خواو دانهێنان بە تاكو تەنیاییخوا بێ... ئەشگونجێ: مەبەست هەر جۆرە گوێڕایەڵییەك بێ، ئەمەش گشت ئەركەكانی ئیسلام ئەگرێتەوە. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٢٠٩ ب١.

ئینجا بزانە: ئەم جۆرەی سێیەم زۆر گرنە، چونكە زۆر كەس لێرەدا گومڕا ئەبێو وا تێئەگا: -جگە لە خوا- كەسێكیتر مافی (حاكِمِيَّة) دادپەروایی هەیەو ئەتوانێ یاسای حەڕام كردنو حەڵاڵ كردن دابنێ، بێگومان ئەمەش گومڕابوونێكی ئاشكرایە، هەروەك لە باسی جۆرەكانی (كُفر)دا ڕوونی ئەكەینەوە، إنْ شاءَ اللهُ تَعالى.

(إبنُ أَبِي العِزّ) ئەفەرموێ: ئەو یەكخواناسینەی پێغەمبەران عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ والسَّلام، بانگەوازییان بۆ ئەكرد: تاكو تەنیایی خوا بوو لە (أُلوهِيَّة)دا، كە تاكو تەنیایی (رُبُوبِيَّة)ش ئەگرێتەوە، چونكە كافرەكان باوەڕیان بە تاكو تەنیایی (رُبُوبِيَّة) هەبوو، واتە: بە بەڵگەی ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللهُ﴾ لقمان:٢٥، ئەگەر لە كافرەكان بپرسی: كێ ئاسمانەكانو زەمینی دروست كردون؟ لە وەڵامدا دەڵێن: خوا دروستی كردون. بڕوانە (شرح الطحاوية) ل٢٩ ب١.

﴿ئاگاداری﴾: ئیمامی (النَّواوي) ئەفەرموێ: لە ڕاڕەوی كۆمەڵە گەورەكەی (سَلَفْ)و (خَلَفْ)دا: هەر كاتێك مرۆڤ باوەڕێكی پتەوی بێگومانی هەبوو بە ئایینی ئیسلام، ئەوە بەسەو ئەبێتە ئیماندارێكی یەكخوا ناس، پێویست ناكا بەڵگەی خوا ناسین فێر ببێ، بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٢٦٩ ب١.

(إبنُ حَجَرالعَسْقَلانِي) ئەفەرموێ: هەرچەند ئەم باوەڕەش بە هۆی شوێنكەوتنی كەسێكیتر بێ، بەو مەرجەی نەترازێ. (القُرْطُبِي) ئەفەرموێ: پێشەوایانی (فَتوا)و (سَلَفْ) لە سەر ئەم ڕایەنە، هەندێكیان بەڵگەیان بەوە هێناوەتەوە: كە پێغەمبەرﷺ (صَحابَة) بڕیاریان ئەدا بە ئیسلامیەتی دەشتاوییە بتپەرستەكان بە هۆی شادە هێنانو ملكەچی بۆ بڕیارەكانی ئیسلام بێئەوەی داوای فێربوونی بەڵگەیان لێ بكەن. بڕوانە (فتح الباري) ل٤٣٧ ب١٣.

(بیجُوری) ئەفەرموێ: بەو مەرجە باوەڕی شوێنكەوتە دروستە: كە ئەوەندە پتەو بێ، ئەگەر شوێنكەوتووی خۆی پەشیمان ببێتەوە، ئەو پەشیمان نەبێتەوە، بڕوانە (تحفةالمريد) ل٢٠.

## ﴿ باسی بێهاوونەیی خوای گەورە ﴾

ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(وَلاَ شَيْءَ مِثْلُهُ) هیچ شتێك هاووێنەی خوا نیە (إبنْ أبيالعزّ) ئەفەرموێ: (أهْل السُّنَّة) لە سەر ئەوە ڕێککەوتون: کە هیچ شتێك هاووێنەی خوا نیە: نە لە زاتو نە لە سیفاتو نە لە کردار. (شرح الطحاوية) ل٥٧ ب١. کەوابوو: خوای گەورە لاشەی نیەو ڕەنگی نیەو سنووری نیەو زانستی چۆنیەتی زاتی خوا لە توانای ئێمەدا نیە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِه شَيْءٌ﴾ الشورى:١١، هیچ شتێك هاووێنەی خوا نیە.

ئیمامی (النَّوَوي) لە قازی (عِياض) ئەگێڕێتەوەو ئەفەرموێ: ئەو جولەکەیە خوای نەناسیوە، کە وە شتێکی ئەچوێنێو باوەڕی وایە: خوا لاشەی هەیە، یان زانستی خوا تازەیە، یان منداڵی هەیە. ئەو دیانە خوای نەناسیوە، کە باوەڕی وایە: خوا ژنو منداڵی هەیەو ئەچێتە ناو شتێکو، تێکەڵی شت ئەبێو لە شوێنێك ئەڕواتە شوێنێکیتر، بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٢٥٥ ب١.

خوای گەورە (جِسْم) لاشە نیە، چونکە لاشە لە چەند شتێك پێك هاتووە، هەروەها خوای گەورە پاکە-لەو عەیبە- کە لە ناو شوێناندا نیشتەجێ ببێ. (فتح الباري) ل٤٢٧و٤٧٥ ب١٣.

(وَلاَ شَيْءَ يُعْجِزُهُ) هیچ شتێك خوا ماندوو ناکاتو لەبەر دەستی دەرباز نابێ، چونکە توانین (قُدْرَة)و زانستی (عِلم)ی تەواوەو ئەو کەسە ماندوو ئەکرێ: کە بێهێزو نەزانە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ اللّٰهُ لِيُعْجِزَهُ مِنْ شَيْءٍ فِي السَّمٰوَاتِ وَلاَ فِي الأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا﴾ فاطر:٤٤، خوای گەورە وەها نیە هیچ شتێك بێتوانای بکا: نە لە ئاسمانەکانو نە لە زەوی، خوا لە (أزَل)دا زاناو توانایە.

## ﴿ باسی (كَلِمةُالتَّوحِيد) ووشەی یەکخواناسینو (كَلِمةُالشَّهادَتَيْن) ووشەی شادەوئیمان ﴾

ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(وَلاَ إِلَهَ غَيْرُهُ) هیچ خودایەکی بە ڕاستی نیە، جگە لە خۆی. (إبْن أبيالعزّ) ئەفەرموێ: ئەم ووشەیە-لاَإِلَهَ إلاَّالله- ووشەی یەکخولناسینە، کە -یەکەم- بانگەوازی هەموو پێغەمبەران عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ بۆ ئەم ووشەیە بووە، هەروەك لە باسی (تاكو تەنیاییخوا) بە بەڵگەوە باسمان کرد، ئاشکراکردنی یەکخواناسین بەم ووشەیە، بە هۆی (نَفْي)نەبوونو (إثْبات) هەبوونە، کە (حَصْر) کورتکردنەوەی ئەگەیەنن (شرح الطحاوية) ل٧٢ ب١.

واتە: (لاَإِلَهَ) بەشی (نَفْي)نەبوونە، چونکە دان ئەنێ بە نەبوونی هیچ خوایەکی بە ڕاستیو، (إلاّ الله) بەشی (إثْبات)هەبوونە، چونکە دان ئەنێ بە هەبوونی خوایەکی بە

راستی، کە ناوی (الله)یە، ئینجا بە هۆی ئەم (نَفْی)و (إثْبات)ە واتەی (حَصْر) کورتکردنەوە ئەفامدرێتەوە، واتە: هیچ خوادیەکی پەروەردگارو پەرستراو و دادوەری بە راستی نیە جگە لە (الله)، کەواتە: بە هۆی ئەم (نَفْی)نەبوونە، دەرکەوت: کە ئەم خوایەی هەیە، هاوبەشی نیەو بە تەنهایە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لاَإِلَهَ إِلاَّ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ﴾ البقرة:١٦٣، خوای ئێوە یەك خوایە، هیچ خوایەکی بە راستی نیە، تەنها ئەو نەبێ، بەخشندەو میهرەبانە.

(إبن أبيالعزّ) ئەفەرموێ: یەکخوا ناسین یەکەم واجبە، کە پێی دێتە ناو ئیسلامو ئاخیر واجبە کە پێی لە دونیا دەرئەچێ، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ كانَ آخرُ كَلامــه لا إلَهَ إلاَّ اللهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ﴾ رواه أبوداود بسند حسن، هەرکەسێك دوایین گوتەی ووشەی (لاإِلَهَ إلاَّ الله) بێ، ئەچێتە بەهەشت. بڕوانە (شرح الطحاوية) ل٢٢ ب١.

ئیمامی(النَّواوي) ئەفەرموێ: بە تەنها گوتنی (لاَإِلَهَ إلاَّالله)، کە (مُحَمَّدٌ رَسُولُ الله)ی لەگەڵ نەبێ، لە ڕاڕەوی بڵاویووەوەی ئێمەو زانایاندا نابێتە موسوڵمان، وە لە فەرموودەی هەندێك لە زانایانیتردا: بە تەنها (لاَإِلَهَ إلاَّالله) ئەبێتە موسوڵمانو دواوی ووشەکەیتر (مُحَمَّدٌ رَسُولُ الله)ی لێئەکرێ، جا ئەگەر نەیگوت، بە کافربووەوە دائەندرێ. (شرح صحيح مسلم) ل١٩١ ب١.

بەڵام لە فەرموودەی (إبن حجرالهيتمي)دا، وا دەرئەکەوێ: کە تەنها وتنی (لاَإِلَهَ إلاَّالله) بۆ ئەو جۆرە کافرانە بەسە: کە هیچ ئایینێکیان نەپەرستبێ. بڕوانە (فتح المبين) ل٥٥.

کەوابوو: ڕای بەهێز ئەوەیە: بە تەنها گوتنی (كَلِمَةُ التَّوْحِيدْ) ووشەی یەکخواناسین–کە (لاَإِلَهَ إلاَّالله)یە– نابێتە موسوڵمان، بەڵکو واجبە (كَلِمَةُ الشَّهادَتَيْن): ووشەی شادەوئیمان بڵێ –کە (أَشْهَدُ أَنْ لاَإِلَهَ إلاَّ اللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله)یە– ئینجا ئەبێتە موسوڵمان.

(بیجوري) ئەفەرموێ: ئەمە دەربارەی کافری (أصْلي)بنەڕەتی بوو، کە بیەوێ ببێتە موسوڵمان، چونکە منداڵی موسوڵمانان بە ئیماندار دائەندرێنو بڕیارەکانی ئیسلامیان بە سەردا ئەسەپێندرێ لە دونیادا، هەرچەند ووشەی شادەو ئیمانیش نەڵێن بە درێژایی تەمەنیان. (تحفة المريد) ل٢٥، هەروەك لە باسی (إيمان)دا ڕوونی ئەکەینەوە.

کەوابوو: هەرکەسێك بە زوبان ووشەی شادەو ئیمان بڵێ، یان نەژادی بگاتە باوکێکیموسوڵمان، یان دایکێکیموسوڵمان، ئەوە لە دونیادا بە موسوڵمان دائەندرێو ڕەفتاری موسوڵمانانی لەگەڵ ئەکرێ، لێپێچانەوەی ناو دڵیشی لە دەست خوادایە لە ڕۆژی قیامەت، بڕوانە (تحفة المحتاج) ل٢٥٢–٢٥٥ ب٦.

﴿ئاگاداری﴾: ئیمامی (النّواوی) ئەفەرموێ: (أهل السّنّة) لە سەر ئەوە ڕێك كەوتون: كە هەركەسێك باوەڕێكی پتەوی بە ئایینی ئیسلام هەبێ، بەڵام بە زوبان ووشەی شادەو ئیمان نەڵێ‌و تواناشی هەبێ، ئەوە نابێتە هاوقیبلە، واتە: نابێتە موسوڵمان‌و بە یەكجاری لە دۆزەخدا ئەمێنێتەوە، (شرح صحیح مسلم) ل١٩١ ب١.

بەڵام (إبن حجر الهیتمي) ڕەخنەی لە فەرموودەی ئیمامی (النّواوی) گرتوە، (المدابغي)ش ناوبژی كردوەو ئەفەرموێ: ئەگونجێ مەبەستی (النّواوی) ئەو كەسە بێ: كە داوای شادەو ئیمانی لێبكرێ‌و تواناشی هەبێ، بەڵام بە ڕقەكاری نەیڵێ، بڕوانە (فتح المبین)و (حاشیة المدابغی) ل٥٩.

كەوابوو: هەركەسێك داوای گوتنی ووشەی شادەو ئیمانی لێبكرێ، ئەویش بە ڕقەكاری نەیڵێ، ئەوە كافرە لە دونیاو قیامەت. (تحفة المرید) ل٢٥.

ئینجا ئیمامی (النّواوی) ئەفەرموێ: فەرموودەی ڕاست ئەوەیە: گوتنی ووشەی شادەو ئیمان بە زمانەكانی‌تری جگە لە عەرەبیش دروستەو پێ ئەبێتە موسوڵمان (شرح صحیح مسلم) ل١٩٢ ب١.

## ﴿باسی ناو و سیفەتەكانی خوا ـ أسْماءُ وصفاتُ الله تَعالى﴾

بزانە: خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلِلّه الأسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا﴾ الأعراف:١٨٠، ناوە هەرە پیرۆزو جوانەكان بۆ خوایە، بەو ناوە پیرۆزانە ناوی خوا بێنن. پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إنَّ لِلّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ إسْماً مَنْ أحْصَاها دَخَلَ الْجَنَّةَ﴾ رواه البخاري ومسلم، خوای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەنە، هەركەسێك لەبەریان بكاو ڕەفتاریان پێ بكا ئەچێتە بەهەشت.

(إبن حجر العسقلاني) لە ئیمامی (النّواوی) ئەگێڕێتەوە: زانایان یەكدەنگن كە مەبەست ئەوە نیە: خوا تەنها ئەو نەوەدو نۆ ناوەی هەنە، بەڵكو زۆرتری هەنە، بە بەڵگەی ئەم حەدیسە كە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿أسْألُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ أوْ أنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ أوْ عَلَّمْتَهُ أحَدًا مِنْ خَلْقِكَ أوِ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِى عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ...﴾ رواه أحمد وابن حبان وصححه، واتە: خوایە لێت ئەپاڕێمەوە بە هەموو ناوە پیرۆزەكان كە ناوت پێ لە خۆ ناوە، یان لە قورئاندا ناردوتە خوارەوە، یان فێری كەسێكت كردونە، یان لە زانستی پەنهانی‌خۆتدانەو كەس نایانزانی. (فتح الباري) ل٢٦٣ ب١١..

ئینجا بزانە: ئیمامی (الترمذی)و ئیمامی (البیْهقی) ئەم نەوەدو نۆ ناوەیان ژماردون، جا ئیمامی (البیْهقی) ئەفەرموێ: ئەمە وا ناگەیەنێ: كە خوای گەورە ـ جگە لەم نەوەدو نۆیە ـ

ناوی‌تری نه‌بێ، به‌ڵكو مه‌به‌ست ئه‌وه‌یه: هه‌ركه‌سێك نه‌وه‌دو نۆ ناو له‌ ناوه‌ پیرۆزه‌كانی خوا سه‌ر ژمێر بكا ئه‌چێته‌ به‌هه‌شت، جا ئه‌و نه‌وه‌دو نۆیه‌ بن كه‌ ژماردنمان، یان ناوی‌تر بن: كه‌ له‌ قورئان، یان له‌ حه‌دیس، یان له‌ (إجماع) یه‌كده‌نگی زانایان به‌ڵگه‌یان له‌ سه‌ر بێ. دیسان ئه‌فه‌رموێ: خوای گه‌وره‌ ناوی هه‌نه‌و سیفه‌تی هه‌نه‌، ناوه‌كانی خۆی سیفه‌ته‌كانی خۆیه‌تی، سیفه‌ته‌كانی خۆی مه‌دح‌و باسی گه‌وره‌یی خۆیه‌تی، ئه‌م سیفه‌تانه‌ی خوا دوو به‌شن: ١- (صِفاتُ ذاتٍ)، ٢- (صِفاتُ فِعْلٍ). بڕوانه‌ (الإعْتِقادُ) ل٥٢و٥٣و٧٠.

(الألوسی) له‌ پێناسه‌ی ئه‌م دوو به‌شه‌دا ئه‌فه‌رموێ: (صِفاتُ الذَّات) ئه‌و جۆره‌ سیفه‌تانه‌ی زاتی خوایه‌: كه‌واته‌ی په‌یداكردنی شتێكی لێنه‌فامێته‌وه‌، وه‌كو: (الْحَیاة) زیندوویی، (العِلْم) زانین، (القُدْرَة) توانین، (الإرادَة) ویستن، (الكَلام) گفتوگۆ، (السَّمْع) بیستن، (البَصَر) بینین...هه‌روه‌ها ئه‌فه‌رموێ: (صِفاتُ الفِعْل) ئه‌و سیفه‌تانه‌ی ئاسه‌واری (قُدْرَة)و (إرادَة)ی خوای گه‌وره‌ن‌و واته‌ی په‌یداكردنی شتێكیان لێبفامێته‌وه‌: وه‌كو (التَّخْلیق) دروستكردن، (الإحْیاءُ) زیندووكردن، (الإماتَة) مراندن...هتد، (نَثْرُ الألی) ل٢٦و٢٨، هه‌م (الشرح المیَسَّر: للفِقْه الأكْبَر للإمام أبی‌حَنیفَة) ل٢٥.

(إبن أبی‌العِزّ) ئه‌فه‌رموێ: هه‌ر كاتێك بڵێی: (أعُوذُ بالله) خۆم ئه‌پارێزم به‌ خوای گه‌وره‌، ئه‌وه‌ به‌ زاتی پاكی خوا خۆت ئه‌پارێزی كه‌ به‌ سیفه‌ته‌ به‌رزه‌كان مه‌دحی ئه‌كرێ‌و لێی جیا نابنه‌وه‌، وه‌ ئه‌گه‌ر بڵێی: (أعُوذُ بِعِزَّةِ الله) خۆم ئه‌پارێزم به‌ گه‌وره‌یی خوای گه‌وره‌، ئه‌وه‌ به‌ سیفه‌تێكی خوا خۆت ئه‌پارێزی، واته‌: جگه‌ له‌ خوا خۆت به‌ كه‌سی‌تر نه‌پاراستوه‌. (شرح الطحاویة) ل٩٩ ب١.

ئینجا بزانه‌: له‌م فه‌رموودانه‌ بۆمان ده‌ركه‌وت: كه‌ سه‌رجه‌م ناو و سیفه‌ته‌كانی خوای گه‌وره‌ سێ به‌شن: **یه‌كه‌م:** (إسْمُ الذَّات) ناوی زاتی خوا، كه‌ (اللّٰه)یه‌. **دووه‌م:** (صِفاتُ الذَّات) سیفه‌ته‌كانی زاتی خوای گه‌وره‌، كه‌واته‌ی په‌یداكردنی شتێكیان لێنه‌فامێته‌وه‌. **سێیه‌م:** (صِفاتُ الفِعْل) سیفه‌ته‌كانی كرداری خوا، كه‌واته‌ی په‌یداكردنی شتێكیان لێبفامێته‌وه‌، كه‌وابو: گشت سیفه‌تێكی خوای گه‌وره‌ ناوه‌ پیرۆزێكی خوای گه‌وره‌، یان زیاتری لێوه‌رده‌گیرێ، جیاوازی (صِفاتُ الذَّات)و (صِفاتُ الفِعْل) نیه‌:

**بۆوێنه‌:** له‌ سیفه‌تی (الْحَیاة) ناوی (الحَیُّ) وه‌رده‌گیرێ، له‌ سیفه‌تی (العِلْم) ناوی (العالِمْ)و (العَلاّم)و (العَلیمْ) وه‌رده‌گیرێ، له‌ سیفه‌تی (القُدْرَة) ناوی (القادِر)و (القَدیر)و (المُقْتَدِر) وه‌رده‌گیرێ...هتد، هه‌روه‌ها له‌ سیفه‌تی (التَّخْلیق) ناوی (الخالِق)و (الخَلاّق) وه‌رده‌گیرێ، له‌ سیفه‌تی (الإحْیاء) ناوی (المُحْیی) وه‌رده‌گیرێ، له‌ سیفه‌تی (الإماتَة) ناوی (المُمیت) وه‌رده‌گیرێ...هتد.

ئینجا لێره بهولاوه باسی چهند سیفهتێکی خوای گهوره ئهکهین، ههروهك ئیمامی (الطحاوي) ئهفهرموێ: (قَدِيمٌ) خوای گهوره ههر ههبو (بِلاَ إِبْتِداءٍ) نهبوونی نهبوه (دائِمٌ) ههر ئهمێنێ (بِلاَ إِنْتِهاءٍ) كۆتایی نایێ، خوای گهوره ئهفهرموێ: ﴿هُوَ الأَوَّلُ وَالآخِرُ﴾ الحديد:٣، خوای گهوره ههر ههبوهو ههر ئهمێنێ. ههروهها كه پێغهمبهرﷺ دهچووه ناو مزگهوت ئهم دوعایهی دهكرد: ﴿أَعُوذُ بِاللهِ الْعَظِيمِ وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ رواه أبوداود بسند صالح.

(لاَ يَفْنَى) خوای گهوره نابڕێتو (وَلاَ يَبِيدُ) لهناو ناچێ، خوای گهوره ئهفهرموێ: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُوالْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ﴾ الرحمن: ٢٦و٢٧، ههركهسێكی لهسهر زهویيه لهناو ئهچێ، زاتی خوایتۆ ئهمێنێ كه خاوهن گهورهیيو رێزه.

## ﴿ باسی ویستنو حهزكردنی خوا ـ الإرادَةُ وَالْمَشِيئَةُ ﴾

دهربارهی ئهم دوو سیفهته، ئیمامی (الطحاوي) ئهفهرموێ:

(وَلاَ يَكُونُ) هیچ شتێك نابێ (إِلاَّ ما يُرِيدُ) تهنها ئهو شته نهبێ: كه خوا بیهوێ ببێ، جا ئهو شته: چاكه بێ، یان خراپه، واته: چاكهو خراپه ههردووكی به ویستی خوایه، (إبنْ أبيالعزّ) ئهفهرموێ: (أهل السُّنَّة) ئهفهرموون: ههرچهند خوای گهوره —له رووی قهدهرهوه— ئهیهوێ: گوناه بكرێن، بهلام پێی خۆش نیهو پێ رازی نیه، فهرمانیش به گوناههكان ناكا، بهڵكو رێی له گوناه ئهبێتهوهو به ناپهسهندی دائهنێو قهدهغهی ئهكا. ئهمه فهرموودهی تێكڕای (سَلَفَ)ه كه ئهڵێن: (مَا شَاءَ اللهُ كانَ وَما لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ) ورواه أبوداود وابن السُنِّي مَرفوعاً، ههرچی خوا حهز بكا: ئهبێو ههرچی حهز نهكا: نابێ. (شرح الطحاوية) ل٧٩ ب١.

كهواته: (إرادَة) ویستنی خوای گهوره، جیایه لهگهڵ (مَحَبَّة)خۆشویستنو (رضَى) رازیبوونی خوا، ههروهك خوای گهوره ئهفهرموێ: ﴿وَلاَ يَرْضَى لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ﴾ الزمر:٧١، خوا رازی نابێ به كافربوونی بهندهكانی خۆی. ئینجا بزانه: (إرادَة) ویستنی خوا، (مَشِيئَة) حهزكردنی خوا، ههردووكیان یهكسانن، كهواته: به بێ ویستنو حهزكردنی خوا هیچ شتێك نابێ، خوای گهوره ئهفهرموێ: ﴿وَمَا تَشَاءُونَ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللهُ﴾ الإنسان:٣٠، ئێوه حهز ناكهن: شتێك ببێ، یان نهبێ، مهگهر خوای گهوره حهز بكا.

ههروهها بزانه: (إرادَة) ویستن، سیفهتێكی زاتی خوای گهورهیهو، دوو بهشه:

**یهكهم:** (إرادَةُ أمْرٍ وَتَشْرِيعٍ) واته: ویستنی فهرمانه شهرعیيهكان، كه پهیوهندی به

چاكەو خراپەوە هەیە، جا ڕوو بدا، یان نا–(واتە: مەبەست بە (إرادة)ی شەرعی ئەوەیە: خوا فەرمان بە چاكە ئەكاو پێی خۆشەو پێی ڕازییە، جا ئەو چاكەیە بكرێ، یان نەكرێ، هەروەها خوا فەرمان بە خراپە ناكاو پێی خۆش نیەو پێی ڕازی نیە، جا خراپەكە بكرێ یان نەكرێ)– دەربارەی ئەم بەشەی یەكەم، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ اللهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾ البقرة:١٨٥، خوای گەورە ئاسانی بۆ ئێوە ئەوێ‌و زەحمەتی بۆ ئێوە ناوێ.

**دووەم:** (إرادةُ قضاءٍ وتَقْدير) واتە: ویستن‌و بریاری (أزلی) كە پەیوەندی بە گشت بوونەوەرو گشت ڕووداوێكەوە هەیە، جا چاكە بێ، یان خراپە–(واتە: هەر شتێك خوا لە (أزل)دا ویستبێتی‌و بریاری دابێ: كە ببێ، ئەوە هەر ئەبێ‌و ناگونجێ نەبێ، هەروەها: هەر شتێكیش خوا لە (أزل)دا ویستبێتی‌و بریاری دابێ: كە نەبێ، ئەوە بە هیچ جۆرێك نابێ، جا ئێمە حەز بكەین: كە ببێ، یان نەبێ، یان حەز نەكەین، چاك بێ، یان خراپ بێ)– دەربارەی ئەم بەشەی دووەم خوا ئەفەرموێ: ﴿فَمَنْ يُرِدِ اللهُ أَنْ يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسْلاَمِ وَمَنْ يُرِدْ أَنْ يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا﴾ الأنعام:١٢٥، هەركەسێك خوای گەورە بیەوێ بیباتە سەر ڕێگەی ڕاست، سینەی فراوان ئەكا بۆ ئیسلامبوون، هەركەسێكیش خوای گەورە بیەوێ: گومڕای بكا، سینەی تەنگو قەبز ئەكا. بۆ ئەم ڕوونكردنەوەیە بڕوانە (فتح الباري) ل٥٥١ ب١٣.

ئینجا بزانە: لەم دوو بەشەدا بۆمان دەركەوت: كە (إرادة) ویستنی خوا، جیاوازە لەگەڵ (أمر) فەرمانی خوای گەورە، چونكە (إرادة)ی قەزاو قەدەری(أزلی)خوا، لەگەڵ (أمر) فەرمانی شەرعی خوادا، چوار بەشە:

١–(إرادة) ئەكاو (أمر)یش ئەكا: وەكو ئیمانهێنانی ئەو كەسانەی خوا لە (أزل)دا ئەیزانی ئیمان دێنن، واتە: خوا ئەیەوێ ئیمان بێنن، فەرمانیش بە ئیمانهێنانیان ئەكا.

٢–(إرادة) ناكاو (أمر)یش ناكا: وەكو كافربوونی ئەم ئیماندارانەی بەشی یەكەم، واتە: خوا نایەوێ كافر بېن، فەرمانیش بە كافربوونیان ناكا.

٣–(إرادة) ئەكا، بەڵام (أمر) ناكا: وەكو كافربوونی ئەو كەسانەی خوا لە (أزل)دا ئەیزانی ئیمان ناهێنن، واتە: خوا ئەیەوێ كافر بېن، بەڵام فەرمان بە كافربوونیان ناكا، گوناهەكانی‌تریش هەر بەم شێوەیە: (إرادة) ئەكا، بەڵام (أمر) ناكا.

٤–(إرادة) ناكا، بەڵام (أمر) ئەكا: وەكو ئیمانهێنانی ئەم جۆرە كافرانەی بەشی‌سێیەم، واتە: خوا نایەوێ ئیمان بێنن، بەڵام فەرمانیشیان پێ ئەكا ئیمان بێنن، بڕوانە (تحفةالمريد) ل٣٦.

لاَ تَبْلُغُهُ الأَوْهامُ، وَلاَ تُدْرِكُهُ الأَفْهامُ، وَلاَ يُشْبِهُ الأَنامَ، حَيٌّ لاَ يَمُوتُ، قَيُّومٌ لاَ يَنامُ، خالِقٌ بِلا حاجَةٍ، رازِقٌ بِلاَ مَؤُنَةٍ، مُميتٌ بِلاَ مَخافَةٍ، بَاعِثٌ بِلاَ مَشَقَّةٍ،

## ﴿ باسى چەند سيفەتيكى خوا ﴾

ئيمامى (الطحاوي) ئەفەرمويّ:

(لاَ تَبْلُغُهُ الأَوْهامُ) خەيالّ ناگاتە ناسينى زاتى خوا (وَلاَ تُدْرِكُهُ الأَفْهامُ) زانست بە تەواوى خواى پيّناناسريّ، خواى گەورە ئەفەرمويّ: ﴿وَلاَ يُحِيطُونَ بِهِ عِلْمًا﴾ طه:١١٠، زانستى تەواويان نيە: دەربارەى زاتى خوا. واتە: هەر خوا بە خۆى ئەزانيّ زاتى خۆى چۆنەو كەسىتر نازانيّ (وَلاَ يُشْبِهُ الأَنامَ) خواى گەورە، وەهيچ شتيّك ناچيّ: نە لە زات، نە لە سيفەت، نە لە كردار، خواى گەورە ئەفەرمويّ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ الشورى:١١، هيچ شتيّك هاوويّنەى خواى گەورە نيە. كەواتە: زانستى خوا جياوازە لەگەلّ زانستى ئيّمە، بيتن‌و بيستن‌و گشت سيفەتەكانى‌ترى خوا جياوازە، لەگەلّ بيتن‌و بيستن‌و سيفەتەكانى‌ترى ئيّمە، چونكە گشت سيفەتەكانى خوا (أزَلِي)ن، سيفەتەكانى ئيّمەش خوا دروستى كردون، هەروەها: كردارەكانى خوا: وەكو رِزقدان‌و مراندن‌و...هتد، جياوازە لەگەلّ هەمان كردارى ئيّمە، چونكە كردارەكانى خوا سيفەتى خۆيەتى، كردارى ئيّمەش دروستكراوى خوايە، هەر بە هيّزيّكى دروستكراويش ئيّمە وەدەستى ديّنين، هەروەك لە باسى (سەرپشكى بەندە)دا روونى ئەكەينەوەو، هەروەها بروانە (شرح الطحاوية) ل٨٥ ب١.

(حَيٌّ لاَ يَمُوتُ) خوا بەردەوام زيندووەو نامريّ (قَيُّومٌ) بەرِيّوەبەرى بوونەوەرە (لاَ يَنامُ) هەرگيز ناخەويّ، خواى گەورە ئەفەرمويّ: ﴿اللهُ لاَإِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ﴾ البقرة:٢٥٥، خوا ئەو خوايەيە: كە جگە لەوى هيچ خوايەك نيە، هەردەم زيندووەو بەرِيّوەبەرى بوونەوەرە، بۆرژان‌و خەو نايگريّ. (خالِقٌ) دروستكەرى هەموو شتيّكە لە نەبوونەوە (بِلاَحاجَةٍ) بە بيّ پيّويستى. واتە: پيّويستى بەو شتە دروستكراوانە نيە، خواى گەورە ئەفەرمويّ: ﴿وَاللهُ الْغَنِيُّ وَأَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ﴾ محمد:٣٨، خوا دەولّەمەندە پيّويستى نيە، ئيّوە پيّويستيتان بە خوا هەيە. (رازِقٌ) خوا رِزقدەرە (بِلاَ مَؤُنَةٍ) بە بيّ‌هەولّدان‌و بارگرانايى، خواى گەورە ئەفەرمويّ: ﴿إِنَّ اللهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾ الذاريات:٥٨، بەراستى هەر خوا رِزق دەرى راستەقينەيەو خاوەن هيّزەو زۆر توانايە. (مُميتٌ) خوا خەلّك ئەمريّنيّ (بِلاَ مَخافَةٍ) بە بيّ‌ترس: نە لە هەبوونيان ئەترسيّ، نە لە تۆلّە سەندنەوەش ئەترسيّ (بَاعِثٌ) لە رِۆژى قيامەت خەلّك زيندوو ئەكاتەوە (بِلاَ مَشَقَّةٍ) بە بيّ ئازارو ماندووبوون، خواى گەورە ئەفەرمويّ: ﴿اللهُ الَّذِى خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ الروم:٤٠. واتە: (الله) ئەو خوايەيە: كە ئيّوەى دروست كردوە، ئينجا رِزقى داونيّ، ئينجا ئەتانمريّنيّ، ئينجا زيندووتان ئەكاتەوە.

مَا زَالَ بِصِفَاتِهِ قَدِيماً قَبْلَ خَلْقِهِ، لَمْ يَزْدَدْ بِكَوْنِهِمْ شَيْئاً لَمْ يَكُنْ قَبْلَهُمْ مِنْ صِفَتِهِ. وَكَمَا كَانَ بِصِفَاتِهِ أَزَلِيّاً كَذَلِكَ لا يَزَالُ عَلَيْهَا أَبَدِيّاً، لَيْسَ بَعْدَ خَلْقِ الْخَلْقِ اسْتَفَادَ اسْمَ (الْخَالِقِ) وَلا بِإِحْدَاثِ الْبَرِيَّةِ اسْتَفَادَ اسْمَ (الْبَارِي)، لَهُ مَعْنَى الرُّبُوبِيَّةِ وَلا مَرْبُوب، وَمَعْنَى الْخَالِقِ وَلا مَخْلُوق،

---

## ﴿خوای گەورە بە سیفەتەكانیەوە (أزلی وأبدی)یە﴾

**پێناسـە**: (أزل) بـەردەوامیی هەبوونێكـە لـە ڕابـردووەوە كـە نـەبوونی نـەبێ. (أبـد) بەردەوامیی هەبوونێكە لە داهاتوودا كە نەمانی نەبێ.

ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(مَا زَالَ بِصِفَاتِهِ قَدِيماً) خوای گەورە بە هەموو سیفەتەكانیەوە-(صِفاتُ الذَّات)و (صِفاتُ الأفعال)- لە (أزل)دا هەر هەبوو (قَبْلَ خَلْقِهِ) پێش دروستكردنی بوونەوەر، پێغەمبەرﷺ ئەفـەرموێ: ﴿كَانَ اللهُ وَلَمْ يَكُنْ شَيْءٌ غَيْرُهُ، وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ، وَكَتَبَ فِي الذِّكْرِ كُلَّ شَيْءٍ، وَخَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ رواه البخاري، خوای گـەورە لـە (أزَل)دا هـەبوو. جگە لە خۆی هیچ شتێكیتر نەبوو، (عَرْش)ی خـۆی لـە سـەر ئـاو دروسـت كـردو هـەموو شتێكی لە (اللَّوحُ المَحْفُوظ)دا نووسیو ئاسمانەكانو زەمینی دروست كردن.

كەواتە: خوای گەورە بە زاتو سیفەتەوە (أزَلی)یەو (لَمْ يَزْدَدْ بِكَوْنِهِمْ شَيْئاً) خـوای گـەورە بە بوونیبوونەوەر شتێكی زیاد نەكردوە (لَمْ يَكُنْ قَبْلَهُمْ مِنْ صِفَتِهِ) كە ئـەو سـیفەتەی نەبوبێ پێش دروست كردنیان، واتە: ئـەو سـیفەتانەی پـێش دروسـتكردنی بوونـەوەر لـە (أزَل)دا هەیبوون، پاش دروستكردنی بوونەوەریش هەر هەمان سیفەتی هەنـەو بـە هـۆی دروستكردنی بوونەوەر سیفەتێكی نوێی بۆ زیاد نەكراوە.

(وَكَمَا كَانَ بِصِفَاتِهِ أَزَلِيّاً) ئینجا هـەروەكو خـوای گـەورە بـە زاتـو سـیفەتەوە (أزَلـی)یـە (كَذَلِكَ لا يَزَالُ عَلَيْهَا أَبَدِيّاً) هەر ئـەوهاش خـوا بـە زاتـو سـیفەتەوە (أبَـدی)یـە، بـەردەوام ئەمێنیو كۆتایی نایێ (لَيْسَ) وا نیە (بَعْدَ خَلْقِ الْخَلْقِ) لـەو كاتـەوە: كـە بوونـەوەری لـە نەبوونەوە دروست كردوە (اسْتَفَادَ اسْمَ الْخَالِقِ) نـاوی (الْخَـالِق) دروسـتكەری وەدەسـت كەوتبێ (وَلا بِإِحْدَاثِ الْبَرِيَّةِ) وا نیە: كە بە هۆی پەیداكردنی خـەڵك (اسْتَفَادَ اسْمَ الْبَـارِي) ناوی (الْبارِیء)ی وەدەست كـەوتبێ، بـەڵكو لـە (أزَل)دا ئـەم دوو ناوەشـی هـەر هـەبون، خوای گەورە ئەفـەرموێ: ﴿هُوَ اللهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ﴾ الحشر:٢٤، خـوا ئـەو خوایەیـە: كـە دروستكەری بوونەوەرە لە نەبوونەوە، پەیداكەری خەڵك لە شێوەیەك بـۆ شـێوەیەكیتر. بڕوانە (الشرح الميَسَّر: للفقه الأكْبَر للإمام أبيحَنيفَة) ل٢٥.

(لَهُ مَعْنَى الرُّبُوبِيَّةِ) خوای گەورە سیفەتی (رُبُوبِيَّة)پەروەردگاریەتی هەبو (وَلا مَرْبُوب) هیچ پەروەردەكراوێك نەبو (وَمَعْنَى الْخَالِقِ) خوای گەورە سیفەتی (الخالق) دروسـتكەری هـەبو (وَلا مَخْلُوق) هیچ دروستكراوێك نەبو.

وَكَما أَنَّهُ مُحْيِي الْمَوْتَى بَعْدَ ما أَحْيا، إِسْتَحَقَّ هٰذَا الإِسْمَ قَبْلَ إِحْيائِهِمْ، كَذٰلِكَ إِسْتَحَقَّ إِسْمَ الْخالِقِ قَبْلَ إِنْشائِهِمْ، ذٰلِكَ بِأَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، وَكُلُّ شَيْءٍ إِلَيْهِ فَقِيرٌ، وَكُلُّ أَمْرٍ عَلَيْهِ يَسِيرٌ، لا يَحْتاجُ إِلَى شَيْءٍ

---

(وكَما إِنَّهُ مُحْيِي المَوْتَى) هەروەکو خوا ناوی زیندووکەرەوەی مردووانە (بَعْدَ ما أَحْيا) پاش ئەوەی کە زیندوویان ئەکاتەوە (إِسْتَحَقَّ هَذَا الإِسْمَ قَبْلَ إِحْيائِهِمْ) ئەو ناوەی (المُحْيِي) زیندووکەرەوەی هەر هەبوو پێش زیندووکردنەوەیان (كَذٰلِكَ) هەروەها (إِسْتَحَقَّ إِسْمَ الخالِقِ) ناوی (الخالِق) دروستکەری هەر هەبو (قَبْلَ إِنْشائِهِمْ) پێش دروستکردنیان لە نەبوونەوە.

(ذٰلِكَ) هەبوونی سیفەتەکانی خوا لە (أزَل)دا، پێش دروستکردنی بوونەوەر لە نەبوونەوە (بِأَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) لەبەر ئەوەیە: خوا توانای لە سەر کردنی هەموو کارێك هەیە، هەروەك خۆی ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ البقرة:٢٠، خوا توانای لە سەر هەموو شتێك هەیە (وَكُلُّ شَيْءٍ إِلَيْهِ فَقِيرٌ) هەموو شتێك پێویستی بە خوای گەورە هەیە، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ أَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللهِ﴾ فاطر:١٥، ئەی خەڵکینە ئێوە پێویستیتان بە خوا هەیە (وَكُلُّ أَمْرٍ عَلَيْهِ يَسِيرٌ) هەموو کارێك لە لای خوا ئاسانە (لاَ يَحْتاجُ إِلَى شَيْءٍ) خوای گەورە پێویستی بە هیچ شتێك نیە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا كَيْفَ يُبْدِئُ اللهُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ إِنَّ ذٰلِكَ عَلَى اللهِ يَسِيرٌ﴾ العنكبوت:١٩، ئایا نەیانبینی چۆن خوای گەورە ئەم بوونەوەرەی لە نەبوونەوە دروست کردوە، ئینجا ئەیگەڕێنێتەوە بۆ نەبوون؟ ئەمە کارێکی زۆر ئاسانە لە لای خوا.

## ﴿رای (أهل البدعة) دەربارەی سیفەتەکانی خوا﴾

بزانە: لەم باسەی ڕابردوودا بۆمان دەرکەوت کە (وُجُودُ الله) هەبوونی خوا –بە زاتو سیفەتەوە– سیفەتێکی (أزَلی)و (أبَدی)یە، واتە: لە (أزَل)دا تەنها هەر خوا هەبو، نەبوونی نەبوەو جگە لەوی شتێکیتر نەبو، هەروەها: بە (أبَدی) بەردەوام هەر ئەمێنیو کۆتایی نایەو سیفەتەکانیشی هەر هەبوەو هەر ئەمێنن.

ئینجا بزانە: دەربارەی ئەم سیفەتەی (وُجُودُ الله) هەبوونی خوا، موسوڵمانان هیچ کێشەیان نیە، واتە: گشتیان دان بە هەبوونی خوادا ئەهێنن، بەڵام لە سیفەتەکانیتردا کێشەیان هەیەو بوونەتە سێ بەشی سەرەکی:

**یەکەم:** (المُعَطِّلَة) لەکارخەرەکان، کە دان ناهێنن: بە هەبوونی سیفەتەکانی خوا، ئەم بەشە لە دوو کۆمەڵی (أهل البِدْعَة) پێك هاتووە: کە (جَهْمِيَّة)و (مُعْتَزِلَة)نە(*) بروانە (فتح الباری) ل٤٢٧و٤٣٠ ب١٣.

**دووەم:** (المُشَبِّهَة) وێچوێنەرەکان، کە کۆمەڵێکیتری (أهل البِدْعَة)ن، دان ئەهێنن: بە هەبوونی سیفەتەکانی خوا، بەڵام خوای گەورە وەشتێکیتر ئەچوێننو سیفەتەکانیشی

وەسیفەتەکانی خەڵك ئەچوێنن. بڕوانە (شرح الطحاوية) ل٨٤و٨٥ ب١. ئینجا برانە هەندێ کەس (مُشَبِّهَة) بە (مُجَسِّمَة)ش ناو ئەبا[٦].

**سێیەم:** (أَهْلُ السُّنَّة والجَماعَة) دان ئەهێنن بە هەبوونی گشت سیفەتەکانی خوا، وە هیچ شتێکیشی ناچوێنن، واتە: وەکو (مُعَطِّلَة) نالێن: خوا سیفەتی نیە، وەکو (مُشَبِّهَة)ش نالێن: خوا وە شتێکیتر ئەچێ، بەڵکو ئەڵێن: خوا سیفەتی هەنەو بە زاتو سیفەتەوە (أزلی)یە، وەکو هیچ شتێك نیە، بە بەڵگەی ئەم ئایەتە کە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ هیچ شتێك هاوێنەی خوا نیە ﴿وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ الشورى:١١، خوای گەورە بیسەرەو بینەرە.

کەوایە: ئەم ئایەتە گوتەی (مُشَبِّهَة) پوچەڵ ئەکاتەوە، چونکە خوا ئەفەرموێ: خوا هاوێنەی نیە، کەوابوو: وەهیچ شتێکیش ناچێ، هەروەها گوتەی (مُعَطِّلَة)ش پوچەڵ ئەکاتەوە، چونکە خوا سیفەتی بۆ خۆی داناوە، کەوابوو: خوا سیفەتی هەیەو ئەبیسێو ئەبینێ، بەڵام نەك وەك زانینو توانناو بیستنو دیتنی ئێمە. بڕوانە (شرح الطحاوية) ل١١٨ ب١.

## ﴿خوا ئەندازەو ماوەی بوونەوەری داناوە﴾

ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(خَلَقَ الْخَلْقَ) خوای گەورە بوونەوەری لە نەبوونەوە دروست کردوە (بعلْمه) کە دروستی کرد ئەیزانی: لەم بوونەوەرەدا چی ڕوو ئەدا، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿أَلاَ يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ الملك:١٤، ئایا خوا نازانێ چی دروست کردوە؟ بەڵێ ئەزانێ،

[٥] (**الجهمية**) چینێکن لە (أَهْلُ البِدْعَة والضَّلالَة) سەر بە (جهْم بن صفْوان)ن کە پیاوێکی گومڕاو ئاژاوەچی بوو، لە ساڵی (١٢٨)ی کۆچی کوژرا، ئەم چینە گومڕابووە، ئەڵێن: خوا هیچ سیفەتێکی نیە، چۆن دروستە ناوێك بۆ خوا بگوترێ کە ئەم ناوە بۆ کەسێکیتریش بگوترێ؟ قورئان فەرموودەی خوا نیە، خوا شت نیە...هتد.

(**المعتزلة**) چینێکن لە (أَهْلُ البِدْعَة والضَّلالَة)، یەکەم کەس، کە ئەم چینەی پێك هێنا (واصل بن عطاءْ) بوو، کە لە قوتابخانەی ئیمام (الحسَن البصْري) جیا بوەوەو لە قوژبنێکی مزگەوت دەرسی بە قوتابیەکانی خۆی ئەگوت، لە ساڵی (١٣١)ی کۆچی مرد، ئەم چینە گومڕابووە، وەکو (جهْمیَّة)کان ئەڵێن: خوا سیفەتی نیە، هەروەها ئەڵێن: گوناهباری گەورە، نە کافرەو نە موسوڵمانە، قورئان (أزلی) نیەو دروستکراوە..هتد.

[٦] (**المشبهة**) چینێکن لە (أَهْلُ البِدْعَة والضَّلالَة) خوای گەورە وەشتێکی تر ئەچوێننو ئەڵێن: خوا لاشەی هەیەو لە سەر وێنەی ئادەمیزادە، دەستو قاچو گوێو سەری هەیە، خوا دائەبەزێو سەر ئەکەوێو، لە سەر (عَرْش) دانیشتوە..هتد: ئەم چینە بە (مُجَسِّمَة)ش ناو ئەبرێن.

(**المجسمة**) چینێکن لە (أَهْلُ البِدْعَة والضَّلالَة) ئەڵێن: خوا لاشەی هەیەو لە سەر (عَرْش) جێگیرە، دەستو قاچو چاوی هەیە...هتد. لەم عەقیدەیەدا (مُجَسِّمَة)و (مُشَبِّهَة) هاوبیرن، بەڵام لەوەدا جیاوازن: (مُجَسِّمَة) خوای گەورە وە شتێکیتر ناچوێننو دەڵێن: خوا دەستو قاچو گوێو چاوێکی وەهای هەیە لەخۆی دەوەشێتەوە. ئینجا بزانە: عەقیدەی (مُشَبِّهَة)و (مُجَسِّمَة) لە جوولەکان وەرگیراوە، هەروەك لە باسی (مُجَسِّمَة ومُشَبِّهَة)دا ڕوونی ئەکەینەوە، إنْ شاءَ اللهُ تعالى.

وَقَدَّرَ لَهُمْ أَقْداراً، وَضَرَبَ لَهُمْ آجالاً، وَلَمْ يَخْفَ عَلَيْهِ شَيْءٌ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَهُمْ، وعَلِمَ ما هُــمْ عَامِلُونَ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَهُمْ،

---

ئەو خوایە وردبینو خەبەردارە. (وَقَدَّرَ لَهُمْ أَقْدارا) بۆ ئەم خەڵکە خوا ئەندازەی داناون، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَــدَّرَهُ تَقْــدِيرًا﴾الفرقان:٢، خوا هەموو شتێکی دروست کردوەو، ئامادەی کردوە بە ئامادەکردنێکی دیارکراو. پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿كَتَبَ اللّٰهُ مَقَادِيرَ الْخَلائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفِ سَــــنَةٍ﴾ رواه مسلم، خوای گەورە ئەندازەی هەموو دروستکراوێکی نووسی پێش دروستکردنی ئاسمانەکانو زەمین بە پەنجا هەزار ساڵ.

## ﴿کوژراو بە (أجل)ی خۆی ئەمرێ﴾

(وَضَرَبَ لَهُمْ آجالاً) خوای گەورە دیاری کردوە (أجَل)، واتە: ئەندازەی مانەوەی ئەم خەڵکە لە ژیاندا، نە چرکەیەك دوا ئەکەوێ، نە چرکەیەك پێش ئەکەوێ، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ فَلاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ﴾ یونس:٤٩، هەر کاتێ (أجَل) واتە: کاتی مردنیان هات: نە دەمێك دوا ئەکەونو نە پێش ئەکەون. کەوابوو: گیانلەبەری کوژراو بە (أجَل)ی خۆی ئەمرێ، واتە: خوا ئەیزانیو دیاری کردبوو: ئەمە بە هۆی نەخۆشی ئەمرێ، ئەمەشیان بە هۆی کوشتن ئەمرێ، ئەمەشیان بە هۆی ڕووخان، ئەمەش بە هۆی سووتان، ئەمەشیان بە هۆی خنکان لە ئاودا ئەمرێ–جگە لەم هۆیانەش– خوای گەورە مردنو ژینی داناوەو هۆیەکانی مردنو ژینیشی داناوە، واتە: هەر ئەبێ لە کاتی دیارکراودا بمرێ، جا بە هەر هۆیەك بێ، ئینجا بزانە: مرۆڤکوژ لە بەر ئەوە تۆڵەی لە سەرەو تاوانبارە: چونکە کارێکی قەدەغەکراوی کردوە. بڕوانە (شرح الطحاوية) ل١٢٧و ١٢٨ ب١.

ئینجا بزانە: لە چەند حەدیسێکی (صَحیح)دا پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: سەردانو چاکە لەگەڵ خزمان تەمەن درێژ ئەکا. جا بۆ ئەوەی ئەم حەدیسانە دژایەتی لەگەڵ ئایەتی ڕابردوودا نەکەن، زانایان چەند واتەیەکیان لە حەدیسەکان داوەتەوە، فەرموودەی ڕاست لەو فەرموودانە، مەبەست ئەوەیە: خوای گەورە پیتو بەرەکەت ئەخاتە تەمەنی مرۆڤو ڕێگەی بۆ ئاسان ئەکا: تاکو زۆر خواپەرستی بکاو کاتەکانی بە فیڕۆ نەداو کردەوەی بەسوود بکا بۆ قیامەت، بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٤٥٠ ب٩و (السراج المنير) ل٣٨٥ ب٢.

## ﴿ گشت هەبوونێك بە بڕیارو حەزکردنی خوایە ﴾

ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(وَلَمْ يَخْفَ عَلَيْهِ شَيْءٌ) خوای گەورە هیچ شتێکی لە لا پەنهان نەبو (قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَهُمْ) پێش ئەوەی بەندەکانی دروست بکا (وَعَلِمَ ما هُمْ عامِلُونَ) خوای گەورە ئەیزانی بەندەکان چی ئەکەن (قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَهُمْ) پێش ئەوەی دروستیان بکا، خوای گەورە ئەفەرموێ:

وَأَمَرَهُمْ بِطاعَتِه، وَنَهاهُمْ عَنْ مَعْصِيَتِه، وَكُلُّ شَيْءٍ يَجْرِي بِتَقْدِيرِهِ وَمَشِيئَتِه، وَمَشِيئَتُهُ تَنْفُذُ، لا مَشِيئَةَ لِلْعِبادِ إلاَّ ما شاءَ لَهُمْ، فَما شاءَ لَهُمْ كانَ وَما لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ

---

﴿رَبَّنَا إِنَّكَ تَعْلَمُ ما نُخْفِي وَمَا نُعْلِنُ وما يَخْفَى عَلَى اللهِ مِنْ شَيْءٍ فِي الأَرْضِ وَلا فِي السَّمَاءِ﴾ إبراهيم:٣٨، خوايە تۆ ئەزانی ئەوەی ئەیشارینەوەو ئەوەی ئاشکرای ئەکەین، هیچ شتێك لە خوا پەنهان نابێ، نە لە زەمینو نە لە ئاسمان.

(وَأَمَرَهُمْ بِطاعَتِه) خوا فەرمانی بە بەندەکانی خۆی کردوە: تا گوێڕایەڵی بن (وَنَهاهُمْ عَنْ مَعْصِيَتِه) قەدەغەی کردون: لە تاوانکردن، هەروەك ئەفەرموێ: ﴿وَما خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنْسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾الذاريات:٥٦، من جنۆکەو ئادەمیزادم بۆ هیچ دروست نەکردون، تەنها بۆ ئەوە نەبێ: کە بمپەرستن.

(وَكُلُّ شَيْءٍ يَجْرِي) هەموو شتێك کە ئەبێ (بِتَقْدِيرِه) بە بڕیاری خوایە (وَمَشِيئَتِه) بە حەزکردنی خوایە (وَمَشِيئَتُهُ) حەزکردنی خوا (تَنْفُذُ) جێبەجێ ئەبێ (لاَ مَشِيئَةَ لِلْعِبادِ) بەندەکان هیچ دەسەڵاتی حەزکردنیان نیە (إِلاَّ ما شاءَ لَهُمْ) تەنها ئەو حەزکردنە نەبێ: کە خوا حەز بکا بۆیان ببێ (فَما شاءَ لَهُمْ كانَ) هەر شتێك خوا حەز بکا بۆیان ببێ، ئەبێ (وَما لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ) هەر شتێك خوا حەز نەکا ببێ، نابێ. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تَشَاءُونَ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللهُ إِنَّ اللهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾الدهر:٣٠، ئێوە حەز ناکەن شتێك ببێ، یان نەبێ، مەگەر خوا حەز بکا، بەڕاستی خوا زاناو کار لەجێیە.

ئینجا بزانە: (إبن حجر العسقلاني) لە (إبن بطال) ئەگێڕێتەوە: کە (مَشيئة) حەزکردنی خواو (إرادة) ویستنی خوا، هەر بە یەك واتە هاتون... خوای گەورە کردەوەی بەندەکانی دروست ئەکا، هەرچی بەندەکان ئەیکەن، بە (مَشيئة) حەزکردنو (إرادة) ویستنی خوایە، واتە: ئەگەر خوا نەیەوێو حەز نەکا: شتێك ببێ، نابێ. (فتح الباري) ل٥٥١ ب١٣.

هەروەك لە باسی (ویستنو حەزکردنی خوا) بە درێژی ڕوونمان کردەوە.

## ﴿باسی گەیاندنە ڕێی ڕاستو گومڕاکردن ـ الهِدايَةُ والإِضْلالُ﴾

پێشەکی بزانە: (الهِدايَةُ)و (الإِضْلاَلُ) دوو واتەیان هەیە:

**یەکەم:** (الهِدايَة) ڕێنموونیکردن، واتە: شارەزاکرن بۆ ڕێگەی ڕاست، جا بگاتە مەبەست، یان نەگاتێ، خوایگەورە ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ الشورى:٥٢، ئەی پێغەمبەرﷺ تۆ شارەزاییو بانگەوازی ئەکەی بۆ ڕێگەکی ڕاست. هەروەها (الإِضْلاَل): گومڕاکردن، واتە: بردنە سەر ڕێگەی چەوتو لادانی لە ڕێگەی ڕاست، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُ وَمَا هَدَى﴾طه:٧٩، (فرعون) گەلەکەی خۆی گومڕا کردو ڕێنموونی نەکردن بۆ ڕێگەی ڕاست.

يَهْدي مَنْ يَشاءُ وَيَعْصِمُ وَيُعافي فضْلاً، وَيُضِلُّ مَنْ يَشاءُ وَيَخْذُلُ وَيَبْتَلي عدْلاً، وَكُلُّهُمْ يَتَقَلَّبُونَ في مَشيئته بَيْنَ فضْله وَعَدْله، وَهُوَ متعالٍ عن الأضْداد وَالأنْداد.

---

**دووەم:** (الهِدايَة) گەیاندنە ڕێی ڕاست، کە پێی دەڵێن (هدایة التَّوْفیق)، واتە: دروستکردنی (إیمان)و کردنە ئیماندار. (الإضْلال) بردنە سەر ڕێی (کُفر)، واتە: دروستکردنی (کُفْر)و کردنە کافر. جا بزانە: ئەم واتەی دووەم تایبەت بە خوایە، واتە: جگە لە خوا هیچ کەس ناتوانێ کەسێکی تر بکاتە ئیماندار، یان بیکاتە کافر. بۆ دڵنیایی بڕوانە (شَرْح رَمَضان) ل٢١٦و ٢١٧و ٢١٨.

دەربارەی ئەم واتەی دووەم –کە سیفەتی خوایە– ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(يَهْدي مَنْ يَشاءُ) خوای گەورە ئەگەر حەز بکا کەسێك بکاتە ئیماندار، ئەیکاتە ئیماندار (وَيَعْصِمُ) لە کافربوون ئەیپارێزێ (وَيُعافي) بێبەلای ئەکا لە دین‌و دونیا (فضْلاً) لە گەورەیی خۆی ئەوها ئەکا (وَيُضِلُّ مَنْ يَشاءُ) ئەگەر حەز بکا کەسێك بکاتە کافر، ئەیکاتە کافر (وَيَخْذُلُ) سەرشۆڕی ئەکاو یارمەتی نادا (وَيَبْتَلي) بەربەلای ئەکا لە دین‌و دونیا (عَدْلاً) لە دادپەروەری خۆی ئەوها ئەکا، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يُضِلُّ اللهُ مَنْ يشاءُ وَيَهْدي مَنْ يَشاءُ﴾المدثر:٣١، هەر کەسێك خوا حەز بکا بیکاتە کافر، ئەیکاتە کافر، هەر کەسێك خوا حەز بکا بیکاتە ئیماندار، ئەیکاتە ئیماندار.

(وكُلُّهُمْ يَتَقَلَّبُونَ في مَشيئته) هەموو ئەو خەڵکە ئەجوڵێنەوە بە حەزکردنی خوا (بَيْنَ فضْله وَعَدْله) لە نێوان گەورەیی‌و دادپەروەری خوادا، واتە: ئیمانداری‌و کافربوون بە حەزکردنی خوایە، نەك بە حەزکردنی ئێمە، هەروەك خوای گەورە بە پێغەمبەری خۆی ئەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لاَ تَهْدي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللهَ يَهْدي مَنْ يَشَاءُ﴾ القصص:٥٦، ئەی پێغەمبەرﷺ تۆ ناتوانی ئەو کەسەی خۆشت ئەوێ بیکەیە ئیماندار، بەڵام هەرکەسێك خوا حەز بکا، ئەیکاتە ئیماندار.

ئینجا بزانە: لێرەدا بۆمان ئاشکرا بوو: ووشەی (لاَ تَهْدي) لەم ئایەتەدا بە واتەی دووەم بۆ پێغەمبەرﷺ بەکار هاتوە، هەروەکو ووشەی(لَتَهْدي) لەئایەتەکەیتردا–الشوری:٥٢– بە واتەی یەکەم بۆ پێغەمبەرﷺ بەکار هاتوە.

(وَهُوَ متَعالٍ) خوای گەورە زۆر لەوە بەرزترە (عَنِ الأضْداد) کە دژی هەبن لە هەر بڕیارێك‌و لە هەر کارێك کە ئەیکا (وَالأنْداد) یان هاووێنەی هەبن لە هەر کارێك کە ئەیکا، چونکە هەروەك بەندەکانی خۆی دروست کردون، کرداری ئەوانیشی دروست کردون، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَاللهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ﴾ الصافات:٩٦، خوای گەورە ئێوەو کردەوەکانی ئێوەی دروست کردوە.

لاَ رادَّ لِقَضائِه وَلاَ مُعَقِّبَ لِحُكْمِه وَلاَ غالِبَ لأَمْرِه، آمَنَّا بِذَلِكَ كُلِّه وَأَيْقَنَّا أَنَ كُلاًّ مِنْ عِنْدِه. وَإِنَّ مُحَمَّداًﷺ عَبْدُهُ الْمُصْطَفى وَنَبِيُّهُ الْمُجْتَبَى

---

(لاَ رادَّ لِقَضائِه) هیچ كەسێك نیە بڕیاریخوا بە خوا ڕەد بكاتەوە (وَلاَ مُعَقِّبَ لِحُكْمِه) هیچ كەسێك نیە بڕیاریخوا بە خوا دوا بخا (وَلاَ غالِبَ لأَمْرِه) هیچ كەسێك نیە بە سەر فەرمانی خوادا زاڵ بێو فەرمانێكی پێدەربكا، كەوابوو: لە سەر خوای گەورە واجب نیە: كاری باشو سوودبەخش بۆ بەندەكانی بكاو زیانیان لەسەر لابدا –هەروەك (مُعْتَزِلَة) وا ئەڵێن– ، چونكە هەر بە خۆی ئەم خەڵكەی دروست كردوە، هەر بە خۆشی دەستكاری دروستكراوی خۆی ئەكا، هەروەك خۆی ئەفەرموێ: ﴿لاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ﴾ الأنبياء:٢٣، پرسیار لە خوا ناكرێ: بۆ وات كرد؟ بۆ وا ئەكەی؟ بەڵام خەڵك ئەم پرسیارەیان لێ ئەكرێ. (آمَنَّا بِذَلِكَ كُلِّه) باوەڕمان هەیە: بەو هەموو شتەی گوتمان (وَأَيْقَنَّا أَنَ كُلاًّ مِنْ عِنْدِه) گومانمان نیە: گشتی لە لایەن خواوە دروستكراوە.

## ﴿ باسی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ ﴾

پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ ناوی (محمد) كوڕی (عبدالله) كوڕی (عبدالمطلب) كوڕی (هاشم) بوو، دایكی ناوی (آمنة) كچی (وهب) بوو، لە هۆزی (قریش)ی لە گەلی (عرب) بوو، لە شاری (مَكَّة) لە ڕۆژی دووشەممە (١٢)ی مانگی(رَبيعُ الأَوَّل)ی ساڵی فیل، لە دایك بووە، كە ئەكاتە بەرامبەر (٢٠)ی (نیسان)ی ساڵی (٥٧١)ی زایینی.

جا كە تەمەنی بووە چل ساڵی تەواو، هەر لە (مَكَّة) لە ڕۆژی دووشەممە (١٧)ی مانگی ڕەمەزان، بەرامبەر (١)ی شوباتی ساڵی(٦١٠)ی زایینی قورئانی بە (وَحْي) لە بۆ هاتو كرایە پێغەمبەرﷺ، ئینجا ماوەی (١٣) ساڵ هەر لە (مَكَّة) پێغەمبەرایەتی كرد، تا لە (٢)ی مانگی (رَبيعُ الأَوَّل) ساڵی (١)ی كۆچی (مَكَّة)ی بەجێ هێشتو كۆچی كرد لە بۆ (مَدينَة)، ئەم ڕووداوە گرنگە بە یەكەمین ساڵی كۆچی داندراوە لە مێژووی ئیسلامدا، كە ئەكاتە بەرامبەر (٢٠)ی مانگی (أَيْلول)ی ساڵی (٦٢٢)ی زایینی.

ئینجا لە (مَدينَة)ش ماوەی (١٠) ساڵیتر پێغەمبەرایەتی كرد، لە ڕۆژی دوو شەممە (١٢)ی (رَبيعُ الأَوَّل) ساڵی (١١)ی كۆچی بەرامبەر (٨)ی (حُزَيْران) ساڵی (٦٣٣)ی زایینی لە (مَدينَة) وەفاتی كردﷺ، هەر لە ماڵی خۆی لە ژوورەكەی حەزرەتی (عائشة)ی خێزانیدا نێژراوە، ئێستا ئەم ژوورە كەوتۆتە ناو مزگەوتی پێغەمبەرﷺ لە (مَدينَة)، كەوابوو: ماوەی (٢٣) ساڵان پێغەمبەر بووەو، تێكڕا تەمەنی (٦٣) ساڵ بوو.

ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(وَإِنَّ مُحَمَّداً) ئێمە ئەڵێینو باوەڕمان هەیە: كە (مُحَمَّد)ﷺ (عَبْدُهُ الْمُصْطَفى) بەندەیەكی هەڵبژاردەی خولیە لە ناو بەندەكاندا (وَنَبِيُّهُ الْمُجْتَبَى) پێغەمبەرێكی هەڵبژاردەی خولیە لە ناو

وَرَسُولُهُ الْمُرْتَضَى، وَإِنَّهُ خاتَمُ الأَنْبِياء وَإِمامُ الأَتْقِياء وَسَيِّدُ الْمُرْسَلِين وَحَبِيبُ رَبِّ الْعالَمِين،

پێغەمبەراندا عليهم الصلاة والسلام (وَرَسُولُهُ الْمُرْتَضَى) پێغەمبەرێکی پێڕازیبووی خوایە ﴿عَنْ وَاثِلَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللهَ اصْطَفَى كِنَانَةَ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ، وَاصْطَفَى قُرَيْشًا مِنْ كِنَانَةَ، وَاصْطَفَى مِنْ قُرَيْشٍ بَنِي هَاشِمٍ، وَاصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ﴾ رواه مسلم والترمذي، خوای گەورە لە نەتەوەی (إسماعیل)پێغەمبەرﷺ (کنانة)ی هەڵبژارد، لە نەتەوەی (کنانة)ش (قُریش)ی هەڵبژارد، لە (قُریشی)یەکانیش (بَنیهاشم)ی هەڵبژارد، منیشی لە (بَنیهاشم) هەڵبژارد. کەوابوو: پێغەمبەر ﷺ هەم بەندەو هەم پێغەمبەرێکی بژاردەیەﷺ.

(وَإِنَّهُ خَاتَمُ الأَنْبِيَاء) پێغەمبەری ئێمەﷺ تەواوکەری هەموو پێغەمبەرانەو هیچ پێغەمبەرێکیتر لە دوای وی نایێ، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلَكِنْ رَسُولَ اللهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ﴾ الأحزاب:٤٠، بەلام (مُحَمَّدٌ) ﷺ پێغەمبەری خوایەو تەولوکەری پێغەمبەرانە صلى الله عليهم أجمعين (وَإِمَامُ الأَتْقِيَاء) پێغەمبەری ئێمەﷺ پێشەوای لە خواترسەکانە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللهُ﴾ آل عمران:٣١، ئەی پێغەمبەرﷺ بەم خەلکە بلێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش ئەوێ، وەرن شوێن من بکەون، تا خوای گەورە ئێوەی خۆش بوێ. پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿أَمَا وَاللهِ إِنِّي لأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ﴾ رواه البخاري ومسلم، سوێند بە خوا، من لە هەمووتان لەخواترسترو خواپەرستترم. کەوابوو: هەر کەسێکیش خوا پەرستو لەخوا ترسی ڕاستەقینە بێ، پێغەمبەرﷺ تاکە پێشەوایەتی.

(وَسَيِّدُ الْمُرْسَلِين) پێغەمبەری ئێمەﷺ گەورەی هەموو پێغەمبەرانە صلى الله عليهم أجمعين، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَبِيَدِي لِوَاءُ الْحَمْدِ وَلاَ فَخْرَ، وَمَا مِنْ نَبِيٍّ يَوْمَئِذٍ آدَمَ فَمَنْ سِوَاهُ إِلاَّ تَحْتَ لِوَائِي، وَأَنَا أَوَّلُ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الأَرْضُ وَلاَ فَخْرَ﴾ رواه الترمذي وبعضه في صحيح مسلم، من گەورەی نەتەوەی ئادەمم لە ڕۆژی قیامەت، ئالای سوپاس لە دەست من دایە، بە شانازی وا نالێم، هەر پێغەمبەرێك هەیە –لە ئادەمەوە تا ئەوانیتریش– لە ڕۆژی قیامەت لە ژێر ئالای منن، من یەکەم کەسم کە گۆڕەکەم بۆ لەت ئەبێو دێمە دەرەوە لە ڕۆژی قیامەت.

(وَحَبِيبُ رَبِّ الْعَالَمِين) پێغەمبەرمانﷺ خۆشەویستی خوای پەروەردگارە، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ اتَّخَذَنِي خَلِيلاً كَمَا اتَّخَذَ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً﴾ رواه مسلم، خوای گەورە منی کردۆتە دۆستی خۆی، هەروەکو (إبراهیم) پێغەمبەریﷺ کردۆتە دۆستی خۆی.

ئینجا بزانە: دۆستایەتی بەرزترین پلەی خۆشویستنە. بڕوانە (شرح الطحاوية) ل١٦٤ ب١.

وَكُلُّ دَعْوَى النُّبُوَّةِ بَعْدَهُ فَغَيٌّ وَهَوَى، وَهُوَ الْمَبْعُوثُ إِلَى عَامَّةِ الْجِنِّ وَكَافَّةِ الْوَرَى بِالْحَقِّ وَالْهُدَى وَبِالنُّورِ وَالضِّيَاءِ.

---

(وَكُلُّ دَعْوَى النُّبُوَّةِ بَعْدَهُ) هەر داواكاریەكی پێغەمبەرایەتی لە دوای هاتنی پێغەمبەرﷺ، ڕوو بدا (فَغَيٌّ وَهَوَى) گومڕاییو درۆ و دەلەسەیە، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي ثَلاثُونَ كَذَّابُونَ كُلُّهُمْ يَزْعَمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ، وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ لاَ نَبِيَّ بَعْدِي﴾ حديث صحيح رواه الترمذي وأبوداود، لە مەودوا لە ئوممەتی من سی كەسی درۆزن داوای پێغەمبەرایەتی ئەكەن، من تەواوكەری پێغەمبەرانم، هیچ پێغەمبەرێك لە دوای من نابێ. كەوابوو: لە دوای هاتنی پێغەمبەری ئێمەﷺ هەركەسێك بڵێ: من پێغەمبەرم. ئەوە كافرەو درۆزنە. ئینجا بزانە: كە لە كۆتایی دونیادا حەزرەتی (عیسى)پێغەمبەرﷺ دێتە خوارەوە، بە شەریعەتی ئیسلام ڕەفتار ئەكا، ئاشكراشە: ئەو لە پێش پێغەمبەری ئێمەدا، پێغەمبەر بووە.

(وَهُوَ الْمَبْعُوثُ إِلَى عَامَّةِ الْجِنِّ) حەزرەتی (محمد) ﷺ بە پێغەمبەرایەتی ناردراوە بۆ لای هەموو جنۆكەكان، خوای گەورە گوتەی جنۆكەمان بۆ ئەگێڕێتەوەو ئەفەرموێ: ﴿يَاقَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُمْ مِنْ ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ الأحقاف:٣١، ئەی گەلی ئێمەی جنۆكە، شوێن پێغەمبەری خوا بكەونو باوەڕی پێبكەن، تاكو خوا لە گوناهتان خۆش ببێو لە سزا بە ئازارەكەی دۆزەخ بتانپارێزێ. (وَكَافَّةِ الْوَرَى) هەروەها بە پێغەمبەرایەتی ناردراوە بۆ لای هەموو ئادەمیزادێك، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿قُلْ يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا﴾الأعراف:١٥٨، ئەی پێغەمبەرﷺ بڵێ: ئەی خەڵكینە من پێغەمبەری خوامە بۆ لای ئێوە بە گشتی. هەروەها پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لاَ يَسْمَعُ بِي أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الأُمَّةِ: يَهُودِيٌّ وَلاَ نَصْرَانِيٌّ، ثُمَّ يَمُوتُ وَلَمْ يُؤْمِنْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ إِلاَّ كَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ﴾ رواه مسلم، سوێند بەو خوایەی گیانی (محمد)ی بە دەستە: هەر یەكێك لەم خەڵكە بانگەوازی منی گوێ لێ بێ–جولەكە بێ، یان دیان بێ– ئینجا بمرێو باوەڕی بە بەرنامەی من نەبوبێ، ئەوە ئەچێتە دۆزەخ. (بِالْحَقِّ وَالْهُدَى) پێغەمبەرﷺ بۆ شارەزاكردنی ڕێگەی ڕاست ناردراوە (وَبِالنُّورِ وَالضِّيَاءِ) ئاینێكی ڕۆشنی هێناوە كە لە قورئانو حەدیسدا تۆمار كراوە.

ئینجا بزانە: پێغەمبەرەكانیتر هەر یەكە بۆ گەلێكی تایبەتیو بە زمانی ئەو گەلە ئەكرایە پێغەمبەر، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ﴾إبراهيم:٤، هەر پێغەمبەرێكمان ناردبێ بە زمانی گەلەكەی خۆی ناردومانە، تاكو بەرنامەی خوایان بۆ ڕوون بكاتەوە.

بەلام پێغەمبەری ئیسلام بۆ هەموو گەلەکانی سەر ڕووی زەمین-جنۆکەو ئادەمیزاد- ناردراوە، هەروەك باسمان کرد، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿كَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً﴾ رواه البخاري ومسلم، هەر پێغەمبەرێك بۆ گەلەکەی خۆی بە تایبەتی ئەنێردرا، منیش بۆ هەموو خەڵك نێردراوم بە گشتی، بڕوانە (التاج) ل٣٥ ب١.

## ﴿ باسی قورئان پیرۆز ﴾

قورئانی پیرۆز (كَلاَمُ اللهِ)یە، واتە: فەرموودەی خوای گەورەیە، بۆ پێغەمبەری خۆشەویستیﷺ ناردوە، تاکو خۆیو ئوممەتی ڕەفتاری پێ بکەن، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللهُ﴾ النساء:١٠٥، ئێمە قورئانمان بۆ تۆ ناردوتە خوارەوە بە ڕاستی، تاکو داد لە نێوان خەڵکدا بکەی بەو یاسایەی خوا پێی ناساندوی. کەوابوو: تەنها یاسای خواو پێغەمبەرﷺ ڕاستەڕێی موسوڵمانەو واجبە ڕەفتاری پێبکا.

ئینجا بزانە: قورئانی پیرۆز لە (اللَّوْحُ الْمَحْفُوظ)دا نوسراوەتەوە، لەوێشەوە بە دوو قۆناغ بۆ پێغەمبەرﷺ هاتوتە خوارەوە:

**قۆناغی یەکەم:** لە (اللَّوْحُ الْمَحْفُوظ)وە بە تێکڕایی هێنراوە بۆ ئاسمانی دونیا، ئەم قۆناغە لە (لَيْلَةُ القَدْر) بوو، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ﴾ ئێمە قورئانمان ناردوتە خوارەوە لە شەوی قەدر (لَيْلَةُ القَدْر)دا. ﴿عَنْ إِبْنِ عَبَّاس رضي الله عنهما، قَالَ: فُصِلَ الْقُرْآنُ مِنَ الذِّكْرِ فَوُضِعَ فِي بَيْتِ الْعِزَّةِ مِنَ السَّمَاءِ الدُّنْيَا، فَجَعَلَ جِبْرِيلُ يَنْزِلُ بِهِ عَلَى النَّبِيِّﷺ﴾ رواه الحاكم، وعنه من وجه آخر: ﴿أُنْزِلَ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ إِلَى سَمَاءِ الدُّنْيَا، ثُمَّ أُنْزِلَ نُجُوماً﴾ رواه الطبراني، (إبن عبّاس) ئەفەرموێ: لە شەوی قەدر (لَيْلَةُ القَدْر) قورئان لە (اللَّوْحُ الْمَحْفُوظ) جیا کراوەو بە تێکڕایی هێنرا بۆ ئاسمانی دونیا، لەوێ لە (بَيْتُ العِزَّة) دانرا، ئینجا (جبرائیل) لەوێوە بەش بەش بۆ پێغەمبەریﷺ ئەهێنا. (إبن عبّاس) ئەفەرموێ: لە دوای ئەم قۆناغە، بە تێپەڕبوونی (٢٠) ساڵ، قۆناغی دووەم دەستی پێکرا. (الإتقان في علوم القرآن) ل٤٠ ب١.

**قۆناغی دووەم:** -کە قورئانی پیرۆز لە ئاسمانی دونیاوە بۆ پێغەمبەرﷺ هاتە خوارەوە- لە ڕۆژی دوو شەممە (١٧)ی مانگی ڕەمەزان (١٣) ساڵ پێش کۆچکردن، بەرامبەر (١)ی شوباتی ساڵی (٦١٠)ی زایینی دەستی پێکرد، واتە: کە تەمەنی پێغەمبەرﷺ بووە (٤٠) ساڵ، هاتنە خوارەوەی قورئان دەستی پێکردو بووە پێغەمبەرﷺ، بڕوانە (نور اليقين) ل٢٦، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ﴾البقرة:١٨٥، مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کە قورئانی تێدا هاتوتە خوارەوە.

جا بزانە: ئەم قۆناغەی دووەم بە (٢٣) ساڵ تەواو بوو، یەکەم جار حەزرەتی (جِبْرائیل) سورەتی ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ﴾ تا ئەگاتە ﴿مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ بۆ پێغەمبەری هێنا خوارەوە، ئینجا سورەت سورەتو ئایەت ئایەت، بەگوێرەی ڕووداو و پێویست، (جِبْرائیل) بۆ پێغەمبەری ئەهێنا خوارەوەو شوێنی سورەتو ئایەتەکانی بۆ دیاری ئەکرد: بەو شێوەی لە (اللَّوْحُ الْمَحْفُوظ)دا نووسراوە، ژمارەی سورەتەکانی قورئان (١١٤) سورەتە، ژمارەی ئایەتەکانی (٦٦١٦) ئایەتە، هەروەك (إبن عبَّاس) فەرموویەتی، ئینجا ئاخیر سورەت کە هاتۆتە خوارەوە سورەتی ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللهِ﴾ بوو، ئاخیر ئایەت ﴿وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللهِ﴾ بوو، البقرة:٢٨١، بڕوانە (الإتقان) ل٢٣و ٢٧و ٦٤و ٦٧ ب١.

ئینجا بزانە: ئەم قورئانەی لە بەردەستی ئێمەدایە، هەر ئەو قورئانەیە کە لە (اللَّوْحُ الْمَحْفُوظ)دا نووسراوەو، (جِبْرائیل) بۆ پێغەمبەری هێناوەو، پێغەمبەریش ﷺ بە بێ‌گۆڕین بە (صَحابَة)کانی ڕاگەیاندوە، بە بێ‌هیچ گۆڕانێکیش لە (صَحابَة)وە پشت بە پشت بە ئێمە گەیشتووە، کەوابوو: هیچ کەسێك ناتوانێ دەستکاری قورئان بکاو بیگۆڕێ، چونکە (مُعْجِزَة)ی بەردەوامی پێغەمبەرە ﷺو هەروەك خۆی ئەمێنێتەوە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ الحجر:٩، ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە، ئێمەش پارێزەری قورئانین. کەوابوو: گوتەی شیعەکان -کە ئەڵێن: قورئان گۆڕانکاری تێدا کراوە- پوچەڵەو بەو ئایەتە ڕەد دەکرێتەوە.

## ﴿قورئان فەرموودەی (أزلی) خوای گەورەیە﴾

ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(وَإِنَّ الْقُرْآنَ كَلاَمُ اللهِ) ئەڵێین‌و باوەڕمان وایە: قورئان فەرموودەی خوایە. ئیمامی (البيهقي) ئەفەرموێ: قورئان فەرموودەی خوایە، فەرموودەی خوا (كَلاَمُ اللهِ) سیفەتێکە لە سیفەتەکانی زاتی خوا، هیچ سیفەتێکی زاتی خوا نە دروستکراوەو نە پەیدا بووە (الإعْتِقاد) ل٩٤. واتە: گشت سیفەتێکی خوا (أزلي)یە، کەوابوو: (كَلاَمُ اللهِ) فەرموودەی خوا سیفەتێکی (أزلي)یەو (مِنْهُ بَدَا) قورئانی پیرۆز لە خواوە دەر کەوتووەو بە ئێمە گەیشتوە (بِلاَ كَيْفِيَّةٍ قَوْلاً) چۆنیەتی گفتوگۆکردنی خوا نازانرێ، چونکە (كَلاَمُ اللهِ) گفتوگۆی خوا، بە پیتو دەنگ نیە.

(إبن حجر العَسقلاني) لە ئیمامی (البيهقي) ئەگێڕێتەوەو ئەفەرموێ: چونکە خوای گەورە ئەندامی دەرچوونی پیتو دەنگی نیە، نابێ فەرموودەکەشی بە پیتو دەنگ بێ، جا هەر کاتێك یەکێك گوێی لە فەرموودەکەی خوا بوو و تێی گەیشت، ئەو بە پیتو دەنگ

ئەیخوێنێتەوە...ئینجا ئەفەرموێ: كە ئەڵێن: گفتوگۆی خوا (كَلاَمُ الله) بە پیتو دەنگ نیە. مەبەست ئەو گفتوگۆیە (كَلاَمُ الله)یە: كە سیفەتێكە بە زاتی خواوە وەستاوەو سیفەتێكی (أَزَلی)یە، بەلاّم ئەو پیتانەی بە زمانو لێو ئەگوترێن، ئەوانە هاتووی لاچوون، ئەو پیتانەی لەسەر شتێك ئەنووسرێن، ئەوانیش لاشەنە، لاشەو هاتووی لاچووش ناگونجێن بە زاتی خواوە بوەستێ[٧]، واتە: نابنە سیفەتی خوا. (فتح الباري) ل٥٦٠و ٦٠٣ ب١٣.

ئینجا بزانە: (مُعْتَزِلَة)و چینێكی (حَنْبَلی) ئەڵێن: (كَلاَمُ الله) گفتوگۆیخوا بە پیتو دەنگە، بەلگەشیان ئەم حەدیسەیە، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿يَحْشُرُ الله الْعِبادَ فَيُناديهِمْ بِصَوْتٍ يَسْمَعُهُ مَنْ بَعُدَ كَمَا يَسْمَعُهُ مَنْ قَرُبَ: أناالْمَلِكُ أنا الدَّيَّانُ﴾ رواه البخاري، خوای گەورە حەشری بەندەكان ئەكا، جا بە دەنگێك بانگیان ئەكا، ئەوەی دوورەو ئەوەی نزیكە گوێی لێئەبێ: من مەلیكم من سزادەرمو پاداشدەرم. ئینجا ئێمەش لە وەلاّمدا ئەڵێین: (صَوْت) دەنگ سیفەتێكی زاتی خوایە، جا چونكە لە حەدیسدا باس كراوە، واجبە ئیمانمان پێی هەبێو چۆنیەتیو مەبەست بدەینە پاڵ زانستی خوا، یان بڵێین: خوا فەرمان بە فریشتەیەك ئەكاو بانگ ئەكا، واتە: دەنگەكە دەنگی فەرمان پێكراوەكەیە. بڕوانە (فتح الباري) ل٥٦٠و ٥٦١و ٥٦٣ ب١٣.

(وَأَنْزَلَهُ عَلَى رَسُولِه) خوا قورئانی بۆ پێغەمبەرﷺ ناردۆتە خوارەوە (وَحْياً) بە وەحی، واتە: لە سەر زمانی (جُبْرائیل) بۆی ناردوە، كە (جُبْرائیل) لە خوای گوێ لێبووەو پێغەمبەریشﷺ لە (جُبْرائیل) گوێی لێبووەو بە خەڵكی ڕاگەیاندووە، بڕوانە (شرح الطحاوية) ل١٩٥ ب١، كەواتە: قورئان بە نووسراوی نەهاتۆتە خوارەوە (وَصَدَّقَهُ الْمُؤْمِنُونَ عَلَى ذَلكَ حَقّاً) ئیمانداران باوەڕیان بەم قورئانە هێناوە بەو شێوەی گوتمان (وَأَيْقَنُوا أَنَّهُ كَلاَمُ الله تَعَالَى) دڵنیا بوون: كە ئەو قورئانە فەرموودەی خوایە (بِالْحَقِيقَة) بە شێوەیەكی ڕاستەقینە لە خوا وەرگیراوە، ئیمامی (البيهقي) ئەفەرموێ: (كَلاَمُ الله) فەرموودەی خوا لە (أَزَل)دا هەر هەبووە، هەتا هەتاش هەر ئەبێ، جا هەر كاتێك خوای گەورە حەز بكا: فەرموودەی خۆی بخاتە گوێی فریشتەكانی، یان پێغەمبەرەكانی، یان بەندەكانی، ئەم

[٧] (٧)—هەر كاتێك پرسیار بكرێ: ئەگەر (كَلاَمُ الله) فەرموودەی خوا، بێ پیتو دەنگ بێ، چۆن ئەبیسترێو، ئەگاتە فریشتەو پێغەمبەرﷺ؟ وەلاّم: پیتو دەنگ مەرج نیە، چونكە ئەگونجێ (كَلاَمُ الله) فەرموودەكەی خوا بكەوێتە هۆشی فریشتەو، دڵی پێغەمبەرﷺ بەبێ پیتو دەنگ، چونكە ئاشكرایە: لە سەردەمی ئێستاماندا ئەبینین: ئامێری تۆمار كردن، دەنگو پیت ئەگوازێتەوە بۆ ئامێرێكیتر بەبێ پیتو دەنگ، دەنگەكە تۆمار ئەبێ، هەروەها ئامێری (تلكس) لە شوێنێك بروسكەی لەناو دائەندرێو، لە شوێنێكیتر بە تەواوی چاپ ئەكرێ بەبێ ناردنی دەنگو پیت، جا ئەڵێن:—﴿وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الأَعْلَى﴾— كە ئادەمیزاد ئەم دەسەلاّتەی هەبێ، ئەبێ دەسەلاّتی خوا چەند بێ؟!.

لَيْسَ بِمَخْلُوقٍ كَكَلامِ الْبَرِيَّةِ، فَمَنْ سَمِعَهُ فَزَعَمَ أَنَّهُ كَلامُ الْبَشَرِ فَقَدْ كَفَرَ، وَقَدْ ذَمَّهُ اللهُ وعابَهُ وَأَوْعَدَهُ بِسَقَرَ، حَيْثُ قَالَ تَعالَى: ﴿سَأُصْلِيهِ سَقَرَ﴾ فَلَمَّا أَوْعَدَ اللهُ بِسَقَرَ لِمَنْ قالَ: (إِنْ هَذا إِلاَّ قَوْلُ الْبَشَرِ) عَلِمْنا وَأَيْقَنَّا أَنَّهُ قَوْلُ خالِقِ الْبَشَرِ،

---

فەرموودەیە نەبیستریێو چۆنیەتی بیستنی نازاندریێ، جا ئەو فەرموودە بیستراوە سیفەتی خوایە لە (أزل)ەوە هەتا هەتایە، بروانە (الإعتقاد) ل١٠٠.

(لَيْسَ بِمَخْلُوقٍ) قورئانی پیرۆز دروستکراو نیە (كَكَلامِ البَرِيَّةِ) وەکو گفتوگۆی خەڵك، کەوابوو: خوای گەورە لە (أزل)دا گفتوگۆی هەر هەبووە، هەر کاتێکیش حەز بکا گفتوگۆ ئەکا، ئیمامی (البُخاري) ئەفەرموێ: خوای گەورە فەرموویەتی: قورئان لەبەر ئەکرێو ئەنووسرێ. ئەو قورئانەی لەبەر کراوەو نووسراوەو بە زوبان ئەخوێندرێ، فەرموودەی خوایەو، دروستکراو نیە، بەڵام پێنووس‌و پەڕو بەرگ دروستکراون. بروانە (فتح الباري) ل٦٣٩ ب١٣. کەوابوو: نووسینی ئێمەو خوێندنەوەی ئێمەش دروستکراوە.

﴿**ئاگاداری**﴾: (جَهْمِيَّة)و (مُعْتَزِلَة)و چینێکی (شيعة)و (خوارج)–کە گشتیان لە (أَهْلُ البِدْعَة وَالضَّلاَلَة)ن– ئەڵێن: (كَلامُ الله) فەرموودەی خوا دروستکراوە، چینێکی (حَنْبَلي)ش ئەڵێن: خوا بە پیتەکانی قورئان گفتوگۆی کردوەو دەنگی خۆی خستوتە گوێی فریشتەو پێغەمبەرەکان، ئەم پیتو دەنگانەش لە (أزل)دا بە زاتی خواوە وەستاون.

ئینجا بزانە: ئەو فەرموودەی لە کۆمەڵی (سَلَفْ) وەرگیراوە، ئەوەیە: واز لە لێکۆڵینەوەی ئەم باسە بێنین‌و تەنها بڵێین: قورئان (كَلامُ الله)یەو دروستکراو نیە، ئیتر لەمە زیاتر لێی نەکۆڵینەوە، (فتح الباري) ل٥٥٧ ب١٣.

(فَمَنْ سَمِعَهُ) هەرکەسێك گوێی لە قورئان بێ (فَزَعَمَ أَنَّهُ كَلامُ البَشَرِ) وا تێبگاو بڵێ: ئەم قورئانە گوتەی ئادەمیزادە (فَقَدْ كَفَرَ) ئەوە کافر ئەبێ (وَقَدْ ذَمَّهُ اللهُ وَعابَهُ) خوای گەورە بە خراپە باسی ئەو جۆرە کەسەی کردوەو لەکەداری کردوە (وَأَوْعَدَهُ بِسَقَرَ) بڕیاری داوە بیباتە دۆزەخ (حَيْثُ قَالَ تَعالَى) هەروەك فەرموویەتی: ﴿سَأُصْلِيهِ سَقَرَ﴾ المدثر:٢٦، ئەیبەمە دۆزەخ (فَلَمَّا أَوْعَدَ اللهُ بِسَقَرَ لِمَنْ قالَ) ئینجا کە خوای گەورە هەڕەشەی بە دۆزەخ لەو کەسە کردوە کە ئەڵێ: ﴿إِنْ هَذَا إِلاَّ قَوْلُ الْبَشَرِ﴾ المدثر:٢٥، ئەم قورئانە گوتەی ئادەمیزادە–ئەم کافرەی ئەوەهای گوت، ناوی (الوليد بن المغيرة) بوو– (عَلِمْنا وَأَيْقَنَّا: أَنَّهُ قَوْلُ خالِقِ البَشَرِ) زانیمان‌و باوەڕمان هەیە: قورئان فەرموودەی خوایە.

ئینجا بزانە: کە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ﴾ التكوير:١٩، ئەم قورئانە گوتەی نێردراوێکی بەڕێزە. ئیمامی (البَيهقي) ئەفەرموێ: واتە: فەرموودەیێکە لە نێردراوێکی بەڕێزی وەرگرتوە، یان نێردراوێکی بەڕێز هێناویەتیە خوارەوە. بروانە (الإعتقاد) ل٩٧.

وَلاَ يُشْبِهُ قَوْلَ الْبَشَرِ، وَمَنْ وَصَفَ اللهَ بِمَعْنَىً مِنْ مَعَانِي الْبَشَرِ فَقَدْ كَفَرَ، فَمَنْ أَبْصَرَ هَذَا إِعْتَبَرَ وَعَنْ مِثْلِ قَوْلِ الْكُفَّارِ إِنْزَجَرَ وَعَلِمَ أَنَّهُ بِصِفَاتِهِ لَيْسَ كَالْبَشَرِ.

---

## ﴿ گفتوگۆی خوای گەورە وەگفتوگۆی ئادەمیزاد ناچێ؟ ﴾

(وَلاَ يُشْبِهُ قَوْلَ الْبَشَرِ) ئەم قورئانە وەکوتەی ئادەمیزاد ناچێ، چونکە قورئان زۆر لەوە بەرزترو لوس‌و ڕێك‌و پێك‌و ڕاستترە، کە وەکوتەی بەندەیەکی دروستکراوی بێچارە بچێ، کەوابوو: هەروەك تا ئێستا کەس نەیتوانیوە کوتەیەکی وەکو قورئان بڵێ، لەمەودواش کەس ناتوانێ، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَاالْقُرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا﴾ الإسراء:٨٨، بڵێ: ئەگەر ئادەمیزادو جنۆکە کۆببنەوە لە سەر ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بێنن، ناتوانن بیهێنن هەرچەند هەندێکیشیان یارمەتی دەری هەندێکیان بن. ئینجا بەم مەیدانخواستنە، قورئان (مُعْجِزَة)ی بەردەوامی پێغەمبەرەﷺ کەواتە: ئەوەی باوەڕ ناکا، پێی ئەڵێن: (ئەوە ئەرز و ئەوە گەز).

(وَمَنْ وَصَفَ اللهَ) هەرکەسێك باسی خوا بکا (بِمَعْنَىً مِنْ مَعَانِي الْبَشَرِ) بە سیفەتێك لە سیفەتەکانی ئادەمیزاد، واتە: هەرکەسێك گفتوگۆی خوا بە گفتوگۆی ئادەمیزاد دابنێ (فَقَدْ كَفَرَ) ئەوە کافر ئەبێ (فَمَنْ أَبْصَرَ هَذَا) هەرکەسێك تەماشا بکاو بیر بکاتەوە: کە سیفەتەکانی خوا وەکو سیفەتی ئادەمیزاد نیە (إِعْتَبَرَ) تەمبێ ئەبێ‌و (وَعَنْ مِثْلِ قَوْلِ الْكُفَّارِ إِنْزَجَرَ) لە وێنەی قسەی کافرەکان لائەدلو ناڵێ: قورئان کوتەی ئادەمیزادە (وَعَلِمَ أَنَّهُ بِصِفَاتِهِ لَيْسَ كَالْبَشَرِ) ئەزانێ: خوای گەورە بە سیفەتەوە وەکو ئادەمیزاد نیە، واتە: خوای گەورە بە زات‌و سیفەتەوە (أَزَلِي)و (أَبَدِي)یەو خوای گەورە سیفەتی بەرزو بەرێزی هەنە، بەڵام وەکو سیفەتی هیچ دروستکراوێك نیە، نە زاتی خواو نە سیفەتی خوا وەهیچ بوونەوەرێك ناچێ.

## ﴿ لە کاتێکدا ئەم قورئانە بۆ لای خوا ئەگەڕێتەوە ﴾

بزانە: لە کاتێکدا وا ڕوو ئەدا: ئەم قورئانە لە سینەی خەلکدانامێنێ‌و گشت قورئانێکی نووسراویش ئەسڕێتەوەو یەك ئایەتیش لە سەر زەمین نامێنێ (شرح الطحاوية)ل١٩٥ ب١، ﴿عَنْ حُذَيْفَةَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: يَدْرُسُ الإِسْلاَمُ كَمَا يَدْرُسُ وَشْيُ الثَّوْبِ، حَتَّى لاَ يُدْرَى: مَا صِيَامٌ وَلاَ صَلاَةٌ وَلاَ نُسُكٌ وَلاَ صَدَقَةٌ؟ وَلَيُسْرَى عَلَى كِتَابِ اللهِ عزوجل فِي لَيْلَةٍ فَلاَ يَبْقَى فِي الأَرْضِ مِنْهُ آيَةٌ، وَتَبْقَى طَوَائِفُ مِنَ النَّاسِ -الشَّيْخُ الْكَبِيرُ وَالْعَجُوزُ- يَقُولُونَ: أَدْرَكْنَا آبَاءَنَا عَلَى هَذِهِ الْكَلِمَةِ-(لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ)- فَنَحْنُ نَقُولُهَا...﴾ الحديث، رواه ابن ماجه والحاكم بسند صحيح، واتە: بەرە بەرە ئاسەواری ئیسلام نامێنێ، هەروەکو بەرە بەرە ڕەنگی جلوبەرگ نامێنێ، تا نازانرێ: ڕۆژوو چیە، نوێژ چیە، حەج چیە، زەکات چیە؟ شەوێك بە سەر قورئاندا ئەڕواو یەك ئایەتی قورئان لە سەر ڕووی زەمین نامێنێ،

وَالرُّؤْيَةُ حَقٌّ لأَهْلِ الْجَنَّة بِغَيْرِ إحاطة ولا كَيْفِيَة كما نطق به كتابُ رَبِّنا: ﴿وُجُـوهٌ يَوْمَئِـذٍ نَاضِرَةٌ، إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ وَتَفْسِيرُهُ عَلَى مَا أَرَادَهُ اللهُ تعالى وَعَلِمَهُ، وَكُلُّ ما جاء في ذلك من الْحَدِيثِ الصَّحِيحِ عَنِ الرَّسُولِ ﷺ فَهُوَ كَمَا قَالَ، وَمَعْنَاهُ عَلَى مَا أراد،

---

کۆمەڵە خەڵکێك-پیرە مێرد و پیرە ژن- ئەمێننەوە ئەڵێن: ئێمە گەیشتینە باوکو باپیرانمان ئەم ووشەی(لاإلَهَ إلاّالله)یان ئەگوت، ئێمەش ئەیڵێین. (التذكرة للقرطبي) ل٨٣٩ ب٢.

## ﴿ باسی دیتنی خوای گەورە لە گۆڕەپانی (محشر)و لە بەهەشت ﴾

بزانە: (أهْلُ السُّنَّة وَالجَماعَة) چینی (سَلَف)و (خَلَف) یەکدەنگن: کە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت ئەدیترێ، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ يَوْمَ الْقِيامَة كَمَا تَرَوْنَ هَذا، لاَ تُضَامُونَ فِي رُؤْيَتِه﴾ رواه البخاري ومسلم، ئێوە لە ڕۆژی قیامەت خوا ئەبینن هەروەکو ئەم مانگە ئەبینن، پاڵەپەستە ناکەن و ستەمتان لێناکرێ لە دیتنی، چونکە لە هەموو لایەکتانەوە ئەیبینن. ئینجا موسوڵمانان لە ڕۆژی قیامەت لە دوو شوێندا خوا ئەبینن:

**یەکەم:** لە گۆڕەپانی (مَحْشَر)، پێغەمبەرﷺ لە حەدیسە درێژەکەی (حشر)دا ئەفەرموێ: ﴿...فَيَأْتِيهِمُ اللهُ فِي صُورَتِه الَّتِي يَعْرِفُونَ، فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: أَنْتَ رَبُّنا فَيَتْبَعُونَهُ...﴾ رواه البخاري ومسلم، ئینجا لە (مَحْشَر)دا خوای گەورە خۆی نیشانی خەڵك ئەدا بەو سیفەتەی پێی ئەناسن، ئینجا ئەفەرموێ: من خوای ئێوەمە، ئەوانیش ئەڵێن: تۆ خوای ئێمەی، ئینجا شوێن فەرمانی خوا ئەکەون بۆ بەهەشت. (شرح صحيح مسلم) ل١١٠و ١١١ ب٢.

**دووەم:** لە بەهەشتدا، هەروەك ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ: (وَالرُّؤْيَةُ حَقٌّ) دیتنی خوا ڕاستە (لأهْلِ الْجَنَّة) بۆ دانیشتووانی بەهەشت (بِغَيْرِ إحاطَةٍ وَلاَ كَيْفِيَّةٍ) بێ ئەوەی بزاندرێ: خوا لە کام لایەو چۆن ئەدیترێ (كَمَا نَطَقَ بِه كِتابُ رَبِّنا) ئەدیترێ هەروەکو قورئانی پیرۆز ئەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ القيامة: ٢٢-٢٣، چەند ڕوخسارێك لە ڕۆژی قیامەت ئەدرەوشێنەوەو تەماشای خوای خۆیان ئەکەن. (وَتَفْسِيرُهُ عَلَى مَا أَرادَهُ اللهُ تَعالَى وَعَلِمَهُ) چۆنیەتی دیتنی خوا لە سەر ویستنی خواو زانستی خوایە، ئێمە نازانین چۆن ئەدیترێ، بەڵام گومان لەوەدا نیە: بەهەشتی‌یەکان بە چاوی خۆیان ئەیبینن (وَكُلُّ ما جاءَ فِي ذَلكَ مِنَ الْحَديثِ الصَّحيحِ عَنِ الرَّسُولِﷺ) دەربارەی دیتنی‌خوا، هەر حەدیسێکی ڕاست کە لە پێغەمبەرەوەﷺ هاتبێ (فَهُوَ كَمَا قَالَ) ئەوە چۆنی فەرمووە، وەهایە (وَمَعْنَاهُ عَلَى مَا أَرادَ) واتەی حەدیسەکە لە سەر ویستنی پێغەمبەرەﷺ.

ئینجا یەکێك لەم حەدیسانە ئەمەیە: ﴿عَنْ صُهَيْبٍ رضي الله عنه: عَنِ النَّبِيِّﷺ قَالَ: إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّة الْجَنَّةَ، قَالَ: يَقُولُ اللهُ تبارك وتعالى: تُرِيدُونَ شَيْئًا أَزِيدُكُمْ؟ فَيَقُولُـونَ: أَلَـمْ تُبَـيِّضْ وُجُوهَنَا أَلَمْ تُدْخِلْنَا الْجَنَّةَ وَتُنَجِّنَا مِنَ النَّارِ؟ قَالَ: فَيَكْشِفُ الْحِجابَ فَمَا أُعْطُـوا شَـيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّظَرِ إِلَـى رَبِّهِـمْ عزوجل﴾ رواه مسلم، کاتێ بەهەشتی‌یەکان چوونە

لاَ نَدْخُلُ فِي ذَلِكَ مُتَأَوِّلِينَ بِآرائِنَا، وَلاَ مُتَوَهِّمِينَ بِأَهْوائِنا، فَإِنَّهُ مَا سَلِمَ فِي دِينِه إِلاَّ مَنْ سَلَّمَ لله عَزَّ وَجَلَّ وَلِرَسُولِهِ ﷺ، وَرَدَّ عِلْمَ مَا اشْتَبَهَ عَلَيْهِ إِلَى عَالِمِه، وَلاَ تَثْبُتُ قَدَمُ الإِسْلاَمِ إِلاَّ عَلَى ظَهْرِ التَّسْلِيمِ وَالإِسْتِسْلاَمِ، فَمَنْ رَامَ عِلْمَ مَا حُظِرَ عَنْهُ عِلْمُهُ، وَلَمْ يَقْنَعْ بِالتَّسْلِيمِ فَهْمُهُ، حَجَبَهُ مَرَامُهُ عَنْ خَالِصِ التَّوْحِيدِ وَصَافِي الْمَعْرِفَةِ وَصَحِيحِ الإِيمَانِ فَيَتَذَبْذَبُ بَيْنَ الْكُفْرِ وَالإِيمَانِ وَالتَّصْدِيقِ وَالتَّكْذِيبِ وَالإِقْرَارِ وَالإِنْكَارِ،

---

بەهەشت، خـوای گـەورە پێیـان ئەفـەرموێ: شـتێکیترتان ئـەوێ سـەرەڕای بەهەشت بتاندەمێ؟ ئەوانیش ئەڵێن: ئەدی ڕووخساری ئێمەت سپی نەکردوەو نەتبردوینە بەهەشتو لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارت نەکردوین؟ ئینجا خوای گەورە پەردە لائەدا-واتە: ئەیبینن- هیچ شتێکی خۆشتر نەدراوەتە بەهەشتیان لە تەماشاکردنی خوای خۆیان.

ئینجـا بزانـە: (جَهْمِيَّـة)و (مُعْتَزِلَـة)و (خَـوارِجُ)و (شـيعَة) ئـەڵێن: خـوای گـەورە لـە ڕۆژی قیامەتدا نادیترێ، ئەو ئایەتو حەدیسانەی دیتنی خوا، لە واتەی ڕاستەقینەیان لائەدەن، بەلام ئێمەی (أَهْلُ السُّنَّةِ وَالجَمَاعَةِ) ئەڵێین: خوا لە ڕۆژی قیامەتدا ئـەدیترێ، کـەوابوو: (لاَ نَدْخُلُ فِي ذَلِكَ مُتَأَوِّلِينَ بِآرائِنَـا) خۆمـان تێکـەڵی (تَأْوِيـل)کردنـی ئـەو ئایـەتو حەدیسـانە ناکەین کە دەربارەی دیتنی خوا هاتون، بە ڕەئـی خۆمـان لـە واتـەی خۆیـان لایانئـادەین (وَلاَ مُتَوَهِّمِينَ بِأَهْوائِنا) نابێ بە هەواو هەوەسـی خۆمـان خـەیاڵمان بۆ واتەیـەکیتر بچـێ (فَإِنَّهُ مَا سَلِمَ فِي دِينِه) چونکە هیچ کەسێك لە ئاینەکەی سەلامەت نابێ (إِلاَّ مَنْ سَلَّمَ لله عَزَّ وَجَلَّ وَلِرَسُولِهِ ﷺ) تەنها ئەو کەسە نەبێ: کە خۆی تەسـلیمی دەققـی فـەرموودەکانی خواو پێغەمبەر ﷺ ئەکا (وَرَدَّ عِلْمَ مَا اشْتَبَهَ عَلَيْهِ إِلَى عَالِمِـه) زانـینی واتـەی وێکچووەکان (مُتَشابِهات) ئەگەڕێنێتەوە لای ئەو کەسەی کە ئەیزانی-کە خوای گەورەیـە، یـان لەگـەڵ زانایانی ڕووچوش لە زانستدا- (وَلاَ تَثْبُتُ قَدَمُ الإِسْلاَمِ) قاچی ئیسـلامەتی ڕاناوەسـتێ (إِلاَّ عَلَى ظَهْرِ التَّسْلِيمِ وَالإِسْتِسْلاَمِ) تەنها لە سەر پشتی خۆ تەسلیمکردنو ملکەچـی نـەبێ بـۆ فەرموودەکانی خواو پێغەمبەر ﷺ کـەوابوو: هەرکەسێك ملکەچـی فـەرموودەکانی خـواو پێغەمبەر ﷺ نەبێ، قاچی ڕائەزەلێو لە ڕێی ڕاست لائەچێ.

(فَمَنْ رَامَ عِلْمَ مَا حُظِرَ عَنْهُ عِلْمُهُ) هەرکەسێك بیەوێ: ئەو زانسـتە بزانـێ کـە لێی قەدەغـە کراوە لە لای خوا (وَلَمْ يَقْنَعْ بِالتَّسْلِيمِ فَهْمُـهُ) تێگەیشـتنەکەی بـە خـۆ تەسلیمکردن ڕازی نەبێ (حَجَبَهُ مَرَامُهُ عَنْ خَالِصِ التَّوْحِيـدِ) ئـەم مەبەسـتە خراپـە دەرگـای یەکخواپەرسـتی بێگەردی لێـەگرێ (وَصـافِي الْمَعْرِفَـةِ وَصَحِيحِ الإِيمـانِ) هـەروەها ئـەم مەبەسـتە خراپـە قەدەغەی ئەکا: لە ناسینێکی ڕوونی خواو باوەڕی ڕاست (فَيَتَذَبْـذَبُ بَيْنَ الْكُفْرِ وَالإِيمـانِ) هەرکەسێك بە هەواو هەوەسی خـۆی (تَأْوِيـل)ی قورئـانو حـەدیس بکـا، ئـەوە لـە نێـوان (کُفْر)و (إیمان)دا هاتوچۆ ئەکا (وَالتَّصْدِيقِ وَالتَّكْذِيبِ) وە لە نێوان باوەڕ پـێکردنو بـاوەڕ پێنەکردندا (وَالإِقْرَارِ وَالإِنْكَارِ) وە لە نێـوان دان پێداهێنانو دان نەهێنانـدا هاتوچـۆ ئـەکا

مُوَسْوِساً تائِهاً شاكّاً، لا مُؤْمِناً مُصَدِّقاً وَلا جاحِداً مُكَذِّباً، ولا يَصِحُّ الإيمانُ بالرُّؤْيَةِ لأَهْلِ دارِالسَّلامِ لِمَنْ اعْتَبَرَها مِنْهُمْ بِوَهْمٍ أَوْ تَأَوَّلَها بِفَهْمٍ، إذْ كانَ تأويلُ الرُّؤْيَةِ وتأويلُ كُلِّ مَعْنى يُضافُ إلى الرُّبوبيَّةِ: بِتَرْكِ التَّأْويلِ وَلُزُومِ التَّسْليمِ، وَعَلَيْهِ دينُ المُسْلِمينَ.

---

(مُوَسْوِسا) خاوەنی ئەم مەبەستە خراپە هەردەم لە خرتو فرت دایە (تائِها) گومڕاو سەرلێشێواوە (شاكّا) گوماندارە (زائِغا) لە ڕاستی لا ئەداو (لاٰ مُؤْمِناً مُصَدِّقاً) ئیماندارێکی تەواو نیە (وَلاٰ جاحِداً مُکَذِّباً) کافرێکی ڕاستەقینەش نیە، کەواتە ئیماندارێکی فاسقەو (أَهْلُ البِدْعَة وَالضَّلاٰلَة)یە.

ئینجا بزانە: مەبەستی ئیمامی (الطحاوي) لەم فەرموودانە ئەمەیە: بە بێزانست گفتوگۆ لە ئایەتو حەدیسو کاروباری (عقیدة) نەکەین، ئەگەر جۆرە زانستێك لە ئێمە قەدەغە کرابێ، هەوڵی زانینی نەدەین–وەکو چۆنیەتی دیتنی خوا–و ئەگەر ئایەتێك، یان حەدیسێك واتەی ئاشکرای بۆ خوا نەئەگونجا، ئێمە بە هەولو هەوەسی خۆمان (تأويل)ی نەکەین، واتە: لە واتەی ئاشکرای خۆیان لایاننەدەین، مەگەر قورئانو حەدیس پشتگیری ئەم (تأويل)کردنە بکا، هەروەك (إبن أبي العز) ئەفەرموێ: (تأويل)ی ڕاست ئەوەیە: بە بەڵگەی دەقەکانی قورئانو حەدیس بێ، ئەگەر وانەبو، ئەوە (تأويل)ێکی خراپە. (شرح الطحاوية) ل٢٥٦ ب١.

(وَلاٰ يَصِحُّ الإِيمانُ بِالرُّؤْيَةِ لأَهْلِ دارِ السَّلاٰمِ) باوەڕهێنانی کەس–بە دیتنی خوای گەورە لە بەهەشت– بە ئیمانێکی تەواو دانانرێ (لِمَنْ اعْتَبَرَها مِنْهُمْ بِوَهْمٍ) ئەگەر وا تێبگا: خوا وەکو شتێك بە شێوەیەك دەدیترێ، چونکە ئەبێتە (مُشَبِّهَة)، (أَوْ تَأَوَّلَها بِفَهْمٍ) یان بە تێگەیشتنی خۆی (تأويل)ی بکاو بڵێ: مەبەست دیتنی زاتی خوا نیە، بەڵکو مەبەست نیعمەتی خوایە، یان ناسینی خوایە–هەروەکو (شیعة)و (مُعْتَزِلَة) وا ئەڵێن– (إِذْ كانَ تَأْويلُ الرُّؤْيَةِ) چونکە واتەی دیتنی خواو (وَتَأْويلُ كُلِّ مَعْنىً يُضافُ إِلَى الرُّبوبيَّةِ) واتەی هەر سیفەتێکی خوا (بِتَرْكِ التَّأْويلِ) ئەوەیە: واز لە (تأويل)کردن بێنێ، ئەگەر بە بەڵگەی قورئانو حەدیس نەبێ (وَلُزُومِ التَّسْليمِ) هەردەم لایەنی خۆ تەسلیمکردن بە خواو پێغەمبەرﷺ بگرێ (وَعَلَيْهِ دينُ المُسْلِمينَ) ئایینی موسوڵمانانی ڕاستەقینە لە سەر ئەم خۆ تەسلیمکردنەیە، واتە: ئەگەر شتێکیان نەزانیبا، ئەیانگوت: خواو پێغەمبەرﷺ ئەزانن: ئەمە چۆنە، یان مەبەستیان چییە.

ئینجا بزانە: خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿كَلاّ إِنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَمَحْجُوبُونَ﴾ المطففين:١٥، کافرەکان لە ڕۆژی قیامەتدا لە دیتنی خوا قەدەغە ئەکرێن.

﴿**پاشکۆ**﴾: زانایانی ئیسلام یەکدەنگن: کە هیچ کەسێك لە دونیادا خوا نابینێ، بەلام دەربارەی پێغەمبەرﷺ بووەتە کێشەیان: ئایا پێغەمبەرﷺ بە چاوی خۆی خوای

دیتوه، یان نا؟ حەزرەتی(عائشة) رضي الله عنها ئەفەرموێ: نەیدیتوه. حەزرەتی (إبنْ عَبّاس) رضي الله عنهُما دەفەرموێ: دیتوویەتی.

ئینجا ئیمامی (النَّـواوي) ئەفەرموێ: ڕای بەهێز لە لای زۆربەی زانایان ئەمەیە: کە پێغەمبەرﷺ لە شەوی (معْراج) بە هەردوو چاوی خۆی خوای گەورەی دیتوه، بە بەڵگەی: حەدیسەکەی (إبنْ عبَّاس)و چەندانیتر. (شرح صحیح مسلم) ل٩٢ ب٢.

## ﴿باسی (مُشَبِّهَة)و (مُجَسِّمَة)و (جَهْمِيَة)﴾

بزانە: (المُشَبِّهَة)و (المُجَسِّمَة) دوو گرۆهی (أهْل البدْعَة والضَّلالة)نو ئەڵێن: خوا (جسْم) لاشەیەو ئەندامی هەنەو لە سەر (عَرْش) نیشتەجێیە، بڕوانە (شرح المواقف) ل٤٩٢ ب٢، بەڵام لەوەدا جیاوازن: (مُشَبِّهَة)کان خوای گەورەو سیفەتەکانی (تَشْبيه) ئەکەن بە شتی دروستکراو، واتە: وێی ئەچوێنن، بەڵام (مُجَسِّمَة)ی ڕووت (تَشْبيه)ی ناکەنو وەشتیتری ناچوێنن. ئینجا بزانە: (عَقيدَة)ی ئەم دوو چینە -واتە: (تَشْبيه)و (تَجْسيم)- لە جولەکە وەرگیراوە.

(إبنْ حَجَر العَسْقَلاني) ئەفەرموێ: جولەکە (مُشَبِّهَة)نە، لەو (تَشْبيهَة)ی ئەوان ئەیکەن، لە (تَوْراة)دا چەند ووشەیەك هەنە: ئەبنە (تَشْبيه)و ڕاڕەوی موسوڵمان نایگرێتەوە...ئینجا ئەفەرموێ: جولەکە باوەڕیان وایە: خوا لاشەیەکەو ئەندامیشی هەنە، هەروەکو (مُشَبِّهَة) توندڕەوەکانی ئەم ئوممەتەش ئەم باوەڕەیان هەیە[8]، بڕوانە (فتح الباري شرح البخاري) ل٤٩٠و ٤٩١ ب١٣.

(٨)-بۆ بەهێزکردنی فەرموودەی (إبن حجر العَسْقَلاني) -کە ئەڵێ: عەقیدەی (مُجَسِّمَة)و (مُشَبِّهَة) لە جووەکان وەرگیراوە- ئەم ڕوونکردنەوەیە ئەخەینە بەرچاو:

کە حەزرەتی (مُوسى) پێغەمبەرﷺ چووە کێوی (طُور) تاکو خوای گەورە (تَوْراة)ی بۆ بنێرێتە خوارەوە، ماوەی چل ڕۆژی پێچوو، ئینجا لەم ماوەیەدا پیاوێکی (مُنافق) بە ناوی (السَامِري) گوێلکێکی لە زێڕ دروست کردو گوتییە (بَني إسْرائيل) جووەکان: ئەمە خوای ئێوەو (مُوسَى)یە، (بَني إسْرائيل)ش کەوتنە پەرستنی گوێلکەکە، تا (مُوسى) پێغەمبەرﷺ گەڕاوە وازیان لە پەرستنی نەهێنا، بڕوانە سورة البقرة:٥١، وە سورة طه:٨٥ تا٩٨.

جا لەم ڕێژەوە جووەکان باوەڕیان وایە: خوای گەورە لاشەی هەیەو وەشتیتر ئەچێ، بە شێوەیەکی وەها ئەم باوەڕە لە دڵیاندا جێگیر بووە، کە (تَوْراة) زۆر ئەفسانەی تێدا نووسراوەتەوە، بۆ نموونە: دەربارەی (يَعْقُوب) پێغەمبەرﷺ -کە باوکی گشت (بَني إسْرائيل)- لە (تَوْراة)دا نووسراوە: (مرۆڤێك زۆرانەی لەگەڵ (يَعْقُوب) کرد تا بەرەبەیان، ئینجا کە زانی توانای (يَعْقُوب)ی نیە، لە جومگەی ڕانی (يَعْقُوب)ی دلو ترازاندی، ئینجا مرۆڤەکە پێی گوت: لەمەودوا بە (يَعْقُوب) بانگ ناکرێی، بەڵکو بە (إسْرائيل) ناو ئەبرێی، چونکە لەگەڵ خوادا تێکۆشاویو توانیشت... ئینجا خوا لەوێ (يَعْقُوب)ی پیرۆز کرد). بڕوانە (التَّوراة) الأصحاح (٣٢) سفرالتكوين.

مەبەستی جووەکان ئەمەیە: ئەو مرۆڤەی زۆرانەی لەگەڵ (يَعْقُوب) کرد، خوا بوو، جا چونکە (يَعْقُوب) ئەوەندە بەهێز بوو خوا نەیتوانی بیخاتە سەر زەمین.

ئینجا تاکو جووەکان ئەم جۆرە درۆیانە بە موسوڵمانان بسەلمێنن، ڕوویان کردە (مُتَشابهاتُ القُرآن وَالحَديثْ) -کە واتەی لاشەو ئەندامیان لێئەفامێتەوە- کردونیان بە بەڵگەی خۆیان، کە ئەڵێن: خوا لاشەو ئەندامی هەیە، چونکە ئەگەر موسوڵمان ئەوەیان بۆ بسەلمێنن، ئەوەشیان بۆ ئەسەلمێنن: کە (خوا) لەگەڵ (يَعْقُوب)ی باوکی

وَمَنْ لَمْ يَتَوَقَّ النَّفْيَ وَالتَّشْبِيهَ زَلَّ وَلَمْ يُصِبِ التَّنْزِيهَ، فَإِنَّ رَبَّنَا جَلَّ وَعَلَا مَوْصُوفٌ بِصِفَاتِ الْوَحْدَانِيَّةِ، مَنْعُوتٌ بِنُعُوتِ الْفَرْدَانِيَّةِ لَيْسَ فِي مَعْنَاهُ أَحَدٌ مِنَ الْبَرِيَّةِ،

---

ئینجا بۆ خۆپاراستن لە (عَقیدَة)ی ئەم دوو چینە، ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ: (وَمَنْ لَمْ يَتَوَقَّ النَّفْيَ) هەرکەسێك خۆی لە (نَفی)کردنی سیفەتەکانی خوا نەپارێزێ، هەروەکو باوەڕی (جَهْمِیَّة)کان ولیەو ئەڵێن: خوا سیفەتی نیە (والتَّشْبِيه) وە هەر کەسێکیش خۆی لە (تَشْبِیه)کردنی خولو سیفەتەکانی نەپارێزێ، هەروەکو باوەڕی (مُشَبِّهَة)کان وابە (زَلَّ وَلَمْ يُصِبِ التَّنْزِيهَ) ئەو جۆرە کەسە خلیسك ئەباو لە ڕێگەی (أهل السّنّة والجَماعة) لائەداو ڕێگەی بە پاکناسینی خوا ناتۆزێتەوە (فَإِنَّ رَبَّنَا جَلَّ وَعَلاَ مَوْصُوفٌ بِصِفَاتِ الْوَحْدَانِيَّةِ) چونکە خوای گەورەوبەرز مەدحی ئەکرێ: بەو سیفەتانەی بێ هاوبەشن (مَنْعُوتٌ بِنُعُوتِ الْفَرْدَانِيَّةِ) خوای گەورە بەو کردارانە مەدحی ئەکرێ: کە بێهاوتانە (لَيْسَ فِي مَعْنَاهُ أَحَدٌ مِنَ الْبَرِيَّةِ) هیچ کەسێك لە زاتو سیفەتو کرداردا وەکو خوا نیە، کەواتە: ئەگەر کەسێك تەنها باوەڕی بە هەبوونی خوا هەبێ، بەلآم باوەڕی بە هەبوونی سیفەتەکانی خوا نەبێو باوەڕی بەبێ هاوێنەیی خوا-لە زاتو سیفەت نەبێ- ئەوە بە خولناس دلنانرێ، چونکە جوولەکەو دیانیش ئەم جۆرە خولناسینەیان هەیە، بەلآم سوودی نیە.

ئیمامی (النووی) لە قازی (عیاض) ئەگێڕێتەوەو ئەفەرموێ: ئەو جوولەکانە خوایان نەناسیوە: کە خوا وەشتێك ئەچوێنن، یان ئەڵێن: خوا لاشەی هەیە، یان ئەڵێن: خوا تازە شت ئەزانیو منداڵی هەیە، ئەو جۆرە گاورانەش خوایان نەناسیوە کە ئەڵێن: خوا ژنو منداڵی هەیە، یان ئەڵێن: دروستە خوا بچێتە ناو شتێکو بڕواتە شوێنێکو تێکەڵی شتێك ببێ، بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٢٥٥ ب١. ئینجا بزانە: ئەوەی گوتمان، گشتی لە ناو سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللّهُ أَحَدٌ﴾دا کۆکرلومتەوە هەر لەبەر ئەوەش پێی ئەگوترێ: (سُورَةَ الإِخْلَاص).

## ﴿ خوای گەورە سنورو لاشەو ئەندامی نیە ﴾

بزانە: لە قورئانی پیرۆزو لە حەدیسی پێغەمبەرداﷺ چەند ووشەیەك هەنە: دەربارەی خوای گەورە بەکار هاتون، ولتەی لاشەو ئەندامو شوێنیان لێتەفامێتەوە، جا لەبەر ئەوەی واتەی ڕاستەقینەی ئەم ووشانە بۆ خوا ناگونجێ، پێیان ئەگوترێ: (مُتَشَابِهَاتُ القُرآن والحدیث)، وە لەبەر ئەوەش کە بۆ خوا بەکار هاتون، پێیان ئەگوترێ: (آیاتُ الصِّفات) و (أحادیثُ الصِّفات). زانایانی (أهل السّنّة والجَماعة) دەربارەی ئەم ئایەتو حەدیسانە دوو بەشن:

---

ئەوان زۆرلنەی کردوەو تا بەیانی پێیەنەوەستاوە، بۆیێ پیرۆزی کردوە، کەولبوو: ئەوان گەلێکی هەلبژاردەو پیرۆزن، واتە: ئەگەر ئەڵێن: خوا لاشەو ئەندامو شوێنی هەیە، ئەم درۆیەیان بۆ سەر ناگرێ.

ئینجا لە ناو موسولمانانەدا چەند گرۆهێکی (أهل البدعة والضلالة) ئەم باوەڕە پووچەڵەیان بە دلفراوانی لە جووەکان وەرگرتو (مُتشابهات)یان کردە بەلگەی خۆیان، (إبن حجر العسقلانی) ئەفەرموێ: یەکەمجار لێکۆلینەوەی (مُتشابهاتُ القرآن) لە جووەکانەوە پەیدا بوو، ئینجا لەناو موسولمانانیش یەکەمجار لە چینی (خوارج) پەیدا بوو. (فتح الباري) ل٢٦٧ ب٨، کەوابو: واجبە موسولمان خۆی لەو باوەڕە بپارێزێ کە ئەڵێ: خوا لاشەو ئەندامو شوێنی هەیە. ڕوونکەرەوە.

**یەکەم:** چینی (سَلَف)و زانایانی (حَدیث)، واتـەی ئـەم ووشـانە (تَفویض) ئەکـەن، واتـە: ئەڵێن: باوەڕمان بەم ووشانە هەیەو مەبەستەکەشی ئەدەینە پاڵ زانستی خـوا، هـەر خـوا ئەزانێ: مەبەستی چی‌یە، لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕمان وایە: واتـەی ڕاستەقینە–ئاشـکرای– ئەم ووشانە دروست نیە بۆ خوا بەکار بێ، چونکە هیچ شتێك هاووێنەی خوا نیە.

**دووەم:** چینی (خَلَف) ئەڵێن: ئێمە (تَأویـل)یـان ئەکـەین‌و لـە واتەیـەکی وەهـادا بـەکاریان دێنین: کە لەگەڵ گەورەیی خوا بگونجێ. بڕوانـە (شـرح صـحیح مسـلم) ل۱۰۹و ۱۱۰ ب۲و (الإتْقان فی عُلوم القُرآن) ل٦ ب٢.

کەوابو: چینی (سَلَف)و (خَلَف)ی (أهل السّنَّة والجَماعة)[1] لە سەر ئـەوە ڕێککـەوتون: کـە دروست نیە واتەی ڕاستەقینەی ئـەم ووشـانە بـۆ خـوا بـەکار بـێ، بـەڵام لـە (تَفـویض)و (تَأویـل)دا جیـاوازن، (تحفـة المریـد) ل٤٩. واتـە: چـونکە (خَلَـف) سـیفەتێکی خـوا بـە سیفەتێکی‌تری خوا (تَأویل) ئەکەن.

(إبن کَثیر) لە تەفسیری ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾دا ئەفـەرموێ: لێرەدا ئێمـە ڕاڕەوی (السَّلَف الصَّالح) ئەگرینـە بـەر: وەکـو ئیمـام (مَالـك والأوزاعـی والثـوری واللیـث والشافعی وأحمد وإبن راهویْه)و چەندانی‌تریش لە ئیمامانی موسوڵمانان...کە ئەڵێن: ئێمە بەو ئایەتانەدا ئەڕۆین‌و بەو جـۆرەی هاتووە ئەیانخوێنینەوە، بە بێ‌چۆنیەتی‌و وێچواندن‌و

---

[1] (السلف) بە زانایانی ئـەو سێ سـەد سـاڵە ئـەگوترێ کە پێغەمبـەرﷺ شـاهیدی بـۆ داون، بڕوانـە باسـی (پێشینە باشەکان).

(الخلف) بە چینی دووەمی زانایانی (أهل السّنَّة والجَماعة) ئەگوترێ کە لـە سـاڵی سێ‌سـەدی کۆچی بـەم لایـەوەن‌و زانسـتی ئیسـلامیان لـە چینی (سَلَف) وەرگرتـوەو بـە ئێمـەیان ڕاگەیانـدوە، واتـە: چینی (سَلَف)و چینی (خَلَـف) هەردووکیان لە قوتابخانەی (أهل السّنَّة والجَماعة) پێکەیشتون‌و هـەردوو چین بـە بێ‌خیانـەت بـە گـوێرەی پێویسـتی سەردەمی خۆیان بەرگریان لە (عَقیدَة)ی ئیسلام کردوەو خزمەتی زانستی ئـایینی ئیسـلامیان کـردوە، ئەگـەر زانایـانی چینی (خَلَف) نەبوونە، زانستی ئیسلام بە پوختەکراوی نەئەگەیشتە دەست ئێمە، بـەڵێ: هەرچـەند چـینی (خَلَـف)یش میراتگری پێغەمبەرنﷺ، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەوان خۆیان بە قوتابی چینی (سَلَف) دائەنێن.

ئینجا بزانە: چونکە چینی (سَلَف) بێ‌دەنگییان لە (مُتَشابِهاتُ القُرآن والحَدیث) کردو (تَفویض)یـان کـرد–واتـە: لێیان نەکۆڵینەوەو، مەبەستیان دا پاڵ زانستی خواو، گوتیان: هەر خوا ئەزانێ: مەبەستی چی‌یە– (أهْل البِدْعَة والضَّلالَة) ئەم بێ‌دەنگی‌و (تَفویض)کردنی (سَلَف)یان بە هـەل زانـی بـۆ شـێواندن‌و پەرتـەوازەی موسـوڵمانان‌و هەڵسان بە لێکۆڵینەوەی (مُتَشـابِهاتُ القُرآن والحَدیث)، کردنیانـە بەڵگـەی خۆیـان کـە ئـەیانگوت: خـوا لاشـەو ئەندامو شوێنی هەیە، ئینجا چینی (خَلَف) بە ناچاری–بۆ لێدانی ئەم گومڕابوونە– هەڵسان بە (تَأویـل)کردنـی ئەم جۆرە ئایەتو حەدیسانە، بە شێوەیەکی وەها: لەگەڵ گەورەیی خوا بگونجێ‌و لە قورئان، یان لـە حـەدیس بەڵگەیەکیش لە سـەر ئـەم (تَأویـل)کردنـە هـەبێ، ئینجا کـە (أهْـل البِدْعَة والضَّلالَة) –بـە تایبـەتی (خَوارِج)و (مُجَسِّمَة)– زانییان (خَلَف) بە توندی لێیان ئـەدەن، دەسـتیان کـرد بـە بڵاوکردنـەوەی پاگەندەو تۆمـەت‌و درۆو دەلەسە لە دژی (خَلَف) تاکو لەکەداریان بکەن، بە شێوەیەکی وەها چینی (خَلَف) لە پێش چاوی موسـوڵمانان لەکەدارو ناشیرین ئەکەن: کە بە گومڕابوو تەماشای (خَلَف) بکەن‌و هیچ سوودێك لە بەرهەمی ئەوان وەرنـەگرن، سەیرە: تا خاوەن ماڵ دزی گرت، دز خاوەن ماڵی گرت!!! ڕوونکەرەوە.

وَتَعَالَىٰ عَنِ الْحُدُودِ وَالْغَايَاتِ وَالأَرْكَانِ وَالأَعْضَاءِ وَالأَدَوَاتِ،

لەکارخستن، ئەو واتە ئاشکرایەی دێتە بیری وێچوێنەرەکان، بۆ خوا بەکار نایەن، چونکە هیچ شتێك وەکو خوا نیە. (تفسیر إبن کثیر) ل٢٢٠ ب٢.

کەوابوو: لەم فەرموودەیە بۆمان دەرکەوت کە (السَّلف الصالح) بە هیچ جۆرێك واتەی ڕاستەقینەی ئەم وشانەیان بۆ خوا بەکار نەهێناوە، بەڵکو مەبەستەکە (تَفویض) ئەکەنە لای خوا، هەروەك ئیمامی (الشافعی) ئەفەرموێ: (وَالَّذِی نَخْتَارُ...أَنْ یُمَرَّ بِهَا کَمَا جَاءَتْ، وَلَا یُبْحَثَ عَنْهَا وَلَا یُتَکَلَّمَ فِیهَا) ڕای ئێمە وایە: بەو ئایەتانەدا بڕۆین، چۆن هاتوە بیانخوێنینەوەو لێیان نەکۆڵینەوەو گفتوگۆیان لێنەکەین. (الکوکب الأزهر شرح الفقه الأکبر للإمام الشافعی) ل٦٨.

ئینجا لە سەر ڕارەوی (سلَف)و (خلَف) ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَتَعَالَىٰ عَنِ الْحُدُودِ وَالْغَایَاتِ) خوای گەورە بەرزو پاکە لە سنوورو کۆتایی، چونکە سنووریش نیشانەی کۆتایی هاتنە، خوای گەورەش کۆتاییناییێ (وَالأَرْکَانِ) خوای گەورە پاکە لەوەی لە پارچە پارچە پێك هاتبێ (وَالأَعْضَاءِ) خوای گەورە پاکە، لەوەی ئەندامی لەشی هەبن (وَالأَدَوَاتِ) پاکە، لەوەی ئامێری کارکردنی هەبن، چونکە ئەو شتانە پێویستیان بە لاشەیەك هەیە پێیوە ڕابووەستن، خوای گەورەش لاشەی نیە، چونکە ئەگەر لاشەی هەبێ، پێویستی بە شوێنێکیش ئەبێ پێیوە ڕابوەستێ، گومانیش لەوەدا نیە: خوای گەورە پێویستی بە هیچ شتێك نیە، هەروەك ئەفەرموێ: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ البقرة:٢٦٧، بزانن: خوا دەوڵەمەندە پێویستی بە هیچ شتێك نیەو سوپاسی ئەکرێ، چونکە هەموو شتێك پێویستی بە خوا هەیە.

## ﴿ ڕوونکردنەوەی هەندێك لە (آیاتُ الصِّفات)و (أحادیثُ الصِّفات) ﴾

ئینجا، کە زانیت: (عَقیدَة)ی (أهل السُنّة والجَماعة) ئەوەیە: خوای گەورە لاشەو ئەندامو شوێنی نیە، ئێستاش چەند ئایەتو حەدیسێکی (الصِّفات) لە سەر ڕارەوی (أهل السنّة والجَماعة)–چینی (سلَف)و (خلَف)– ڕوون ئەکەینەوە:

١– سیفەتی (وَجْه)=ڕوو، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿کُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ﴾ القصص:٨٨، هەموو شتێك لەناو ئەچێ تەنها زاتی خوا نەبێ[10]. ﴿وَیَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ﴾ الرحمن:٢٧، زاتی خوای تۆ ئەمێنێ. پێغەمبەرﷺ لە دوعادا ئەیفەرموو:

[10]– بەم ئایەتە پیرۆزە (مُجَسِّمَة) دەمکوت کراون، چونکە ئەوان ئەڵێن: (تأویل) دروست نیە، مەبەستیش بە (وَجْه) ڕووی ڕاستەقینەیەو مەبەست بە (یَد)و (قَدَم) دەستو قاچی ڕاستەقینەیە، جا ئێمەی (أهل السنّة) پێیان ئەڵێن: باشە، ئەگەر مەبەست بەم وشانە ئەندامی ڕاستەقینە بن، ئەوە دیارە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿کُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ﴾ القصص:٨٨، هەموو شتێك لەناو ئەچێ تەنها ڕووی خوا لەناو ناچێ، واتە: بەو گوێرەی ئێوە ئەیڵێن، ئەبێ دەستو قاچی خواش لەناو بچن، چونکە ئەوانیش شتن، ئایەتەکە ئەیانگرێتەوە، ئینجا کە دەمکوت بوون، پێیان ئەڵێین: بسەلمێنن: کە مەبەست بە (وَجْه) ئەندام نیە، بەڵکو زاتی خوایە، واتە: تەنها زاتی خوا ئەمێنێ. ڕوونکەرەوە.

﴿أَعُوذُ بِوَجْهِكَ﴾ رواه البخاري، خوايه خۆم به زاتی تۆ ئەپارێزم. هەروەها: له حەدیسی دیتنی خوا له بەهەشتدا، ئەیفەرموو: ﴿مَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ إِلاَّ رِدَاءُ الْكِبْرِيَاءِ عَلَى وَجْهِهِ﴾ رواه البخاري ومسلم، له نێوان بەهەشتییەکانو تەماشا کردنی خوای خۆیان تەنها پەردەی (کِبْرِیاءْ) ماوە، واته: که لادرا خوا ئەبینن.

(سَلَف) لەم ئایەتو حەدیسانەدا، فەرموویانە: (وَجْه)=ڕوو، سیفەتێکی زاتی خوایەو چۆنیەتی نازانینو مەبەستیش: ئەندام–ڕووی ڕاستەقینە– نیە، کەوابوو: هەر خوا ئەزانێ: مەبەستی بەم (وَجْه)=ڕووە چییە.

له چینی (سَلَف) ئیمامی (إبن عبَّاس) ئەفەرموێ: (وجْه) هەر به خوا ئەگوترێ. (تفسیر القرطبي) ل١٦٥ ب١٧.

(خَلَف) وەکو (إبنْ عبَّاس) ئەفەرموون: مەبەست به (وَجْه) لەم ئایەتو حەدیسانەدا زاتی خوایه، چونکه ناگونجێ: ئەندام–ڕووی ڕاستەقینە– بێ، کەوابوو: چارە نیە: یان ئەبێ (تَفْویض) بکرێ، یان (تَأْوِیلْ).

ئیمامی (البیهقي) ئەفەرموێ: ووشەی (وَجْه)=ڕوو، له قورئانو له حەدیسدا زۆر جار گوتراوە: له هەندێ ئایەتو حەدیسدا سیفەتی زاتی خودایه–هەروەك باسمان کرد– له هەندێکی تردا به واتەی خاترانەیه: وەکو ﴿إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللهِ﴾الإنسان:٩، تەنها لەبەر خاتریخوا خواردنتان ئەدەینێ. له هەندێکی تردا به واتەی ڕازی بوون: وەکو ﴿يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾ الکهف:٢٨، ئەیانەوێ خوا لێیان ڕازی بێ. ﴿إِلاَّ ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الأَعْلَى﴾ الليل:٢٠، تەنها بۆ ڕازیبوونی خوا ئەم کارە ئەکا.

(جَلال الدین السیُوطي) ئەفەرموێ: مەبەست به ﴿فَثَمَّ وَجْهُ اللهِ﴾ البقرة:١١٥، ئەو لایەی خوا فەرمانی کردوە ڕووی تێ بکرێ لەوێیە. بڕوانە (فتح الباري) ل٤٧٩و ٥٣١ ب١٣و (الإتقان) ل٧ ب٢.

٢– سیفەتی (عَیْن)=چاو، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَاصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا﴾هود:٣٧، کەشتی دروست بکه به پاراستنی ئێمە. ﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَى عَيْنِي﴾ طه:٣٩، تاکو پەروەردە بکرێی به چاودێریو پاراستنی ئێمە. ﴿تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا﴾ القمر:١٤، کەشتییەکه به پاراستنی ئێمە ئەڕوا.

(سَلَف) ئەفەرموون: (عَیْن)=چاو، سیفەتێکی زاتیخوایەو چۆنیەتی نازانینو مەبەستیش ئەندام –چاوی ڕاستەقینە– نیە، کەوابوو: هەر خوا ئەزانێ مەبەستی بەم (عَیْن)=چاوە، چییە. (خَلَف) فەرموویانە: مەبەست (عَیْن)=چاو، سیفەتێکی زاتیخوایه: که (حفظ) پاراستنی خوایه، یان (رُؤْيَة) دیتنی خوایه. بڕوانە (فتح الباري) ل٤٨٠ ب١٣و(الإعتقاد) ل٩٠.

٣- سیفەتی (یَد)=دەست‌و (یَمین)=ڕاستە، هەندێ جار بە (مُفرَد) تاك هاتوە: وەکو ﴿وَأَنَّ الْفَضْلَ بِيَدِاللهِ﴾ الحديد:٢٩، چاکە بە دەست خودایە. ﴿يَدُ اللهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ﴾ الفتح:١٠، دەستی خوا لە سەرەوەی دەستی ئەوانە. ﴿وَالسَّموَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ﴾ الزمر:٦٧، ئاسمانەکان پێچراونەوە بە ڕاستەی خوا. پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿وَكِلْتَا يَدَيْهِ يَمِينٌ﴾ رواهُ مُسْلِم، هەردوو دەستەکانی خوا ڕاستەیە.

هەروەها بە(تَثْنِيَة) جووت هاتوە: وەکو ﴿مَا مَنَعَكَ أَنْ تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾ ص:٧٥، چی ئەتۆی قەدەغە کرد کە سوجدە بۆ ئەو (آدَم)ە ببەی: کە بە هەردوو دەستی خۆم دروستم کردوە؟. هەروەها: بە (جَمْع) کۆمەڵ هاتوە: وەکو ﴿مِمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا﴾يس:٧١، لەو شتانەی دەستەکانی ئێمە کردویەتی.

(سَلَف) ئەفەرموون: (یَد)=دەست‌و (یَمین)=ڕاستە، سیفەتی زاتی خوایەو چۆنیەتییان نازانین، مەبەستیش ئەندام-دەستی ڕاستەقینە- نیە، کەوابوو: هەر خوا ئەزانی مەبەستی بەم (یَد)و (یَدَیَّ)و (أَیْدینا)و (یَمین) چی‌یە؟.

بۆ نموونە: ئیمام (أبو حنيفة‌رحمه‌الله) لە (الفقه الأكبر)دا دەفەرمووێ: (وَلَهُ يَدٌ وَوَجْهٌ وَنَفْسٌ كَمَا ذَكَرَهُ اللهُ تَعالَى فِي الْقُرْآنِ، فَمَا ذَكَرَهُ اللهُ فِي الْقُرْآنِ مِنَ الْوَجْهِ وَالْيَدِ وَالنَّفْسِ فَهُوَ لَهُ صِفاتٌ بِلاَ كَيْفٍ، وَلاَ يُقالُ: إِنَّ يَدَهُ قُدْرَتُهُ أَوْ نِعْمَتُهُ لأَنَّ فِيهِ إِبْطالَ الصِّفَةِ وَهُوَ قَوْلُ أَهْلِ الْقَدَرِ وَالإِعْتِزالِ، وَلَكِنْ يَدُهُ صِفَتُهُ بِلاَ كَيْفٍ)، واتە: خوای گەورە سیفەتی دەست‌و ڕوو و نەفسی هەیە، هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی، کەوابوو: ئەو دەست‌و ڕوو و نەفسەی لە قورئاندا بۆ خوای گەورە گوتراون، ئەوانە سیفەتی خوای گەورەنەو چۆنیەتییان نازاندرێ، بەڵام نابێ بگوترێ: دەستی خودا قودرەتی خودایە، یان نیعمەتی خودایە، چونکە لەکارخستنی سیفەتی تێدایە، لەکارخستنیش گوتەی (قَدَریە)و (مُعْتَزِلَة)یە، بەڵکو دەستی خودا سیفەتی خودایە بە بێ‌چۆنیەتی. بڕوانە (الشرح الميسر للفقه الأكبر لإمام أبي حنيفة‌رحمه‌الله) ل٤٢.

(خَلَف) ئەفەرموون: مەبەست بە (یَد)و (یَدَیَّ)و (أَیْدینا)و (یَمین) لە ئایەت‌و حەدیسەکاندا سیفەتێکی خوایە: کە (مُلْك) دەستەڵات، یان (قُدْرَة) توانین، یان (عَهْد) پەیمانی خوایە، بەگوێرەی پەیوەندی ووشەکان بەباسەکەوە، بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٢٤٦، ٢٤٩ ب١٠و (فتح الباري) ل٤٥٥و ٤٨٥و ٤٨٨و ٤٨٩ ب١٣.

بۆ بەڵگەی (تَأْويل) دەڵێین: خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِمَنْ فِي أَيْدِيكُمْ مِنْ الأَسْرَى﴾الأنفال:٧٠، واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ بەو دیلانە بڵێ کە لەناو دەستی ئێوەدانە، واتە: لە ژێر دەستەڵات‌و توانینی ئێوەدانە.

٤- سیفەتی (ساق)=لولە قاچ=نێوان ئەژنۆو گوزینگ- خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ﴾ القلم:٤٢، لەو ڕۆژەی لولە قاچ وەردەرئێخرێ. پێغەمبەرﷺ لە حەدیسە درێژەکەی (مَحْشَر) ئەفەرموێ: ﴿فَيَكْشِفُ عَنْ سَاقِهِ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، خوای گەورە لولە قاچی بەدەر دێخێ.
ئیمامی (النواوي)و (إبن حجر العَسْقَلاني) بە (سَنَد)ی (البَيْهَقي) لە (إبن عبّاس) ئەگێڕێتەوە: کە مەبەست ئاشکرابوونی تەنگانەی قیامەتە، واتە: (سَاق) بەو (قُدْرَة)ی خوا ئەگوترێ کە ئەم تەنگانەی پێ ئاشکرا ئەکا. (أبومُوسَى‌الأشْعَري) ئەفەرموێ: مەبەست ئاشکرابوونی نورێکی گەورەیە. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل١٢٠ ب٢و (فتح الباري) ل٥٢٦ ب١٣.
ئینجا بزانە: چینی (خَلَف)ش بە (تَأويل)کردنی ئەم دوو (صَحابَة)بەڕێزانە ڕازینە، چونکە (صَحابَة)کان سەرقافڵەی (السَّلَف الصَّالح)ن.
بەڵگەی (إبن عبَّاس): ئایەتی ﴿يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ﴾عبس:٣٤-٣٥، واتە: لە ڕۆژی قیامەت مرۆڤ ڕادەکا: لە برای خۆیو لە دایکیو باوکیو...هتد.
هەروەها بەڵگەی (أبيموسَى): ئایەتی ﴿وَأَشْرَقَتِ الأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا﴾ الزمر:٦٩، زەمینی مەحشەر بە نوری خوای‌خۆی ڕوناك دەبێ.
٥- سیفەتی (قَدَم)=قاچ، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿لاَ تَزَالُ جَهَنَّمُ تَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ؟ حَتَّى يَضَعَ فِيهَا رَبُّ الْعِزَّةِ تبارك وتعالى قَدَمَهُ، فَتَقُولُ: قَطْ قَطْ وَعِزَّتِكَ، وَيُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ﴾ رواهُ البُخاري ومُسْلِم، دۆزەخ بەردەوام ئەڵێ: ئەفەری زیاتر هەیە بۆم بێنن؟ تا خوای گەورە قاچی خۆی لەناو دائەنێ، ئینجا دۆزەخ ئەڵێ: بەسە بەسە، بە گەورەیی تۆ، ئینجا دێتەوە پاڵ یەکتر.
(سَلَف) ئەفەرموون: (قَدَم)=قاچ، سیفەتێکی زاتی‌خوایەو چۆنیەتی نازانین، مەبەستیش ئەندام، واتە: قاچی ڕاستەقینە نیە، کەوابوو: هەر خوا ئەزانێ مەبەستی بەم قاچە چیە.
(خَلَف) ئەفەرموون: مەبەست بە (قَدَم)=قاچ، ئەو چینە خەڵکەیە: کە بۆ دۆزەخ ئامادە کراون، واتە: کە ئەوان خرانە ناو دۆزەخ، دۆزەخ ئەڵێ: بەسە بەسە، یان مەبەست زەلیلکردنی دۆزەخە، هەروەك ئەڵێن: ئەیخەمە ژێر قاچم، چونکە لە ڕیوایەتێکی حەدیسەکەدا هاتوە: ﴿فَيَضَعُ الرَّبُّ عَلَيْهَا قَدَمَهُ﴾ خوا قاچی خۆی لە سەر دۆزەخ دائەنێ، بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٣٠٠ ب١٠و (فتح الباري) ل٧٦٦ ب٨.
هەروەها لە ووتارەکەی (حَجَّةُ الوَدَاع)دا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿أَلاَ كُلُّ شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ تَحْتَ قَدَمَيَّ مَوْضُوعٌ﴾ رواهُ مُسْلِم، ئاگاداربن: هەر ڕەفتارێکی سەردەمی (جاهِلِيَّة)ی پێش ئیسلام هەیە، گشتی خراوەتە ژێر قاچەکانم، واتە: زەلیلو بێ‌نرخە.

٦- سیفەتی (إصْبُع)=پەنجە، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إنَّ قُلُوبَ بَنِي آدَمَ بَيْنَ إصْبَعَيْنِ مِنْ أصابِعِ الرَّحْمَنِ كَقَلْبٍ واحِدٍ يَصْرِفُهُ حَيْثُ يَشاءُ﴾ رواهُ مُسْلِم، دڵی ئادەمیزادان لە نێوان دوو پەنجەی خوادایە وەکو یەك دڵ، چۆنی حەز بکاو بیەوێ ئەیگۆڕێ. هەروەها لە چەند حەدیسێکیتردا ووشەی (إصْبُع) پەنجە هاتووە.

(سَلَف) ئەفەرموون: (إصْبُع)=پەنجە، سیفەتێکی زاتی خوایەو چۆنیەتی نازانین، مەبەستیش ئەندام، واتە: پەنجەی ڕاستەقینە نیە، کەوابوو: هەر خوا ئەزانێ مەبەستی بەم پەنجانە چیە. (خَلَف) ئەفەرموون: مەبەست دوو سیفەتی زاتی خودایە: کە (قُدْرَة)و (إرادة)یە، واتە: بە ویستن‌و توانینی خۆی دڵی ئەم خەڵکە ئەگۆڕێ. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٨٤ ب١٠و(فتح الباري) ل٤٩٠ ب١٣و(تحفة المريد) ل٥٠.

ئینجا بزانە: جگە لە وانەش چەند ئایەت‌و حەدیسێکیتری (مُتَشابِه) هەنە، ئەم جۆرە سیفەتانەی خوایان تێدا باس کراوە. (إبن حَجر العَسْقَلاني) لە ئیمام (إبن عَبْدُ البَرّ) ئەگێڕێتەوەو ئەفەرموێ: (أهل السُنَّة) یەکدەنگن: کە باوەڕیان بە هەبوونی ئەو سیفەتانە هەیە، کە لە قورئان‌و حەدیسدا هاتون، (كَيْفِيَّة)-واتە: چۆنیەتیشیان- بۆ دانانێین، بەلام (جَهْمِيَّة)و (مُعْتَزِلَة)و (خَوارِج)-دانیان پێدا نانێن‌و- ئەڵێن: هەرکەسێکیش دانیان پێدا بهێنێ، ئەبێتە (مُشَبِّه). بەلام (أهل السُنَّة) ئەم سێ گرۆهە گومڕابووە، بە (مُعَطِّلَة) ناو ئەبەن. (فتح الباري) ل٥٠١ ب١٣.

﴿ئاگاداری﴾: (مُجَسِّمَة)-کە چینێکی (أهْل البِدْعَة وَالضَّلالَة)ن- ئەڵێن: مەبەست بەم ووشانەی لەم ئایەت‌و حەدیسانەدا هاتون: ئەندامی ڕاستەقینەن بە شێوەیەکی وەها: شایانی خوا بێ‌و لە خوا بوەشێتەوە، کەواتە: مەبەست بە (يَد)و (عَيْن)و (وَجْه)و (أصْبُع)و (قَدَم)و...هتد: دەست‌و چاو و ڕوو و پەنجەو قاچێکی وەهایە: شایانی خوابێ‌و لە خوا بوەشێتەوە. کەوابوو: (مُجَسِّمَة) ئەو ئایەت‌و حەدیسانە (تَفْويض) ناکەن، واتە: زانینی مەبەست نادەنە پاڵ زانستی خوا، چونکە ئەڵێن: مەبەست ئەندامی ڕاستەقینەیە. هەروەها (تَكْيِيف)ش ئەکەن، واتە: چۆنیەتیان بۆ دائەنێن‌و ئەڵێن: دەستێکی وەها کە لە خوا بوەشێتەوەو شایانی خوا بێ...هتد، جا (مُجَسِّمَة) بە بۆچوونی خۆیان بۆیێ ئەڵێن: لە خوا بوەشێتەوەو شایانی خوابێ، تاکو لە (تَشْبيه)و وێچواندن ڕزگار ببن‌و نەبنە (مُشَبِّهَة)، بەلام لەوە بێهەواڵن: کە دەستی منداڵ لە خۆی ئەوەشێتەوەو دەستی پیاویش لە خۆی ئەوەشێتەوەو دەستی هەردووکیان شایانی خۆیانن!!!.

ئینجا بزانە: (مُجَسِّمَة) هەروەك دژی (سَلَف)ن-چونکە باوەڕیان بە (تَفْويض) نیەو (تَكْيِيف)ش ئەکەن- ئەوەهاش دژی (خَلَف)ن‌و هیچ لەم ئایەت‌و حەدیسانە (تَأْوِيلْ) ناکەن،

بڕوانە (تحفة المريد) ل٤٩. جا مەبەستیان بەم دڕایەتی‌یە ئەوەیە: (عَقيدَة) پووچەڵەكەی خۆیان بە سەر موسوڵمانانندا بسەپێنن.

دووبارە ئاگادار بە: ئێستا (مُجَسِّمَة) لە وڵاتانی ئیسلامدا زۆرن‌و هەوڵ ئەدەن بە ناوی (أهـل السَّنَّة والجَماعـة)و لـە ژێـر دروشمـی (القُـرآن وَالسُّـنَّة) ئـەم بـاوەڕە پوچـەڵە بـڵاو ئەكەنـەوە، بـەڵام تكـات لێئەكـەم: زۆر چـاالاكو وریابـە: بـەم دروشمـە فێڵـت لێئەكـەن‌و سەرچاوەی زانستت لێقەدەغە نەكەن!، جـا ئەگـەر لـەم ڕوونكردنەوەیـە گومانـت هـەبوو تكات لێئەكەم: بڕوانە ئەو سەرچاوانەی بۆم دیاری كردوی.

## ﴿خوای گەورە پێویستی بە هیچ شوێنێك نیە﴾

بزانە: بڕیاری (أهل السَّنَّة والجَماعة) لە سەر ئەوەیە: كە خوای گەورە (جِسْم) لاشـە نیـەو پێویستی بە هیچ شوێنێك نیە كە تێیدا جێگیر بێ، چونكە: كـە خـوا لـە (أزَل)دا هـەبو و هیچ شوێنێكی نەبو. (فتح الباري) ل٥١٢ ب١٣.

جا لە سەر ئەم بڕیارە ئیمامی (الطَحاوي) ئەفەرموێ:

(لاَ تَحْوِيهِ الْجِهَاتُ السِّتُّ) شەش لایەكان خوای گـەورە، وەنـاوەخۆ نـاگرن، واتـە: لـە هـیچ لایەك لەو شەش لایانە نیشتەجێ نیە (كَسَائِرِ الْمُبْتَدَعَاتِ) وەكو شتە دروستكراوەكان.

ئەمەش ناوی شەش لایەكانە، كە پێغەمبەرﷺ لە دوعادا ئەیفـەرموو: ﴿اَللَّهُمَّ احْفَظْنِـي مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ، وَمِنْ خَلْفِي، وَعَنْ يَمِينِي، وَعَنْ شِمَالِي، وَمِنْ فَوْقِي، وَأَعُوذُ بِعَظَمَتِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي﴾ رواهُ أبوداود بسند صحيح، خوایـە بمپـارێزە: لـە لای (پێشـەوەم)، لـە لای (پشتەوەم)، لە لای (ڕاستەم)، لەلای (چەپەم)، لە لای (سـەرەوەم)، بـە گـەورەیی‌تۆ خۆم ئەپارێزم نەوەكو لە لای (خوارەوەم) بە فێڵ بكوژرێم.

(عزيزي) ئەگێڕێتەوە: پیاوێك پرسیاری لە ئیمامی (علي) كردو گـوتی: (يَا أَمِيرَ الْمُـؤْمِنِينَ أَيْنَ اللهُ؟ قَالَ: أَيْنَ سُؤَالٌ عَنْ مَكَانٍ، وَكَانَ اللهُ وَلاَ مَكَانَ). (السِّراج المُنير) ل١٧٠ ب٢، ئەی فەرمانڕەوای ئیمانداران خوا لە كوێیە؟ فەرمووی: لە كوێیە؟ پرسیارێكە بۆ شـوێن بەكاردێ، كە خودا لە (أزَل)دا هەبو، هیچ شوێنی نەبو. واتە: لـە (أزَل)دا تـەنها هـەر خـوا هەبو، هیچ شوێنێكیشی لـەو شـەش شـوێنانە نـەبو، ئینجـا كـە ئـەو شـەش شوێنانەشـی دروست كردن، لە سەر سیفەتەكەی (أزَل)ی هـەر بەردەوامـەو پێویسـتی بـە شـوێن نیـە، چونكە نابێ خوای گەورە لەحاڵەتێك بگۆڕێ بۆ حاڵەتێكی‌تر، بڕوانە (الكَوْكَب الأزْهَر شَرح الفقه الأكبَر للإمام الشّافعي) ل٦٧.

هەروەها پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿كَانَ اللهُ وَلَمْ يَكُنْ شَيْءٌ غَيْرُهُ﴾ رواهُ البخـاري، خـوا لە (أزَل)دا هەبو، جگە لەوی هیچ شتێكی‌تر نەبو.

ئینجا بزانە: (مُجَسِّمَة)و (مُشَبِّهَة) ئەڵێن: خوا لە سەر (عَرْش) جێگیرە، واتە: جێگەی لەوێیە، هەروەك لە باسی (عَرْش) پوچەڵی ئەکەینەوە، إن شاء الله تعالى. هەروەها (جَهْمِيَّة) ئەڵێن: خوا بە زاتی خۆی لە هەموو شوێنێکەو ئەڵێن: بەڵگەمان ئەم ئایەتەیە ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَمَا كُنتُمْ﴾ الحديد:٤، خوای گەورە لەگەڵ ئێوەیە لە هەر کوێ بن. هەروەها چەند ئایەتو حەدیسێکیتری لەم بابەتە: کە لە ژمارە ٦ی بەڵگەکانی (جَهْمِيَّة)دا باسیان ئەکەین[11].

ئینجا بزانە: مەبەستی (جَهْمِيَّة) ئەوەیە: خوا لە سەر (عَرْش)و لە ئاسمانەو لە زەمینە، بەڵکو بەڵگەکانیان وا ئەگەیەنن: ئەگەر بەندە لە ناو دۆزەخ دا بێ، یان لە ناو ورگی درندەدا بێ، یان لە ناو شتێکیتر دابێ، خوای گەورەش لەو شوێنان دا بێ، ئینجا ناچار (أهل السنّة) ئەم ئایەتو حەدیسانەیان (تَأْوِيلْ) کردوەو ئەڵێن: خوا لەگەڵتان دایە بە (علم)ی خۆی، نەك بە زاتی خۆی، بڕوانە (فتح الباري) ل٤٧٦ ب١٣و (الإعتقاد) ل١١٥.

کەواتە: خوای گەورە پێویستی بە هیچ شوێنێك نیەو لە هیچ شوێنێك نیشتەجێ نیە، هەروەك لەباسی (عَرْش) بە درێژی ڕوونی ئەکەینەوە، إنْ شاءَ اللهُ تَعالَى.

## ﴿ باسی شەو ڕۆیی و سەرکەوتنی پێغەمبەرﷺ بۆ ئاسمان (الإسْراءُ وَالْمِعْراجُ) ﴾

(**الإسْراء**): شەوڕۆیی‌کردنی پێغەمبەرە ﷺ لە (مَكّة)ی پیرۆزەوە بۆ (المَسْجِدُالأقصَى) لە (فَلَسْطِين) لە یەك شەودا.

(**المِعْراج**): سەرکەوتنی پێغەمبەرە ﷺ لە (المَسْجِدُالأقصَى)وە بۆ سەرەوەی حەوت ئاسمانەکان لە هەمان شەودا، ئەم ڕووداوە گرنگە لە (٢٧)ی مانگی (رَجَب) بوو، بە ساڵێكو دوو مانگ پێش کۆچکردن. بڕوانە (نَثْرُ اللآلي) ل١٠٧.

ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(وَالْمِعْرَاجُ حَقٌّ) ڕووداوی (مِعْراج) ڕاستە، (بُخاری)و (مُسْلِم) گێڕاویەتیانەوە (وَقَدْ أُسْرِيَ بِالنَّبِيِّ ﷺ) شەوڕۆیی بە پێغەمبەرﷺ کرا، بە سواری (بوڕاق) لە (مَكّة)ی پیرۆزەوە بۆ

[11] لێرەدا (جهمِيّة)و (مُجَسِّمَة) ئەبێتە کێشەیان، (جهمِيّة) ئەڵێ: خوا لە هەموو شوێنێکە، واتە: لەسەر (عَرْش)و لە ئاسمانەو لە زەمینەو لە دەریایەو...هتد، چونکە خوایگەورە ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَمَا كُنتُمْ﴾ الحديد:٤، خوایگەورە لەگەڵ ئێوەیە لە هەر شوێنێك بن. (مُجَسِّمَة) ئەڵێ: نا، نا، وا نیە، ئەبێ ئەم ئایەتە (تَأْوِيلْ) بکرێو بڵێین: خوایگەورە بە (علم)ی خۆی لەگەڵ ئێوەیە، چونکە خوا لە سەر (عَرْش) جێگیرە، هەروەك ئەفەرموێ: ﴿الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ﴾ خوا لە سەر عەرش جێگیر بووە. (جهمِيّة) وەڵام ئەدەنەوەو ئەڵێ: بۆچی ئەم ئایەتە (تَأْوِيلْ) ناکرێ، بەڵام ئایەتەکەیتر (تَأْوِيلْ) ئەکرێ؟ جیاوازی چییە، ئەدی هەردووکیان ئایەتی قورئان نین؟ خۆ ئێوەی (مُجَسِّمَة) دژی (تَأْوِيلْ)کردنن، جا ئەگەر ئێوە بەڵگەی من (تَأْوِيلْ) بکەن، منیش بەڵگەی ئێوە (تَأْوِيلْ) ئەکەمو ئەڵێم: (أمر)ی خوا لە سەر (عَرْش) جێگیر بوو، نەك زاتی خوا. ئینجا ئێمەی (أهل السنّة) پێیان ئەڵێین: وا دیارە لە کاتی تەنگانەدا هەردوولاتان پشت بە (تَأْوِيلْ)کردن ئەبەستنو ڕاست ئەکەن: کە بەڵگەی یەکتری (تَأْوِيلْ) ئەکەن، چونکە خوا لە هیچ شوێنێك نیە، نە لە سەر (عَرْش)و نە لە ئاسمانو نە لە زەمین، چونکە خوا لە (أزل)دا هەبو و ئەم شوێنانە هیچیان نەبونو خوا دروستی کردن!!! ڕوونکەرەوە.

وَعُرِجَ بِشَخْصِه فِي الْيَقَظَة إِلَى السَّمَاء، ثُمَّ إِلَى حَيْثُ شَاءَ اللهُ مِنَ الْعُلا وَأَكْرَمَهُ اللهُ بِمَا شَاء، وَأَوْحَى إِلَيْه مَا أَوْحَى (مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى) فَصَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ فِي الآخرَة وَالأُولَى. وَالْحَوْضُ الَّذِي أَكْرَمَهُ اللهُ تَعَالَى بِه غِيَاثاً لأُمَّتِه حَقٌّ.

---

(الْمَسْجِدُالأَقْصَى) له (فَلَسْطِين) ئينجا لەوێ ئیمامەتی بۆ پێغەمبەران کرد-عليهم الصلاة والسلام-
خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِه لَيْلاً مِنْ الْمَسْجِدِالْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِالأَقْصَى﴾الإسراء:١، پاکو بێعەیبی بۆ ئەو خوایەی شەوڕۆیی بە بەندەی خۆی -(مُحَمَّد)ﷺ- کرد لە (الْمَسْجِدُالحَرام)ەوە بۆ (الْمَسْجِدُالأَقْصَى) لە بەشێکی شەودا.
(وَعُرِجَ بِشَخْصِه فِي الْيَقَظَة إِلَى السَّمَاء) ئینجا لە (الْمَسْجِدُالأَقْصَى)وە پێغەمبەرﷺ بە لاشەی پیرۆزییەوە-لە کاتی هەشیاریدا- بەرز کراوە بۆ ئاسمانەکان، واتە: ئەم ڕووداوەی (الإِسْرَاء وَالْمِعْرَاجْ) بە لاشەو گیانی پێغەمبەرﷺ بوو و خەون نەبو و تەنها بە گیانیش نەبو، ئینجا لە ئاسمانی حەوتەم (الْبَيْتُ الْمَعْمُور)ی دیت، ئینجا بۆ (سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى) بەرز کراوە (ثُمَّ إِلَى حَيْثُ شَاءَ اللهُ مِنَ الْعُلاَ) ئینجا لەوێشەوە بۆ ئەو شوێنە بەرزو بەرێزانەی خوا حەزی کرد-کە ئێمە نایانزانین- ئینجا بە خزمەت خوا شاد بوو و بە هەردوو چاوی خۆی خوای دیت، هەروەك لەباسی (دیتنی خوا)دا ڕوونمان کردەوە.
(وَأَكْرَمَهُ اللهُ بِمَا شَاءَ) خوای گەورە ڕێزی لە پێغەمبەرﷺ گرت: بەو شێوەی خوا حەزی کردو سێ خەلاتی پێشکەش بە پێغەمبەرﷺ کردن:
١- پێنج نوێژ لە سەر خۆیو ئوممەتی واجب کردن.
٢- ئایەتی ﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْه مِنْ رَبِّه...﴾ تا کۆتایی (البَقَرَة)ی پێشکەش کرد.
٣- بڕیاریدا-جگە لە کافربوون- لە هەموو گوناهەکانی ئوممەتی خۆش ببێ. بڕوانە (صحيح مسلم).
﴿وَأَوْحَى إِلَيْه مَا أَوْحَى﴾ خوای گەورە لەو شەوەدا وەحیێکی وای بۆ پێغەمبەرﷺ نارد، کە نازانین: چی بوو؟ ﴿مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى﴾ دڵی پێغەمبەرﷺ درۆی لەگەڵ چاوی نەکردوە: لەوەی لەو شەوەدا دیتویەتی، واتە: دڵیشی باوەڕی بە چاوەکانی کرد: کە بە چاوی خۆی خوای گەورەو بەهەشتو دۆزەخو (جُبْرائِل)ی لە شێوەی فریشتەییدا دیتوە (فَصَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ) درودی خوای لە سەر بێ (فِي الآخرَة وَالأُولَى) لە دونیاو لە قیامەت.

## ﴿باسی حەوزو ڕووباری کەوسەر (الكَوْثَر)﴾

ئیمامی (الطَّحاوي) ئەفەرموێ:
(وَالْحَوْضُ الَّذِي أَكْرَمَهُ اللهُ تَعَالَى بِه غِيَاثاً لأُمَّتِه حَقٌّ) حەوزی پێغەمبەرﷺ ڕاستە، کە بەم حەوزە خوا ڕێزی لە پێغەمبەرﷺ ناوەو فریای تینوبووانی ئوممەتی ئەکەوێ لە گۆڕەپانی (مَحْشَر). ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بن عَمْرٍو رضي الله عنهما: قَالَ النَّبِيُّﷺ: حَوْضِي مَسِيرَةُ

شَهْرٍ، وَزَوَايَاهُ سَوَاءٌ، وَمَاؤُهُ أَبْيَضُ مِنَ الْوَرِقِ، وَرِيحُهُ أَطْيَبُ مِنَ الْمِسْكِ، وَكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السَّمَاءِ، فَمَنْ شَرِبَ مِنْهُ فَلاَ يَظْمَأُ بَعْدَهُ أَبَدًا﴾ رواه البخاري ومسلم واللفظ له، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: حەوزەکەی من بە ئەندازەی مانگە رێیەك گەورەیە، درێژی و پانی یەکسانە، ئاوەکەی لە زیو سپی‌ترە، بۆنەکەی لە میسك خۆشترە، گۆزەی ئاو پێخواردنەوەی بەقەد ئەستێرەکانی ئاسمانە، هەرکەسێك جارێك لێی بخواتەوە هەتا هەتایە تینو نابێتەوە.

ئینجا بزانە: فەرموودەی بەهێزی زانایان ئەمەیە: کەئەم حەوزە لە گۆڕەپانی (مَحْشَر)ە پێش تێپەڕبوون لە پردی دۆزەخ-(الصِّراط)، هەروەها ئاوی ئەم حەوزە لە ڕووباری کەوسەرەوە دێ‌و لە دوو سولکەوە ئەڕژێتە ناوی، بڕوانە (فتح الباري) ل٥٦٩و٥٧٠ ب١١ و(تحفة المريد) ل١٠٠.

﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أُنْزِلَتْ عَلَيَّ آنِفًا سُورَةٌ فَقَرَأَ: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ) حَتَّى خَتَمَهَا، فَلَمَّا قَرَأَهَا، قَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا الْكَوْثَرُ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فَإِنَّهُ نَهْرٌ وَعَدَنِيهِ رَبِّي عز وجل فِي الْجَنَّةِ وَعَلَيْهِ خَيْرٌ كَثِيرٌ، عَلَيْهِ حَوْضٌ تَرِدُ عَلَيْهِ أُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، آنِيَتُهُ عَدَدُ الْكَوَاكِبِ﴾ رواهُ مُسْلِم وأبوداود واللفظ له، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر ئێستا سورەتێکی قورئانم بۆ هاتە خوارەوە، ئینجا خوێندیەوە: ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ: إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ﴾ تا تەواوی کرد،-واتە: ئێمە کەوسەرمان بە تۆ بەخشیوە- ئینجا فەرمووی: ئەزانن (الكَوْثَر) چی‌یە؟ گوتیان: خواو پێغەمبەر ئەزانن، فەرمووی: کەوسەر ڕووبارێکە لە بەهەشت، خوای گەورە وەعدەی پێ داوم بمداتێ، زۆر بە پیتە، حەوزێکی لەسەرە-واتە: ئەڕژێتە ناو حەوزێك- ئوممەتی من دێتە سەر ئەو حەوزە ئاو ئەخواتەوە، جامەی ئاوخواردنەوەی بە قەد ئەستێرەکانە.

ئینجا بزانە: ئەم جۆرە کەسانە ڕێگەیان نادرێتێ بچنە سەر حەوزی کەوسەرو ئاویشی لێناخۆنەوە: هەرکەسێك کافر بوبێتەوە، یان (بِدْعَة)یەکی (قَبِيحَة)ی پەیدا کردبێ، یان لە کۆمەڵی موسوڵمانان جیا بوبێتەوەو چوبێتە سەر ڕای (أَهْل البِدْعَة وَالضَّلاَلَة)، یان یارمەتی ستەمکاران بدا، یان بە خۆی ستەمکار بێ‌و بە شەریعەتی ئیسلام ڕەفتاری نەکا. (تحفة المريد) ل١٠١. حەدیسی (صَحِيح)ی جۆراو جۆر لەم بابەتانە هەیە، بەڵام ئەم حەدیسە گشتیان ئەگرێتەوە: ﴿عَنْ سَهْلٍ وَأَبِي سَعِيد رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ، مَنْ مَرَّ عَلَيَّ شَرِبَ وَمَنْ شَرِبَ لَمْ يَظْمَأْ أَبَدًا، لَيَرِدَنَّ عَلَيَّ أَقْوَامٌ أَعْرِفُهُمْ وَيَعْرِفُونَنِي، ثُمَّ يُحَالُ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ فَأَقُولُ: إِنَّهُمْ مِنِّي، فَيُقَالُ: إِنَّكَ لاَتَدْرِي

مَاأَحْدَثُوا بَعْدَكَ، فَأَقُولُ: سُحْقًا سُحْقًا لِمَـــنْ غَيَّـــرَ بَعْـــدِي﴾ بروانـه البخـارى ومسـلم، پێغەمبەرﷺ ئەفـەرموێ: مـن پێشـرەوی ئێوەمـە بـۆ سـەر حەوزیکەوسـەر، هەرکەسـێك بەلایمندا بڕوا ئاوی لێئەخواتەوە، هەرکەسێك ئاوی لێبخواتەوە تێنـوو نابێتـەوە، هەنـدێ کەس ئەیانەوێ بێنە لام، من ئەیانناسم، ئەوانیش من ئەناسـن، ئینجا ئێیـان هەڵئـەدرێو ڕێگەیان نادرێ بێنە لام، منیش ئەڵێم: ئەوانە لە ئوممەتی منن، ئەڵێن: تۆ نازانی لـە دوای تۆ چیان کردوە، منـیش ئـەڵێم: دووریـان خـەن دووریـان خـەن ئـەو کەسـانەی گۆڕانیـان هێناوەتە سەر ئیسلام لە دوای من.

## ﴿باسی (شَفَاعَة) تکاکردن لە خوا لە ڕۆژی قیامەت﴾

بزانە: تکاکردن لە ڕۆژی قیامەت پێنج بەشە:

١- تکاکردن لە خوای گەورە -لە مەیدانی(مَحْشَر)- تاکو دادگای خەڵك دەست پێ بکا.

٢- تکاکردن لە خـوای گـەورە بـۆ ئـەو تاوانبارانـەی بڕیـاری دۆزەخیـان بـۆ دراوە: تـاکو نەیانبەنە دۆزەخ.

٣- تکاکردن لە خوای گەورە بۆ چینە موسوڵمانێك: تاکو بە بێداد کردن بچنە بەهەشت.

٤- تکاکردن لە خوای گەورە بۆ زێدەکردنی پلەی هەندێ کەس لە بەهەشت.

٥- تکاکردن لە خوای گەورە بۆ ئازادکردنی تاوانبارانی موسوڵمان لە دۆزەخ.

ئینجا بزانە: (أهل السنَّة) چینی (سَلَف)و (خَلَف) لـە سـەر هـەموو بەشـەکانی (شَفاعَة) یەکـدەنگن، بـەلام (خَـوارج)[١٢] و(مُعْتَزِلَـة)-کـە دوو گرۆهــی (أهْـل البِدْعَـة)نـە- دان بەشەفاعەتکردن بۆ تاوانبار ناهێننو ئەڵێن: هـیچ کەسـێك بـە شـەفاعەتی هـیچ کـەس لـە دۆزەخ ڕزگاری نابێ، جا بەڵگەی ئەوان بە حەدیسی (صَحِیح) پووچەڵ کراوەتەوە، (شرح صحیح مسلم) ل١٢٩ ب٢و (فتح الباري) ل٥٢٠و ٥٢٢ ب١١.

(١٢)-(خَـوارج) گرۆهێکـی پەرتەوازەچـیو زیانبەخشـی (أهْـل البِدْعَـة وَالضَّـلالَة)ن لـە سـەردەمی (خِلافَـة)ی ئیمامی(علی)ﷺ پەیدا بوون، بنچینەیان ئەگەڕێتەوە سەر پیاوێکی بێئەدەبو بێحورمەت، کە لـە سـەردەمی پێغەمبەرﷺدابوو، پێی ئەگوترا: (ذُوالخُوَیْصِرَة)، پێغەمبـەرﷺ شتێکی بـەش ئـەکرد، ئـەم پیاوەش زۆر بـێ ئەدەبانە بە پێغەمبەری گوت: (إتَّقِ اللهَ... إعْدِل) لـە خـوا بترسـە دادپەروەرانـە ئـەم شتە بـەش بکـە، ئینجـا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: قوڕت بەسـەر ئەگەر مـن لـە خـوا نەترسـمو دادپـەروەر نـەبم، کێ دادپـەروەرە؟ ئینجـا ئیمامی (عُمَر)و (خالد بن الولِیـد) رَضِیَ اللهُ عَنْهُما گوتیـان: یـا رَسُولَ الله ئیزنمـان بـدە بیکـوژین، پێغەمبـەرﷺ فەرمووی: وازی لێ بێنن. ئینجا فەرمووی: ﴿إنَّ لَهُ أصْحَابًا يَحْقِرُ أحَدُكُمْ صَلاتَهُ مَعَ صَلاتِهِمْ وَصِيَامَهُ مَعَ صِيَامِهِمْ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لا يُجاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنَ الإسْلامِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ﴾ رواهما البخاري ومسلم، ئینجا بزانە: ئێستاش (خَوارج) زۆرنو بەم نیشانانەی خوارەوە ئەناسرێن:

١- تازە پێگەیشتوو و تازە لاون، زۆریش نەفامو نائێگەیشتوون.

٢- دروشمی (القرآن والسنَّة) بەرز ئەکەنەوە ئەڵێن: ئێمە تەنها بە قورئانو حەدیس ڕەفتار ئەکەین، بـەلام درۆ ئەکەن، ئەوە بوو: لە کاتێکدا ئەم دروشمەیان ڕووبەڕووی ئیمامی (عَلی) بەرز کردەوەو گوتیان: (لا حُكْمَ إلاّ لله)

دادپەروەریەتی تەنها مافی خوایە. ئیمامی (علي) وەڵامی داوەتەوەو فەرمووی: (كلمة حق أريد بها باطل) رواه مسلم، ئەمە ووتەیەكی ڕاستەو مەبەست بەم ووشەیە ناڕەواییە. دەربارەی ئەم نیشانانە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿يأتي في آخر الزمان قومٌ حُدَثاءُ الأسنان سُفَهاءُ الأحلام، يقرءون القرآن لا يجاوز تراقيهم يقولون من خير قول البرية، يمرقون من الإسلام كما يمرق السهم من الرمية لا يجاوز إيمانهم حناجرهم﴾ رواه البخاري ومسلم، لە كۆتایی زەمان كۆمەڵێك پەیدا ئەبن: تازە پێگەیشتوو و نەفام و نا تێگەیشتوون، قورئان ئەخوێنن و لە گەردەنیان بەرەو خوار نیە، فەرموودەكانی چاكترینی خەڵك -كە پێغەمبەرەﷺ- ئەخوێنن، بە هۆی توندو تیژی لە ئایینی ئیسلام دەرئەچن هەروەكو تیر لە نێچیر دەرئەچێ.

٣- زۆر بایەخ بە نوێژو ڕۆژوو ئەدەن بە شێوەیەكی وا نوێژ ئەكەن و قورئان لەبەر ئەكەن و ئەیخوێنن خەڵك لێیان سەر سوڕ ئەمێنن. پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿يخرج قومٌ من أمتي يقرءون القرآن ليس قراءتكم إلى قراءتهم بشيء ولا صلاتكم إلى صلاتهم بشيء ولا صيامكم إلى صيامهم بشيء يقرءون القرآن يحسبون أنه لهم وهو عليهم﴾ رواه مسلم وأبوداود، كۆمەڵێك لە ئوممەتی من پەیدا ئەبێ: قورئان ئەخوێنن، قورئان خوێندنی ئێوە بەرامبەر بە قورئان خوێندنی ئەوان هیچ نیە، نوێژەكەتان و ڕۆژووەكەتان بەرامبەر نوێژو ڕۆژووی ئەوان هیچ نیە، قورئان ئەخوێنن وا تێئەگەن قورئان لە سوودی ئەوانە، بەڵام لە ڕاستیدا قورئان لە دژی ئەوانە. جا لەگەڵ ئەوەشدا (خوارج) نوێژ بە جەماعەت لە پشت خەڵكی تر ناكەن؟ چونكە بە كافریان تێ دەگەن؟ لەبەر ئەوەی خراپە قەدەغە ناكەن، بڕوانە (تحفة المحتاج شرح المنهاج) ل٦٧ ب٩.

٤- زۆر بێئەدەبو بێحورمەتن بەرامبەر بە پێغەمبەرﷺ دژی سەڵەوات لێدانو زیارەتی پێغەمبەرو شەفاعەتو (توسل)ن، واتە: هاواركردنە خوا بە خاتری پێغەمبەرﷺ ئەمەش ئەگەڕێتەوە سەر مامۆستا بێئەدەبەكەیان كە بە پێغەمبەری گوت: (إتق الله... إعدل) رواه البخاري ومسلم، لە خوابترسەو دادپەروەر بە.

٥- زۆر بێئەدەبو بێحورمەتن بەرامبەر زانایانی (أهل السنّة والجماعة) هەر لە سەدەی یەكەمەوە تا ئێستا، بە تایبەتی زۆر دژی هەر چوار پێشەوای سەر مەزهەبن و ڕێزیان بۆ دانانێن و ئەڵێن: (ئەوان پیاوبن و ئێمەش پیاوین). هەروەها باوەڕیان بە (إجماع) یەكدەنگی زانایانی (سَلَف) نیە، واتە: ئەو سێ سەد ساڵەی پێغەمبەرﷺ شاهیدی بۆ داون ئەوان هیچ ڕێزیان بۆ دانانێن، جگە لەمەش: هەر كتێبێكی تەفسیرو شەرحی حەدیس و (فقه) شەریعەتی ئیسلامی هەیە، گشتی لە لای ئەوان ناتەواو و باوەڕ پێنەكراوە، تەنها ئەو كتێبانە نەبن كە سەرانی خۆیان نووسیویانە، جا هەر لەبەر ئەم سیفەتە پیسە پێغەمبەرﷺ پێیان ئەڵێ: ﴿إنهم كلابُ أهل النار﴾ رواه الحاكم، بە ڕاستی (خوارج) سەگی دۆزەخیانن. واتە: هەروەكو سەگ بە هەموو كەسێك ئەوەڕێ -جگە لە خاوەنی خۆی- ئەوانیش وەها زمان درێژی ئەكەنە سەر هەموو كەسێكو غەیبەتی ئەكەن و هەموو زانایەكی سوودبەخش لە پێش چاوی خەڵكی سووك ئەكەن و لەكەداری ئەكەن، تاكو خەڵك سوودی لێوەرنەگرن، تەنانەت ئیمامی (عُمَر)یش لە مەسەلەی (طلاق) بە بەهەڵەداچوو دائەنێن.

٦- بەردەوام ململانێ لەگەڵ موسوڵمانان ئەكەن و پەرتەوازە ئەخەنە ناو موسوڵمانان، بەڵام: بەرامبەر كافرو زاڵم و ستەمكاران دۆستی تەواون و یارمەتییان لێوەرئەگرن، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿يقتلون أهل الإسلام ويدعون أهل الأوثان﴾ رواه البخاري ومسلم، دین پەیڕەوانی ئیسلام ئەكوژن و واز لە بتپەرستان دێنن.

٧- هەموو كاتێك گفتوگۆ لە (متشابهات القرآن والحديث) ئەكەن: وەكو ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾و ﴿يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ﴾و ﴿وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ﴾...هتد: لەژێر ناوی (سلفی)و بە بیانووی ڕاستكردنی (عقيدة) ئەكەونە ناو ئەم ئایەتانەو عەقیدەی (مُجَسِّمَة) ئەخەنە ناو مێشكی خەڵكو وایان تێئەگەیەنن: كە ئەوان ڕێبازی (سلف)یان گرتۆتە بەرو عەقیدەی (أهل السنّة) زیندوو ئەكەنەوەو ئەڵێن: لە ساڵی سێسەدی كۆچی بەم لایەوە (خلف) عەقیدەی خەڵكیان تێك داوە، بەڵێ: (خوارج) ئەوەندە گومڕابوونە، زانایانی دە سەدە، واتە: هەزار ساڵ، بە نەزان و گومڕابوو ناو ئەبەن و ئەڵێن: ئەو زانایانە شارەزای (عقيدة) نین، بەڵێ: (خوارج) چاویان كوێر

**وَالشَّفَاعَةُ الَّتِي إِدَّخَرَهَا لَهُمْ حَقٌّ كَمَا رُوِيَ فِي الأَخْبَارِ.**

---

**ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:**

**(وَالشَّفَاعَةُ الَّتِى إِدَّخَرَهَا لَهُمْ حَقٌّ) ئەو تکایەی پێغەمبەرﷺ-کە بۆ ئوممەتی خۆی هێشتوویەتیەوە بۆ ڕۆژی قیامەت- ڕاستە (كَمَا رُوِيَ فِى الأَخْبَارِ) هەروەکو لە حەدیسەکانی (صَحیح)دا گێڕدراوەتەوە، بۆ نموونە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ مُسْتَجَابَةٌ، فَتَعَجَّلَ كُلُّ نَبِيٍّ دَعْوَتَهُ، وَإِنِّي إِخْتَبَأْتُ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لِأُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَهِيَ نَائِلَةٌ إِنْ شَاءَ اللهُ مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِي لاَ يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئًا﴾ رواهُ الْبُخاری ومُسْلِم، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: هەر پێغەمبەرێك دوعایەکی قبولکراوی هەیەو لە دونیادا دوعاکەیەی خۆی کردوە، منیش دوعایەکەی خۆم هێشتۆتەوە تاکو ببێتە شەفاعەت بۆ ئوممەتم لە ڕۆژی قیامەت، ئەم شەفاعەتەی من-إِنْ شَاءَ اللهُ- گشت کەسێك لە ئوممەتم ئەگرێتەوە بەو مەرجەی بە ئیمانەوە مردبێ‌و هاوبەشی بۆ خوا دانەنابێ.**

---

بووە: کە خوای گەورە بە خراپە ناوی هێناون‌و ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ...﴾ آل عمران:٧، ئەو کەسانەی لەناو دڵیاندا خواری هەیەو لە ڕاستی لایانداوە، خۆیان بە ئایەتی (مُتَشابِهات) خەریك ئەکەن، تاکو خەڵکی گومڕا بکەن‌و پەرتەوازە پەیدا بکەن. پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِذَا رَأَيْتُمُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ فَأُولَئِكَ الَّذِينَ سَمَّاهُمُ اللهُ فَاحْذَرُوهُمْ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، هەر کاتێك ئەو کەسانەتان دیتن کە بە دوای (مُتَشابِهات)ی قورئاندا ئەگەڕێن، ئەوانە ئەو پیاوخراپانەن کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ناوی هێناون، خۆتان لێیان بپارێزن.

(إبن حَجَر العَسْقَلانی) ئەفەرموێ: یەکەمجار گفتوگۆکردن لە (مُتَشابِهاتُ القُرآن) لەناو جووەکان ئاشکرا کرا، ئینجا لە ناو (خَوارِج) ئاشکرا بوو، (فتح الباری) ل٢٦٧ ب٨.

٨- بە کافر دانانی خەڵك ئاشکراترین دروشمی (خَوارِج)ەکانەو زۆر بە ئاسانی-بە هۆی تاوانێك- تۆمەتی (شِرك): کافر بوون دەدەنە پاڵ موسوڵمانان ﴿كَانَ إِبْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا يَرَاهُمْ-أَيْ الخَوارِجَ- شِرَارَ خَلْقِ اللهِ تَعَالَى، وَقَالَ: إِنْطَلَقُوا إِلَى آيَاتٍ نَزَلَتْ فِي الْكُفَّارِ فَجَعَلُوهَا عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ رواهُ البخاري، واتە: (عبدالله)ی کوڕی ئیمامی (عُمَر) رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا (خَوارِج)ی بە خراپترینی خەڵك دادەنان‌و دەیفەرموو: ئەو ئایەتانەی دەربارەی کافرەکان هاتون، (خَوارِج) بە سەر ئیماندارانـدا بەکاریان دێنن. جا هەر لەبەر ئەو سیفەتە خراپەیە، پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ﴿هُمْ شِرَارُ الْخَلْقِ وَالْخَلِيقَةِ﴾ رواهُ مُسْلِم، (خَوارِج) لە هەموو ئادەمیزادو لە هەموو ئاژەڵێك خراپترن. بڕوانە (إرْشادُ السارِی شَرْحُ البُخاری) ل٨٤ ب١٠.

ئەی موسوڵمانی خۆشەویست: لە سەردەمی ئێستادا (خَوارِج) لە کوردستاندا زۆرن‌و ئەم هەشت نیشانەیان لێ هاتۆتە جێ، ئینجا بزانە: (خَوارِج) بە سووکترین گرۆهی (أهْل البِدْعَة)ن، کە (کُفر) سوودیان لێوەرنەگرتووە بۆ پەرتەوازەی ناو موسوڵمانان بەکاریان ئەهێنێ، جگە لەمەش: لە کاتی خۆی‌و ئێستاش دەستێکی بەهێزیان هەبوو بۆ لێدانی ئیسلام، ئەوە بوو: لە دژی ئیمامی (عَلی) چەکیان هەڵگرت‌و گوتیان: (عَلی) کافرە؟ چونکە بە (تَحْكِيمْ) ڕازییە، لە ئەنجامدا ئیمامی (عَلی)یان شەهید کرد، هەر یەکێش لایەنگری ئیمامی (عَلی) بوو بە کافریان دانا، بۆ نموونە: (أبو مُوسى الأشْعَرى) کە (صَحابَة) بوو و نوێنەری ئیمامی (عَلی) بوو، ئەویشیان بە (کافر) دانا، ئێستاش (أبوالحَسَن الأشْعَرى) کە لە نەتەوەی ئەم (صَحابَة)یە ڕقیان لێیەتی‌و ئەڵێن: (عَقیدَة)ی ئەشعەری خراپەو بە کەڵك نایێ، کەوابوو-ئەی موسوڵمانی خۆشەویست- شوێن ئەم گرۆهەی (خَوارِج) مەکەوەو لێیان دوور کەوە، ڕوونکەرەوە.

## ﴿باسی تكاكردنه گەورەكەی پێغەمبەرﷺ لە مەیدانی مەحشەر (الشَّفَاعَةُ العُظْمَى)﴾

ئینجا بزانە: كە ئەم خەڵكە لە ڕۆژی قیامەت زیندوو كرانەوە، لە گۆڕەپانی (مَحْشَر) ڕادەگیرێن، ئینجا لە وەستانی (مَحْشَر) بێزار ئەبن و ڕێك ئەكەون: ئەڕۆنە لای حەزرەتی (آدَم)و (نُوح)و (إبْرَاهِيم)و (مُوسى)و (عِيسى)-عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ والسَّلامُ- تاكو لە لای خوا تكایان بۆ بكەن: دادكردن دەست پێ بكاو لەم تەنگانەیە ڕزگاریان ببێ، بەڵام ئەم پێغەمبەرە بەڕێزانە لە ترسی خوا ناوێرن تكایان بۆ بكەن، ئینجا ئەچنە لای گەورەی پێغەمبەران حەزرەتیْ (مُحَمَّد)ﷺ، ئەم گەورەو بەڕێزە لە لای خوا تكایان بۆ ئەكاو خوای گەورە تكای وەرئەگرێو دادگای (مَحْشَر) دەست پێ ئەكا، بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل١٥٠و ١٥٦ ب٢و (فتح الباري) ل٥٢٠و ٥٢٨ ب١١.

ئینجا بزانە: ئەم تكاكردنە گەورەیە تایبەتە بە پێغەمبەری ئیسلامﷺو پێی ئەگوترێ: (الشَّفَاعَةُالعُظْمَى)، هەروەها پێیشی ئەگوترێ: (الْمَقَامُ الْمَحْمُود) شوێنی سوپاسكراو، كە خوا لە قورئان وەعدەی بە پێغەمبەرﷺ داوەو ئەفەرموێ: ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ الإسراء:٧٩، رواهُ التِرْمذي بسند حسن، نزيكە خوا لە شوێنێكی سوپاسكراو داتبنێ. واتە: خەڵكی (مَحْشَر) بە تێكڕایی سوپاسی ئەكەن، چونكە لەم تكایەدا جیاوازی لە نێوان ئوممەتی خۆی خەڵكیتر ناكا ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: عَنِ النَّبِيِّﷺ: إِنَّ الشَّمْسَ تَدْنُو حَتَّى يَبْلُغَ الْعَرَقُ نِصْفَ الأُذُنِ، فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ اسْتَغَاثُوا بِآدَمَ، ثُمَّ بِمُوسَى، ثُمَّ بِمُحَمَّدٍ، فَيَشْفَعُ لِيُقْضَى بَيْنَ الْخَلْقِ، فَيَمْشِي حَتَّى يَأْخُذَ بِحَلْقَةِ الْبَابِ، فَيَوْمَئِذٍ يَبْعَثُهُ اللهُ مَقَامًا مَحْمُودًا يَحْمَدُهُ أَهْلُ الْجَمْعِ كُلُّهُمْ﴾ رواه البخاري في الزكاة، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: لە مەیدانی (مَحْشَر) ڕۆژ لە خەڵك نزیك ئەبێتەوە تا لەبەر گەرمایێ خەڵك ئارەقەی لێئەچكێتەوەو، تا نیوەی گوێ لە گۆمی ئارەقەدا نقوم ئەبن، جا لەم تەنگانەیەدا هاوار ئەبەنە لای حەزرەتی(آدَم)، ئینجا لای(مُوسَى)، ئینجا (مُحَمَّد) -عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ والسَّلامُ- تاكو فریایان كەون، ئینجا پێغەمبەرﷺ لەلای خوا تكایان بۆ ئەكاو دەست بە دادكردن ئەكا، جا پێغەمبەرﷺ ئەڕواتە لای بەهەشت، دەست بە ئاڵقەی دەرگای بەهەشتەوە ئەگرێ، ئینجا لەم ڕۆژەدا خوای گەورە پێغەمبەری خۆی ئەباتە شوێنێكی سوپاسكراو كە خەڵكیمەحشەر بە تێكڕایی سوپاسی ئەكەن، واتە: چونكە بە بێجیاوازی لە لای خوا تكای بۆ كردوون. بڕوانە (إرْشادُ الساري شَرْح البُخاري) ل٦٣ ب٣.

## ﴿ باسی شەفاعەتی فریشتەو پێغەمبەرانو پیاوچاکان ﴾

ئینجا بزانە: جگە لە تکا گەورەکەی مەحشەر، فریشتە=(مَلَائِكَة) پێغەمبەرانو پیاوچاکان تکا بۆ تاوانباران ئەکەن: تاکو خوا لێیان ببورێو بیانباتە بەهەشت ﴿عَنْ أَبِي سَعِيد الْخُدْرِيّ فِي حَدِيث الرُّؤْيَة الطَّوِيل: عَنِ النَّبِيّ ﷺ...فَيَشْفَعُ النَّبِيُّونَ وَالْمَلَائِكَةُ وَالْمُؤْمِنُونَ، فَيَقُولُ الْجَبَّارُ: بَقِيَتْ شَفَاعَتِي، فَيَقْبِضُ قَبْضَةً مِنَ النَّارِ فَيُخْرِجُ أَقْوَامًا قَدِ امْتُحِشُوا...﴾ رواهُ البخاري مُسْلِم، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ئینجا پێغەمبەرەکانو (مَلَائِكَة)و ئیمانداران شەفاعەت ئەکەن، ئینجا خوای گەورە ئەفەرموێ: شەفاعەتی منیش ماوە، ئینجا خوای گەورە چەنگێك لە دۆزەخ ئەدلو کۆمەڵە خەڵکێکی لێدەرئێنێ: کە پیستەو گۆشتیان تا سەر ئێسقان سوتاوە.

ئینجا بزانە: پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ لە هەر پێنج بەشەکەی شەفاعەتدا تاکە سەرداری ڕۆژی قیامەتە، هەروەك خۆی ئەفەرموێ: ﴿شَفَاعَتِي لأَهْلِ الكَبَائِرِ مِنْ أُمَّتِي﴾ رواه أحمد والترمذي بسند حسن، شەفاعەتی من لە ڕۆژی قیامەت بۆ تاوانبارە گەورەکانی ئوممەتم هەیە. هەروەها شەهیدی ڕێگەیخوا ڕێزێکی تایبەتی هەیە، هەروەك پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿يُشَفَّعُ الشَّهِيدُ فِي سَبْعِينَ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ﴾ رواه أبوداود والترمذي بسند صحيح، شەهید ڕێگەی ئەدرێ: شەفاعەت بۆ حەفتا کەس لە خزمو کەسی خۆی بکا.

## ﴿ باسی (تَوَسُّل) پاڕانەوە لە خوا بە خاتری پێغەمبەروﷺ پیاوچاکان ﴾

بزانە: دەربارەی (تَوَسُّل) واتە: پاڕانەوە لە خوا بە خاتری پێغەمبەرﷺ، یان پیاوچاکان، ئەم خەڵکە سێ جۆرە:

**یەکەم:** لە سنوور تێپەڕیونو وا تێئەگەن: پێغەمبەرﷺ، یان پیاوچاکەکە ئەتوانێ کارەکەیان بۆ بکا، چونکە دەسەڵاتێکی هەیە. ئەم باوەڕە هەڵەیەو باوەڕی ئەو نەزانانەیە: کە ڕێبازی (شرْك)یان گرتۆتە بەر.

**دووەم:** لە نرخو ڕێزی پێغەمبەرﷺو پیاوچاکان کەم ئەکەنەوەو ئەڵێن: دروست نیە نە بە خاتری پێغەمبەرﷺو نە بە خاتری پیاوچاك لە خوا بپاڕێتەوە. ئەم باوەڕەش هەڵەیەو باوەڕی ئەو نەزانەیە: کە ڕێبازی (خَوارِج)و (مُعتَزِلَة)یان گرتۆتە بەر.

**سێیەم:** سنورێك بۆ ئەم خاترانەیە دائەنێنو ئەڵێن: دروستە موسوڵمان (تَوَسُّل) بکا -واتە: لە خوایگەورە بپاڕێتەوە- تاکو خوا کارێکی بۆ بکا، لەبەر خاتری پێغەمبەرﷺ، یان پیاوچاکێك، بەو مەرجەی باوەڕی وابێ: کە پێغەمبەرﷺو، پیاوچاك کارگەر نینو دەسەڵاتیان نیە، بەڵکو ڕێزیان لە لای خوا هەیەو خوا لەبەر خاتری ئەوان دوعایەکە قبوڵ ئەکا. ئەمە ڕاستەو ڕێبازی (أهل السنّة والجماعة)یە، ئەمەش بەڵگەکانیانە:

١- (تَوَسُّل) به پێغەمبەرﷺ دروستە ﴿عَنْ عُثْمَانَ بن حُنَيفٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلاً ضَرِيرَ الْبَصَرِ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: أُدْعُ اللهَ أَنْ يُعَافِيَنِي، قَالَ: إِنْ شِئْتَ: دَعَوْتُ، وَإِنْ شِئْتَ: صَبَرْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ. قَالَ: فَادْعُهُ. فَأَمَرَهُ: أَنْ يَتَوَضَّأَ فَيُحْسِنَ وُضُوءَهُ، وَيَدْعُوَ بِهَذَا الدُّعَاءِ: اَللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ وَأَتَوَجَّهُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّكَ مُحَمَّدٍ ﷺ نَبِيِّ الرَّحْمَةِ، يَا مُحَمَّدُ إِنِّي تَوَجَّهْتُ بِكَ إِلَى رَبِّي فِي حَاجَتِي هَذِهِ لِتُقْضَى لِي، اَللَّهُمَّ فَشَفِّعْهُ فِيَّ﴾ رواه ابن ماجه والترمذي وقال: حسن صحيح، پیاوێکی کوێر گوتیە پێغەمبەرﷺ: دوعام بۆ بکە خوا چاوەکانم چاك بکاتەوە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر حەز دەکەی دوعات بۆ دەکەم، وە ئەگەر سەبر بگری باشترە. گوتی: دوعام بۆ بکە. ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکرد: دەستنوێژ بشولو ئەم دوعایە بکا: (خوایە من لێت ئەپاڕێمەوەو ڕوو ئەکەمە لای تۆ بە خاتری پێغەمبەرەکەت (مُحَمَّد)ﷺ کە پێغەمبەرێکی ڕەحمەتە، (يا مُحَمَّد)ﷺ من بە خاتری تۆ ڕووم کردە لای خوا تاکو خوا ئەم کارەم بۆ بکا (چاوم چاك بکاتەوە) خوایە: خاتری پێغەمبەرﷺ وەربگرە لە کارەکەی مندا). بڕوانە (الأذكار للنواوي)، ل١٥٧.

٢- (تَوَسُّل) بە پیاوچاکان دروستە ﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: أَنَّ عُمَرَ رضي الله عنه اسْتَسْقَى بِالْعَبَّاسِ رضي الله عنه، فَقَالَ: اَللَّهُمَّ إِنَّا كُنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّنَا ﷺ فَتَسْقِينَا، وَإِنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِعَمِّ نَبِيِّنَا فَاسْقِنَا، قَالَ: فَيُسْقَوْنَ﴾ رواه البخاري في الصلاة، ئیمامی (عُمَر) دوعای بارانی کردو گوتی: خوایە کاتی خۆی (تَوَسُّل)مان بە خاتری پێغەمبەرمانﷺ ئەکرد، بارانت بۆ ئەباراندین، وا ئێستاش (تَوَسُّل) بە خاتری مامی پێغەمبەرمانﷺ ئەکەین، خوایە: بارانمان بۆ ببارێنە، بڕوانە (إِرْشاد الساري) ل٢٢٨ ب٢.

٣- (تَبَرُّك) بەرەکەت وەرگرتن بە ئاسەواری پێغەمبەرﷺ پیاوچاکان دروستەو بەشێکە لە (تَوَسُّل)کردن ﴿عَنِ الْمِسْوَرِ، وَمَرْوَانَ -فِي قِصَّةِ الْحُدَيْبِيَّةِ- قَالَ عُرْوَةُ: فَوَاللهِ مَا تَنَخَّمَ النَّبِيُّ ﷺ نُخَامَةً إِلاَّ وَقَعَتْ فِي كَفِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ فَدَلَكَ بِهَا وَجْهَهُ﴾ رواه البخاري في الشروط، ئەگەر پێغەمبەرﷺ تفی فڕێ دابا، (صَحابَة) دەستیان لەبەر ئەگرتەوەو ڕووی خۆیان پێ چەور ئەکرد، واتە: بۆ پیرۆزی. ﴿عَنْ أَسْمَاءَ رضي الله عنها: هَذِهِ جُبَّةُ رَسُولِ اللهِ ﷺ كَانَ يَلْبَسُهَا، فَنَحْنُ نَغْسِلُهَا لِلْمَرْضَى يُسْتَشْفَى بِهَا﴾ رواهُ مُسْلِم في اللباس، (أسماء) فەرمووی: ئەمە (جُبَّة)-کەوایەکەی پێغەمبەرەﷺ کاتی خۆی ئەیکردە بەر، ئێستاش ئێمە بۆ نەخۆشەکان ئەیشۆرین، تاکو بە ئاوشۆرەکەی شیفایان بۆ بێو چاك ببنەوە. ئیمامی (النواوي) ئەفەرموێ: ئەم حەدیسە بەڵگەیە: کە سوننەتە بەرەکەت وەرگرتن بە ئاسەواری پیاوچاکانو جلەکانیان. (شرح صحيح مسلم) ل٢٥٧ ب٨.

ئینجا بزانە: چینێکی (خـوارج)و (مُعْتَزلـة)ی ئێستا ئەڵێن: (تَوسُّل) بە خاتری پێغەمبەرﷺو پیاوچاکان تەنها لە کاتی زیندوویی دروستە، واتە: (تَوسُّل) بە مردوو دروست نیەو ئەڵێن: بەلگەشمان ئەوەیە: ئیمامی (عُمر) ﷺ (توسُّل)ی بە (عبّاس) کرد، چونکە پێغەمبەرﷺ مردبو، ئەوەش وا ئەگەیەنێ: کە (تَوسُّل) بە مردوو دروست نیە، ئەگەر دروست بوایە: ئیمامی (عُمَر) ئەیکرد.

**وەلام:** ئەو گوتەیە بە بەلگەی ژمارە چواری داهاتوو پوچەڵ دەبێتەوەو هەم دەڵێین: ئیمامی (عُمَر) بۆیێ (تَوسُّل)ی بە (عبّاس) کرد، تاکو خەڵك بزانێ: (توسُّل) بە پیاوچاکانیش دروستە. واتە: مەرج نیە (تَوسُّل) تەنها بە پێغەمبەرﷺ بکرێ، هەروەها بەلگە هێنانەوە بە حەدیسەکەی (عبّاس) بۆ ئەوەی (تَوسُّل) بە مردوو دروست نەبێ، نیشانەی تێنەگەیشتنە لە حەدیسەکە، چونکە ئەو حەدیسانەی هێناومانن، گشتیان بەلگەی (تَوَسُّل) بە مردوویان تێدایە، بەم شێوەیە:

١- پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە کوێرەکەیڕابردوو کرد: بڵێ: ﴿وَأَتَوَجَّـهُ إِلَيْـكَ بِنَبِيِّـكَ مُحَمَّدٍﷺ نَبِيِّ الرَّحْمَةِ﴾ خوایە لێت ئەپاڕێمەوە بە خاتری پێغەمبەرەکەت کە پێغەمبەری رەحمەتە. ئەم ڕستەیە بەلگەیە: کە پێغەمبەرﷺ بە زیندوویی‌و بە مردوویی رەحمەتە، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾ الأنبياء:١٠٧، ئێمە تۆمان نەناردوە تەنها بە ڕەحمەت بۆ هەموو خەڵکمان ناردوی. کەواتە: رەحمەتی پێغەمبەرﷺ پلەی پێغەمبەرایەتی‌یە، جا ئەم پلەیەش کە پێغەمبەرایەتی‌یە، بە مردنی لاشەکەی پێغەمبەرﷺ هیچ کەم نابێتەوەو هەر ئەمێنێ، کەوابوو: ئێمە (تَوسُّل) بە پێغەمبەرایەتییەکەی ئەکەین، نەك بە لاشە مردووەکەی پیرۆزی.

٢- ئیمامی (عُمر) لە پاڕانەوەیدا ناوی (عبّاس)ی نەهێناو نەیگوت: (نَتَوسَّلُ بالعبّاس) بەلکو فەرمووی: (نَتَوَسَّلُ بِعَمِّ نَبِيِّنَا) خوایە لێت ئەپاڕێمەوە بە خاتری مامی پێغەمبەرمانﷺ. کەواتە: ئەم ڕستەیە وا ئەگەیەنێ: کە (عبّاس) لەبەر ئەوە خاترمەندە چونکە مامی پێغەمبەرەﷺ جیاوازیش نیە: پێغەمبەرﷺ زیندوو بێ، یان مردوو بێ، هەروەك (عبّاس) بە خۆی لە دوعای باراندا فەرمووی: ﴿وَقَدْ تَوَجَّهَ بِـي الْقَـوْمُ إِلَيْـكَ لِمَكَانِي مِنْ نَبِيِّكَﷺ﴾ أخرجهُ الزبير بن بكار. واتە: خوایە ئەم خەڵکە بە خاتری من ڕووی پاڕانەوەیان کردە لای تۆ، چونکە من لە لای پێغەمبەرەکەتﷺ شوێنی خزمایەتیم هەیە. بڕوانە (فتح الباري، باب الإستسقاء)، هەم (سُبُل السَّلام) ل٨١ ب٢.

کەوابوو: پێغەمبەرﷺ لە پاش مردنیش خاترەکەی هەر بەردەوامەو هەر لەبەر خاتری ئەو (تَوسُّل) بە (عبّاس) ئەکا، چونکە ئەگەر مەبەستی ئیمامی (عُمَر) تەنها پیاوچاکیی

(عبّاس) بووایە: ئەوە پیاوی زۆر پلەو پایە بەرزتر هەبون کە (تَوَسُّل)یان پێ بکا: وەکو (عُثْمان)و (عَلی)و (طَلْحَة)و (زُبیر)...هتد،ﷺ.

٣- حەدیسەکەی (جُبَّة)=کەوایەکەی پێغەمبەرﷺ بەهێزترین بەڵگەیە کە (تَوَسُّل) بەمردوو دروستە، چونکە لەوکاتی ئاوشۆرەکەی کەوایەکەیان ئەدا نەخۆشەکان، پێغەمبەرﷺ وەفاتی کردبو: جگە لەمەش: خودی (جُبَّة) کەوایەکەش بە مردوو ئەژمێردرێ؟ چونکە گیانلەبەر نیە.

٤- هەر لە سەردەمی ئیمامی(عُمَر)داﷺ (صَحابَة) راستەوخۆ -لە سەر گۆڕی پێغەمبەرﷺ- تکای دوعایان لێ کردوە ﴿عَن مالك الدّار: أَصابَ النَّاسَ قَحْطٌ فِي زَمَنِ عُمَرَﷺ، فَجاءَ رَجُلٌ -وَهُوَ بِلالُ بن الْحَرْث الْمُزَنِي الصَّحابيُّﷺ- إِلَى قَبْرِ النَّبِيِّﷺ فَقالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِسْتَسْقِ لأُمَّتِكَ فَإِنَّهُمْ قَدْ هَلَكُوا. فَأَتَى الرَّجُلَ فِي الْمَنَامِ فَقَالَ: أَقْرِىءْ عُمَرَ مِنِّي السَّلَامَ وَأَخْبِرْهُ أَنَّهُمْ يُسْقَوْنَ، وَقُلْ لَهُ: عَلَيْكَ الْكَيْسَ الْكَيْسَ، فَأَتَى الرَّجُلُ عُمَرَ، فَأَخْبَرَهُ، فَبَكَى عُمَرُ وَقَالَ: يَا رَبِّ مَا آلُوا إِلاَّ مَا عَجَزْتُ عَنْهُ﴾ رواه البيهقي وابن أبي شيبة بإسناد صحيح، وذكره الحافظ العسقلاني في (فتح الباري، باب الإِسْتسقاء)، والحافظ ابن كثير في البداية والنهاية ل١٦٧ ب٥، واتە: لە سەردەمی ئیمامی (عُمَر)ﷺ لە (عام الرّمادة)دا قاتیو بێبارانی تووشی خەڵك بوو، (صَحابَة)یەك -كە (بلال بن الحرث المزني) بوو- هاتە سەر گۆڕی پێغەمبەرﷺ گوتی: (يَا رَسُول الله) دوعای باران بۆ ئوممەتت بکە، چونکە بە هیلاك چوون. ئینجا پێغەمبەرﷺ هاتە خەونی (صَحابَة)کەو فەرمووی: سەلامی من لە (عُمَر) بکەو پێی رابگەیەنە: بارانیان بۆ دەبارێو پێی بڵێ: با زیرەكو هۆشیار بێ، با زیرەكو هۆشیار بێ: بۆ ئیشو کاری موسوڵمانان -واتە: با نوێژی باران بکا- ئینجا (صَحابَة)کە ڕووداوەکەی بە ئیمامی (عُمَر) ڕاگەیاند، ئیمامی (عُمَر)یش دەستی بە گریان کردو فەرمووی: خوایە کەمتەرخەمی ناکەم لە کاروباری موسوڵماناندا، مەگەر شتێك لە توانامدا نەبێ.

ئیتر ئەی موسوڵمانی ڕێزدار لەم بەڵگە بەهێزە زیاتر چیت دەوێ؟ خۆ ئەگەر (تَوَسُّل) بە پێغەمبەرﷺ لە دوای وەفاتیشی دروست نەبوایە، ئەوە ئیمامی (عُمَر) (صَحابَة)کەی ئاگادار دەکردەوەو نەدەگریا.

## ﴿ باسی بەڵێن وەرگرتنی خوا لە ئادەمیزادان ﴾

ئیمامی (الطَّحاوي) ئەفەرموێ:

(وَالْمِيثَاقُ الَّذِى أَخَذَهُ اللهُ تَعَالَى مِنْ آدَمَ وَذُرِّيَّتِه حَقٌّ) ئەو بەڵێنەی خوا لە ئادەمو نەتەوەی ئادەمی وەرگرتووە -کە بە خوای خۆیانی بزانن و هاوبەشی بۆ دانەنێن- ڕاستە، خوای

گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ﴾ الأعراف:١٧٢، ئەوە باس بکە: کە خوای تۆ نەتەوەی ئادەمیزادانی لە پشتی ئادەمیزادان هێنا دەرەوەو کردنیە شاهید لە سەر خۆیان‌و پێی فەرموون: ئایا من خوای ئێوە نیم؟ گوتیان: بەڵێ تۆ خوای ئێمەی‌و ئێمە شاهیدی ئەم بەڵێنەین؟ نەوەکو لە ڕۆژی قیامەت بڵێن: ئێمە لەم بەڵێنە بێئاگا بووین، واتە: لەبەر بێئاگایی کافر بووین.

﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ اللهَ تَعالَى أَخَذَ الْمِيثَاقَ مِنْ ظَهْرِ آدَمَ عليه السلام بِنَعْمَانَ -يَعْنِي عَرَفَةَ- فَأَخْرَجَ مِنْ صُلْبِهِ كُلَّ ذُرِّيَّةٍ ذَرَأَهَا فَنَثَرَهَا بَيْنَ يَدَيْهِ ثُمَّ كَلَّمَهُمْ قُبُلاً قَالَ: (أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ؟ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ أَوْ تَقُولُوا إِنَّمَا أَشْرَكَ آبَاؤُنَا مِنْ قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِنْ بَعْدِهِمْ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ الْمُبْطِلُونَ)﴾ رواه الإمام أحمد وصححه الحاكم، خوای گەورە ئەم بەڵێنەی لە ئادەمیزادان وەرگرت کە لە پشتی باب ئادەم دابوون، لە گۆڕەپانی (عَرَفَة)، ئەو هەموو ئادەمیزادانەی لەو ڕۆژەوە ئەبن تا دونیا وێران ئەبێ، گشتی لە پشتی باب ئادەم دەرهێنان‌و لە پێش باب ئادەم بڵاوی کردن‌و ڕووبەڕوو گفتوگۆی لەگەڵ کردن‌و فەرمووی: ئایا من خوای ئێوە نیم؟ گوتیان: بەڵێ: تۆ خوای ئێمەی‌و ئێمە شاهیدین...هتد ئایەتەکە.

(إِبْنُ حَجَرِ العَسْقَلانی) ئەفەرموێ: ئەم بەڵێنە ئەوەیە: کە لە پشتی باب ئادەم لێیان وەرگیراوە، ئینجا هەرکەسێك -کە هاتە دونیا- بەڵێنەکەی هێنا دی، ئەوە ئیماندارە، ئەگەر بەڵێنەکەی شکاند، ئەوە کافرە (فتح الباري) ل٤٩٢ ب١١.

ئینجا بزانە: لە ئایەتەکەدا ئەفەرموێ: ﴿مِنْ ظُهُورِهِمْ﴾ ئادەمیزادەکانی لە پشتی ئادەمیزادەکان هێنانە دەرەوە. بەڵام لە حەدیسەکاندا ئەفەرموێ: ﴿مِنْ ظَهْرِ آدَمَ﴾ لە پشتی باب ئادەمی هێنانە دەرەوە. جا -نەوەکو کەسێك وا تێبگا: دژایەتی لە نێوان ئایەتەکەو حەدیسەکاندا هەیە- ئەڵێین: ئایەتەکە ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکا: کە ئادەمیزادەکانی یەك لە دوای یەك لە پشتی یەکتری هێناونە دەرەوە بە گوێرەی زنجیرەی زاوزێی دونیا. حەدیسەکانیش ئەوەمان بۆ ئاشکرا ئەکەن: کە لە بنچینەدا هەموو ئادەمیزادەکانی بە کۆمەڵ لە پشتی باب ئادەم هێناونە دەرەوە. ئیتر چۆنیەتی ئەم هێنانە دەرەوەو، ئەم پەیمان وەرگرتنە هەر خوا ئەزانێ‌و واجبە باوەڕمان پێی هەبێ.

(إِبْن عَبَّاس) ئەفەرموێ: لە دوای پەیمان وەرگرتن، خوایگەورە هەموو ئادەمیزادەکانی لە ناو پشتی باب ئادەم دانانەوە. بڕوانە تەفسیری (الطبري)و (البغوي) سورةالأعراف، الآية:١٧٢.

وَقَدْ عَلِمَ اللهُ تَعَالَى فِيمَا لَمْ يَزَلْ عَدَدَ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ وَعَدَدَ مَنْ يَدْخُلُ النَّارَ جُمْلَةً وَاحِدَةً، فَلاَ يُزَادُ فِي ذَلِكَ الْعَدَدِ وَلاَ يُنْقَصُ مِنْهُ، وَكَذَلِكَ أَفْعَالُهُمْ فِيمَا عَلِمَ مِنْهُمْ أَنْ يَفْعَلُوهُ، وَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ، وَالأَعْمَالُ بِالْخَوَاتِيمِ،

---

## ﴿ بەهەشتی و دۆزەخی لە (أزل)دا ژمارەیان دیار كراوە ﴾

ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَقَدْ عَلِمَ اللهُ تَعَالَى فِيمَا لَمْ يَزَلْ) بێگومان خوای گەورە لە (أزل)دا زانیویەتی (عَدَدَ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ) ژمارەی ئەو كەسانەی ئەچنە بەهەشت (وَعَدَدَ مَنْ يَدْخُلُ النَّارَ) وە ژمارەی ئەوانەی ئەچنە دۆزەخ (جُمْلَةً وَاحِدَةً) بە یەك كۆمەڵ، واتە: بە بێ‌ژماردن ژمارەی هەردووكیانی پێكەوە زانیوە (فَلاَ يُزَادُ فِي ذَلِكَ الْعَدَدِ) هیچ لە ژمارەی ئەو دوو چینە زیاد ناكرێ (وَلاَ يُنْقَصُ مِنْهُ) هەروەها لە ژمارەشیان كەم ناكرێ (وَكَذَلِكَ أَفْعَالُهُمْ) هەروەها كردەوەكانیشیان (فِيمَا عَلِمَ) لەو جۆرەیە: كە خوا لە (أزل)دا زانیویەتی (مِنْهُمْ أَنْ يَفْعَلُوهُ) ئەوان ئەیكەن، شوێن و چەندو چۆنی كردەوەكانیشی زانیوە.

﴿عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي جَنَازَةٍ، فَقَالَ: مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَقَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ وَمَقْعَدُهُ مِنَ الْجَنَّةِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَفَلاَ نَتَّكِلُ عَلَى كِتَابِنَا وَنَدَعُ الْعَمَلَ؟ قَالَ: اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ: أَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ، وَأَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقَاءِ فَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ ثُمَّ قَرَأَ: (فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى)...الآيات﴾الليل:٥-١٠، رواهُ البخاري ومُسْلِم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر یەكێك لە ئێوە هەیە: شوێنەكەی لە دۆزەخ و لە بەهەشت نووسراوە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری‌خواﷺ، بۆچی بە تەمای ئەم نووسینە پاڵ نەدەینەوەو واز لە كاركردن نەهێنین؟ فەرمووی: دەست بە كار بن، چونكە هەر كەسەتان لە (أزل)دا ئامادە كراوە بۆ ئەو شوێنەی بۆی دروستكراوە، كەوابوو: ئەوەی بەهەشتی بێ، كردەوەی بەهەشتیان ئەكا، ئەوەی دۆزەخی بێ، كردەوەی دۆزەخیان ئەكا. ئینجا پێغەمبەرﷺ ئایەتەكانی (فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى) تا (لِلْعُسْرَى)ی خوێندەوە، بۆ بەڵگە لە سەر فەرموودەكەی خۆی، چونكە هەمان واتە ئەگەیەنن.

## ﴿ پشت بەستن تەنها بە دوایین كردەوەیە لە دونیادا ﴾

ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ) هەركەسە ئامادە كراوە بۆ ئەو شوێنەی بۆی دروستكراوە، هەروەكو لە حەدیسەكەی رابردوودا پێغەمبەرﷺ وەهای فەرمووە (وَالأَعْمَالُ بِالْخَوَاتِمِ) لە كردەوەكانی بەندە لە دونیادا، دوایین كردەوە ڕەچاو ئەكرێ‌و پشتی پێ ئەبەسترێ ﴿عَنْ سَهْلٍ رضي الله عنه قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّ الْعَبْدَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ وَإِنَّهُ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَيَعْمَلُ

عَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَإِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالْخَوَاتِمِ﴾ رواه البخاري، بەندەی وا هەیە: کردەوەی دۆزەخیانە ئەکاو لە (أزَل)دا بە بەهەشتی نووسراوە، بەندەی وەهاش هەیە کردەوەی بەهەشتیانە ئەکاو لە (أزَل)دا بە دۆزەخی نووسراوە، لە کردەوەکانی بەندە -لە دونیادا- تەنها دوایین کردەوە ڕەچاو ئەکرێ.

(إِبنْ حَجَرالعَسْقَلاَنی) ئەفەرموێ: کردەوەکانی بەندە لە دونیادا نیشانەو بەڵگەی شوێنەکەیەتی لە قیامەتدا (فتح الباري) ل٦٠٩ ب١١.

(إِبنْ حَجَر الهَيْتَمی) ئەفەرموێ: بۆیێ لە دونیادا تەنها دوایین کردەوە ڕەچاو ئەکرێ، چونکە بڕیاری (أزَل)یخوا لە ئێمە پەنهانە، دوایین کردەوەش ئاشکرایە، کەوابو: بە گوێرەی ئاشکرایەکە ڕەفتار ئەکرێ (فتح المبين) ل٩١.

**ڕوونکردنەوە:** ئەگەر دواکردەوەکانی بەندە لە دونیادا چاکە بوو، ئەوە پێی ئەگوترێ: (حُسْنُ الخَاتِمَةِ) دواکردەوەی باش، نیشانەی بەختەوەرییە، چونکە مردن ڕێگەی نادا هیچیتر خراپە بکا، وە ئەگەر دواکردەوەکانی خراپە بوو، ئەوە پێی ئەگوترێ: (سُوءُ الخَاتِمَةِ) دواکردەوەی خراپ، نیشانەی بەدبەختییە، چونکە مردن ڕێگەی نادا هیچیترچاکە بکا.

(وَالسَّعِيدُ) بەختەوەر (مَنْ سَعِدَ بِقَضَاءِاللهِ) ئەو کەسەیە: بە بڕیاری خوا لە (أزَل)دا بەختەوەر بوبێ (وَالشَّقِيُّ) بەدبەخت (مَنْ شَقِيَ بِقَضَاءِ اللهِ) ئەو کەسەیە: بە بڕیاری خوا لە (أزَل)دا بەدبەخت بوبێ. ئیتر خوای گەورە ئەم زانستە پەنهانەی لە بەندەکانی شاردۆتەوەو فەرمانی پێکردوین: دەست بەکار بین، ولجبە ئێمەش ملکەچی فەرمانەکەی بین بۆ بەڵگە هێنان، چونکە کردەوەکان نیشانەی بڕیاری (أزَل)ن. بڕوانە (فتح الباري) ل٦٠٩ ب١١.

## ﴿ باسی قەزاو قەدەر ـ القَضَاءُ وَالقَدَرُ ﴾

(**القَضَاء**) بڕیاردان و دروستکردن. (**القَدَر**) ئەندازە دانان. کەوابوو: قەزاو قەدەر: بڕیاردانی خوایە لە (أزَل)دا-بە گوێرەی ویستنیخۆی- بوون، یان نەبوونی شتێك، بە ئەندازەیەکی دیارکراو و زاندراو تەنها لە لای خۆی، هەر بە ویستنی خۆی، لە کاتو شوێنێکی دیار کراو و زاندراو تەنها لەلای خۆی، هەر بە ویستنی خۆی.

ئینجا بزانە: قەزا لە پێش قەدەردایەو دادوەرە بە سەر قەدەردا. بڕوانە (اليواقيت والجواهر) ل٧٨ ب١.

هەروەها مەزهەبی (أهل السُّنَّة) ئەوەیە: هەموو شتێك بە قەزاو قەدەری خوایە، بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل١٩٨ ب١، (فتح الباري) ل٥٨٤ ب١١.

ئیمامی (الطَحاوي) ئەفەرموێ:

وَأَصْلُ الْقَدَرِ سِرُّ اللهِ تَعَالَى فِي خَلْقِهِ، لَمْ يَطَّلِعْ عَلَى ذَلِكَ مَلَكٌ مُقَرَّبٌ وَلاَ نَبِيٌّ مُرْسَلٌ، وَالتَّعَمُّقُ وَالنَّظَرُ فِي ذَلِكَ ذَرِيعَةُ الْخِذْلاَنِ وَسُلَّمُ الْحِرْمَانِ وَدَرَجَةُ الطُّغْيَانِ، فَالْحَذَرَ كُلَّ الْحَذَرِ مِنْ ذَلِكَ نَظَراً وَفِكْراً وَوَسْوَسَةً، فَإِنَّ اللهَ تَعَالَى طَوَى عِلْمَ الْقَدَرِ عَنْ أَنَامِهِ وَنَهَاهُمْ عَنْ مَرَامِهِ، كَمَا قَالَ تَعَالَى فِي كِتَابِهِ: [لاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ] فَمَنْ سَأَلَ لِمَ فَعَلَ؟ فَقَدْ رَدَّ حُكْمَ الْكِتَابِ، وَمَنْ رَدَّ حُكْمَ الْكِتَابِ كَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ. فَهَذَا جُمْلَةُ مَا يَحْتَاجُ إِلَيْهِ مَنْ هُوَ مُنَوَّرٌ قَلْبُهُ مِنْ أَوْلِيَاءِ اللهِ تَعَالَى، وَهِيَ دَرَجَةُ الرَّاسِخِينَ فِي الْعِلْمِ، لأَنَّ الْعِلْمَ عِلْمَانِ:

---

(وَأَصْلُ الْقَدَرِ سِرُّ اللهِ تَعَالَى فِي خَلْقِهِ) قەزاو قەدەر نهێنیی خوایە لە ناو دروستکراوی خۆیدا شاردویەتیەوە (لَمْ يَطَّلِعْ عَلَى ذَلِكَ مَلَكٌ مُقَرَّبٌ وَلاَ نَبِيٌّ مُرْسَلٌ) نە فریشتەیەکی نزیك لە خواو نە پێغەمبەرێکی(مُرْسَل) ئەم نهێنییەی نەزانیوە (وَالتَّعَمُّقُ وَالنَّظَرُ فِي ذَلِكَ) لێکۆڵینەوەو بیرکردنەوە لە قەزاو قەدەر (ذَرِيعَةُ الْخِذْلاَنِ) هۆی شکستییە (وَسُلَّمُ الْحِرْمَانِ) پەیژەی بێبەشییە (وَدَرَجَةُ الطُّغْيَانِ) پلەی زۆرداریییە (فَالْحَذَرَ كُلَّ الْحَذَرِ) بترسەو خۆت بپارێزە (مِنْ ذَلِكَ نَظَراً وَفِكْراً وَوَسْوَسَةً) لە تێڕوانینو بیرکردنەوەو خرتو فرت: لە قەزاو قەدەر (فَإِنَّ اللهَ تَعَالَى طَوَى عِلْمَ الْقَدَرِ عَنْ أَنَامِهِ) چونکە خوای گەورە زانستی قەزاو قەدەری پێچاوەتەوە لە بەندەکانی خۆی (وَنَهَاهُمْ عَنْ مَرَامِهِ) قەدەغەی کردون لە داواکردنی ئەم زانستە (كَمَا قَالَ تَعَالَى فِي كِتَابِهِ) هەروەکو خوا لە قورئاندا ئەفەرموێ: ﴿لاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ﴾ الأنبياء:٢٣، پرسیار لە خوا ناکرێ هەرچی بکا، بەندەکانی پرسیاریان لێ ئەکرێ.

(فَمَنْ سَأَلَ لِمَ فَعَلَ؟) هەرکەسێك رەخنە بگرێو بڵێ: خوا بۆ وایکرد؟ (فَقَدْ رَدَّ حُكْمَ الْكِتَابِ) بە ڕاستی ئەوە بڕیاری قورئانی ڕەد کردۆتەوە (وَمَنْ رَدَّ حُكْمَ الْكِتَابِ كَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ) هەرکەسێك بڕیاری قورئان ڕەد بکاتەوە کافر ئەبێ. کەوابوو: موسوڵمانبوونو کافربوون، مردنو ژین، جوڵانو وەستان، ساغیو نەخۆشی، بوونیو هەژاری، تاوانو خواپەرستی...هتد، گشتی بە ویستو زانستی خوایەو لە (أزل)دا بڕیاری داوەو ئەندازەی بۆ داناوە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا﴾ الفرقان:٢، خوا هەموو شتێکی دروست کردوەو ئەندازەشی داناوە. بڕوانە باسی (سەرپشکیی بەندە لە کردەوەکانیدا)، لەم کتێبەدا.

(فَهَذَا) ئەم بیرو باوەڕەی باسمان کرد (جُمْلَةُ مَا يَحْتَاجُ إِلَيْهِ) کۆمەڵە زانستێك بوو کە پێویستیی پێ هەیە (مَنْ هُوَ مُنَوَّرٌ قَلْبُهُ مِنْ أَوْلِيَاءِ اللهِ تَعَالَى) ئەو کەسەی دڵی ڕووناك کراوەتەوە لە دۆستەکانی خوای گەورە (وَهِيَ دَرَجَةُ الرَّاسِخِينَ فِي الْعِلْمِ) ئەو کۆمەڵە زانستە –کە پێغەمبەرﷺ لە لای خواوە بۆ ئێمەی هێناوە– پلەی زانایانیڕوچووە لە زانستدا (لأَنَّ الْعِلْمَ عِلْمَانِ) چونکە زانست دوو جۆرە زانستە:

عِلْمٌ فِي الْخَلْقِ مَوْجُودٌ وَعِلْمٌ فِي الْخَلْقِ مَفْقُودٌ، فَإِنْكَارُ الْعِلْمِ الْمَوجُودِ كُفْرٌ وَإِدِّعَاءُ الْعِلْمِ الْمَفْقُودِ كُفْرٌ، وَلاَ يَثْبُتُ الإِيْمَانُ إِلاَّ بِقَبُولِ الْعِلْمِ الْمَوْجُودِ وَتَرْكِ طَلَبِ الْعِلْمِ الْمَفْقُودِ.

---

(عِلْمٌ فِي الْخَلْقِ مَوْجُودٌ) یەکەم: ئەو زانستەیە کە لە ناو خەڵکدا هەیە (وَعِلْمٌ فِي الْخَلْقِ مَفْقُودٌ) دووەم: ئەو زانستەیە کە لە ناو خەڵکدا نیە: وەکو قەزاو قەدەرو پێنج نادیارەکان، واتە: دونیا وێرانبوون، کاتی بارانی سوودبەخش، دوارۆژی کورپەی ناو زگ، سبەینێ چی ئەکا، لە کوێ ئەمرێ؟ بڕوانە ئایەتی (٣٤ لقمان).

(فَإِنْكَارُ الْعِلْمِ الْمَوجُودِ كُفْرٌ) داننەهێنان بەو زانستەی لە ناو خەڵکدا هەیە کافربوونە، وەکو زانستی قورئانو حەدیس (وَإِدِّعَاءُ الْعِلْمِ الْمَفْقُودِ كُفْرٌ) هەروەها ئەگەر بڵێ: زانستی نەبوو لە ناو خەڵك ئەزانم، کافر ئەبێ (وَلاَ يَثْبُتُ الإِيمَانُ إِلاَّ بِقَبُولِ الْعِلْمِ الْمَوْجُودِ) ئیمان ڕاناوەستێ تەنها بە وەرگرتنی زانستی هەبوویی نەبێ (وَتَرْكِ طَلَبِ الْعِلْمِ الْمَفْقُودِ) وە بە وازهێنان لە داواکردنی زانستی‌نەبوو لەناو خەڵکدا: کە باسمان کرد.

## ﴿باسی (لَوْح)و (قَلَمْ)﴾

(اللَّوح)=(اللَّوْحُ الْمَحْفُوظ)=(أُمُّ الْكِتَاب) ئەو تەختەیە: کە خوای گەورە ئەندازەی هەموو بوونەوەرێکی تێدا نووسیوە، پێش ئەوەی ئاسمانو زەمین دروست بکا. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَجِيدٌ فِي لَوْحٍ مَحْفُوظٍ﴾ البروج:٢١و٢٢، بەڵکو ئەم قورئانە بەرزو بەڕێزەو لە لەوحێکی پارێزراودایە. هەروەها ئەفەرموێ: ﴿يَمْحُو اللهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِنْدَهُ أُمُّ الْكِتَابِ﴾ الرعد:٣٩. خوای گەورە هەرچی بە خۆی حەز بکا ئەیسڕێتەوەو هەرچی بە خۆی حەز بکا ئەیهێڵێتەوە، (أُمُّ الْكِتَاب)=(اللَّوْحُ الْمَحْفُوظ) لە لای خۆیەتی.

(الْقَلَمْ) ئەو پێنووسەیە: کە خوای گەورە هەموو شتێکی لە (اللَّوْحُ الْمَحْفُوظ)دا پێ نووسیوە ﴿عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: أَوَّلُ مَا خَلَقَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى الْقَلَمُ، فَقَالَ لَهُ أُكْتُبْ. قَالَ: يارَبِّ وَمَا أَكْتُبُ؟ قَالَ: أُكْتُبْ مَقَادِيرَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ﴾ حديث صحيح رواه أبوداود، یەکەم شت کە خوا دروستی کرد، (قَلَمْ)=پێنووس بوو، ئینجا پێی فەرموو: بنووسە. (قَلَمْ) گوتی: خوایە چی بنووسم؟ فەرمووی: ئەندازەی هەموو شتێك بنووسە تا دونیا وێران ئەبێ ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عَمْرو رضي الله عنهما: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: كَتَبَ اللهُ مَقَادِيرَ الْخَلاَئِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ رواهُ مُسْلِم، خوای‌گەورە ئەندازەی هەموو بوونەوەرێکی لە (لَوْح)دا نووسیوە، پێش ئەوەی ئاسمانو زەمین دروست بکا بە پەنجا هەزار ساڵ.

ئینجا بزانە: (قَلَمْ) دوو جۆرە، یەکەم: (قَلَمُ الْوَحِي) پێنوسی ئەو فریشتانەی خوا فەرمانیان پێ ئەکا: کاروباری خەڵك هەڵسوڕێنن، واتە: بەم پێنووسە ئەو کاروبارانە ئەنوسرێ، پێغەمبەر ﷺ لە شەوی (مِعْرَاج) گوێی لە دەنگی ئەم پێنووسانە بوو.

وَنُؤْمِنُ بِاللَّوْحِ وَالْقَلَمِ وَبِجَمِيعِ مَا فِيهِ قَدْ رُقِمَ، فَلَوْ اِجْتَمَعَ الْخَلْقُ كُلُّهُمْ عَلَى شَيْءٍ كَتَبَهُ اللهُ تَعَالَىٰ فِيهِ: إِنَّهُ كَائِنٌ، لِيَجْعَلُوهُ غَيْرَ كَائِنٍ لَمْ يَقْدِرُوا عَلَيْهِ، وَلَوْ اِجْتَمَعُوا كُلُّهُمْ عَلَى شَيْءٍ لَمْ يَكْتُبْهُ اللهُ تَعَالَى فِيهِ لِيَجْعَلُوهُ كَائِناً لَمْ يَقْدِرُوا عَلَيْهِ، جَفَّ الْقَلَمُ بِمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَا أَخْطَأَ الْعَبْدَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَهُ وَمَا أَصَابَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَهُ.

---

دووهم: (قَلَمُ المَقادير) پێنووسی ئەندازەكان، ئەمەیان چوار بەشە:

١-(قَلَمُ اللّوْح) ئەو پێنووسەی لە (اللّوْحُ المَحْفُوظ)دا هەموو شتێكی پێنووسراوە، وەك باسمان كرد.

٢-(قَلَمُ آدَمْ) ئەو پێنووسەی لە دوای دروستكردنی باب ئادەم-لە ڕۆژی (قَالُوا بَلَى)- گشت بەسەرهاتی ئادەمیزادانی پێنووسراوە.

٣-(قَلَمُ الجَنين) ئەو پێنوسەی بەسەرهاتی كۆرپەی ناو زگ، لە ناو زگی دایكیدا ئەنووسێ.

٤-(قَلَمُ الكِرامُ الكاتِبين) ئەو پێنوسەی دراوەتە دەست فریشتەكانی ڕاستەو چەپەی ئادەمیزادو، كردەوەكانی ئەنووسن. بڕوانە (شرح الطحاوية) ل٣٤٨ ب٢.

ئیمامی (الطّحاوی) ئەفەرموێ:

(وَنُؤْمِنُ بِاللَّوْحِ وَالْقَلَمِ) باوەڕمان هەیە بە (لَوْح)و (قَلَمْ) (وَبِجَمِيعِ مَا فِيهِ قَدْ رُقِمَ) باوەڕمان هەیە بە گشت ئەو شتەی لە (لَوْح)دا نووسراوە (فَلَوْ اِجْتَمَعَ الْخَلْقُ كُلُّهُمْ) ئەگەر هەموو خەڵك كۆببوونەوە بكەن (عَلَى شَيْءٍ كَتَبَهُ اللهُ تَعَالَىٰ فِيهِ إِنَّهُ كَائِنٌ) لە سەر شتێك كە خوا لە (لَوْح)دا نووسیویەتی ببێ (لِيَجْعَلُوهُ غَيْرَ كَائِنٍ) تاكو وای لێبكەن نەبێ (لَمْ يَقْدِرُوا عَلَيْهِ) ناتوانن وابكەن (وَلَوْ اِجْتَمَعُوا كُلُّهُمْ) ئەگەر هەموویشیان كۆببوونەوە بكەن (عَلَى شَيْءٍ كَتَبَهُ اللهُ تَعَالَى فِيهِ أَنَّهُ غَيْرُ كَائِنٍ) لەسەر شتێك كە خوا لە (لَوْح)دا نووسیویەتی نەبێ (لِيَجْعَلُوهُ كَائِناً) تاكو وای لێ بكەن ببێ (لَمْ يَقْدِرُوا عَلَيْهِ) ناتوانن وابكەن (جَفَّ الْقَلَمُ بِمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ) هەرچی ڕووئەدا تا ڕۆژی قیامەت نووسراوەو ووشك بۆتەوە، واتە: كۆتایی پێ هاتووەو دەستكاری ناكرێ.

(وَمَا أَخْطَأَ الْعَبْدَ) ئەو شتەی ناگاتە بەندەو تووشی نابێ (لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَهُ) هەر لە (أزَل)دا نەنووسراوە بۆی ببێ (وَمَا أَصَابَهُ) ئەو شتەی بۆ ئەبێ‌و ئەیگاتێ (لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَهُ) هەر لە (أزَل)دا نەنووسراوە بۆی نەبێ ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: اعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَوِ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ لَكَ، وَإِنِ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ عَلَيْكَ، رُفِعَتِ الأَقْلامُ وَجَفَّتِ الصُّحُفُ﴾ رواه الترمذي وقال: حسن صحيح، بزانە: ئەگەر هەموو خەڵك كۆ ببێتەوە تاكو سوودێكت پێ بگەیەنن، ناتوانن سودت پێ بگەیەنن، تەنها ئەوەندە نەبێ: كە خوا بۆی نووسیوی، وە ئەگەر هەموویان كۆببنەوە تاكو زیانێكت لێبدەن،

وَعَلَى الْعَبْدِ أَنْ يَعْلَمَ أَنَّ اللهَ قَدْ سَبَقَ عِلْمُهُ فِي كُلِّ كَائِنٍ مِنْ خَلْقِهِ، فَقَدَّرَ ذَلِكَ تَقْدِيراً مُحْكَماً مُبْرَماً، لَيْسَ فِيهِ نَاقِضٌ وَلاَ مُعَقِّبٌ وَلاَ مُزِيلٌ وَلاَ مُغَيِّرٌ وَلاَ نَاقِصٌ وَلاَ زَائِدٌ مِنْ خَلْقِهِ فِي سَمَاوَاتِهِ وَأَرْضِهِ، وَذَلِكَ مِنْ عَقْدِ الإِيمَانِ وَأُصُولِ الْمَعْرِفَةِ وَالإِعْتِرَافِ بِتَوْحِيدِ اللهِ تَعَالَى وَبِرُبُوبِيَّتِهِ، كَمَا قَالَ تَعَالَى فِي كِتَابِهِ: [وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً]. وَقَالَ تَعَالَى: [وَكَانَ أَمْرُ اللهِ قَدَراً مَقْدُوراً].

---

ناتوانن زیانت لێبدەن، تەنها ئەوەندە نەبێ: کە خوا لە سەری نووسیوی، پێنووسەکان هەڵگیراونەوەو نووسراوەکانیش ووشك بونەوە. واتە: کارەکان کۆتایی هاتووەو بڕیارەکە بڕاوەتەوەو هیچ گۆڕانێك ڕوونادا.

(وَعَلَى الْعَبْدِ أَنْ يَعْلَمَ) لە سەر بەندە واجبە: بزانێ (أَنَّ اللهَ قَدْ سَبَقَ عِلْمُهُ فِي كُلِّ كَائِنٍ مِنْ خَلْقِهِ) خوای گەورە لە ڕابردووی (أزل)دا زانستی هەبووە: دەربارەی هەموو ڕووداوێکی دروستکراوی خۆی (فَقَدَّرَ ذَلِكَ تَقْدِيراً مُحْكَماً مُبْرَماً) ئەندازەی هەموو شتێکی داناوە، بە ئەندازەیەکی پتەوو بڕیاردراو (لَيْسَ فِيهِ نَاقِضٌ) کەس نیە (قدر) واتە: ئەندازەی خوا هەڵبوەشێنێتەوە (وَلاَ مُعَقِّبٌ) کەس نیە دوای بخا (وَلاَ مُزِيلٌ) کەس نیە لای ببا (وَلاَ مُغَيِّرٌ) کەس نیە بیگۆڕێ (وَلاَ مُحَوِّلٌ) کەس نیە بیباتە لایەکیتر (وَلاَ نَاقِصٌ وَلاَ زَائِدٌ) کەس نیە کەمی بکاو زیادی بکا (مِنْ خَلْقِهِ فِي سَمَاوَاتِهِ وَأَرْضِهِ) لە دروستکراوی خۆی، جا لە ئاسمانەکان بێ، یان لە زەوی.

(وَذَلِكَ) باوەڕ بە قەزاو قەدەرو زانستی (أزل)ی خوا (مِنْ عَقْدِ الإِيمَانِ) بەشێکە لە پتەو کردنو بەستنی ئیمان (وَأُصُولِ الْمَعْرِفَةِ) بەشێکە لە بنچینەی ناسینی خوا (وَالإِعْتِرَافِ بِتَوْحِيدِ اللهِ تَعَالَى وَبِرُبُوبِيَّتِهِ) بەشێکە لە دانهێنان: بە تاكو تەنیایی خواو پەروەردگاریەتی خوا (كَمَا قَالَ تَعَالَى فِي كِتَابِهِ) هەروەکو خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً﴾ الفرقان:٢، خوای گەورە هەموو شتێکی دروست کردووەو ئەندازەشی بۆ داناوە. (وَقَالَ تَعَالَى) هەروەها خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَكَانَ أَمْرُ اللهِ قَدَراً مَقْدُوراً﴾ الأحزاب:٣٨، کاروباری خوا ئەندازەی بۆ داندراوەو بڕیارەکە بڕاوەتەوە. هەروەها پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿الإِيمَانُ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم واللَّفظُ لهُ، ئیمان ئەوەیە: باوەڕ ت هەبێ: بە خواو مەلائیکەی خواو کتێبەکانی خواو پێغەمبەرانی خواو ڕۆژی دواییو قەزاو قەدەر: چاکەو خراپەکەی.

ئینجا بزانە: (قَدَرِيَّة) کە گرۆهێکی (أَهْل البِدْعَة وَالضَّلاَلَة)ن، باوەڕیان بە قەزاو قەدەر نیەو ئەڵێن: خوای گەورە لە (أزل)دا ئەندازەی دانەناوەو بڕیاری نەداوەو نەیزانیوە: ئەم بوونەوەرە چی بەسەر دێو چی ڕوو ئەدا، واتە: تا شت ڕوونەدا، خوا نایزانێ، لە دوای

فَوَيْلٌ لِمَنْ صَارَ لله تَعَالَى فِي الْقَدَرِ خَصِيماً، وَأَحْضَرَ لِلنَّظَرِ فِيهِ قَلْبَاً سَقِيماً، لَقَدْ إِلْتَمَسَ بِوَهْمِهِ فِي فَحْصِ الْغَيْبِ سِرّاً كَتِيماً، وَعَادَ بِمَا قَالَ فِيهِ أَفَّاكَاً أَثِيماً.

---

ڕوودان ئەیزانێ. هەروەها ئەڵێن: چاکە لە لای خواوەیەو خراپە لە لای بەندەوەیە. بەڵام (أهل السنّة) ئەڵێن: چاکەو خراپە هەردووکی دروستکراوی خوایەو کردەوەی بەندەیە، بڕوانە (شرح صحیح مسلم) ل١٩٨و ١٩٩ ب١.

(فَوَيْلٌ لِمَنْ صَاعَ لَهُ فِي الْقَدَرِ قَلْبَاً سَقِيماً) بەدبەختی بۆ ئەو کەسەی لە دەستی چووە لە باسی قەزاو قەدەر، دڵێکی نەخۆش و کەم باوەڕ (وَيلٌ لِمَنْ صَارَ للهِ تَعَالَى فِي الْقَدَرِ خَصِيماً) قوڕ بەسەر ئەو کەسەی ململانێ لەگەڵ خوا ئەکا: دەربارەی قەزاو قەدەر (لَقَدْ إِلْتَمَسَ بِوَهْمِهِ فِي فَحْصِ الْغَيْبِ سِرّاً كَتِيماً) بە خەیاڵی خۆی-لە لێکۆڵینەوەی زانستی نادیار- داوای نهێنییەکی شاردراوە ئەکا، کە بیزانێ (وَعَادَ بِمَا قَالَ فِيهِ أَفَّاكاً أَثِيماً) ناچار لەو سەر ئەگەڕێتەوە: هەرچی دەربارەی (قَدَر) گوتبێتی بە درۆزن و تاوانبار دائەندرێ، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ فَلاَ يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا، إِلاَّ مَنْ ارْتَضَى مِنْ رَسُولٍ﴾ الجن:٢٦-٢٧، خوای گەورە زانای زانستی نادیارەو هیچ کەسێك شارەزای نادیاری خۆی ناکا، تەنها ئەو پێغەمبەرە نەبێ: کە خۆی هەڵیئەبژێرێو پێی ڕازییە زانستی نادیاری بداتێ، کەوابوو: لە نادیارو قەزاو قەدەر مەکۆڵەوە.

## ﴿ باسی (عَرْش)و (کُرْسی) ﴾

١-(العَرْش) دروستکراوێکی خوایە پێچکەی هەیەو لە تێکڕای کورسیو ئاسمانەکانو زەمین گەورەترەو خوای گەورە لە سەرەوەی ئاسمانەکان لە سەر ئاو دایناوەو هەشت (مَلائكَة) هەڵیئەگرن. ئیتر هەر خوا ئەزانێ: شێوەی (عَرْش) چۆنە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ﴾ هود:٧، پێغەمبەرﷺ لە تەفسیری ئەم ئایەتە ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ خَلَقَ عَرْشَهُ عَلَى الْمَاءِ﴾ رواهُ أحمد والترمذي بسند حسن، خوا (عَرْش)ی خۆی لە سەر ئاو دروست کرد. کەواتە: ئێستاش هەر لە سەر ئاوە (فتح الباري) ل٤٩٩و ٥٠٥ ب١٣و (إرشاد الساري) ل٢٨٩ ب٥.

هەروەها خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذ ثَمَانِيَةٌ﴾ الحاقة:١٧، لە سەرەوەی فریشتەکان-لەو ڕۆژەدا- هەشت فریشتە (عَرْش)ی خوا هەڵئەگرن. کەواتە: بەم فریشتانە ئەگوترێ (حَمَلَةُ العَرْش). هەروەها پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿فَإِنَّ النَّاسَ يَصْعَقُونَ فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يُفِيقُ، فَإِذَا أَنا بِمُوسَى آخِذٌ بِقائِمَةٍ مِنْ قَوائِمِ الْعَرْشِ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، خەڵك بە هۆی (نَفْخُ الصُّور) لە هۆش خۆی ئەچێ، ئینجا من پێش هەموو کەس بە هۆش دێمەوە، کە تەماشا ئەکەم (مُوسَى) پێغەمبەرﷺ خۆی بە پێچکەیەکی (عَرْش) گرتوە.

وَالْعَرْشُ وَالْكُرْسِيُّ حَقٌّ، وَهُوَ مُسْتَغْنٍ عَنِ الْعَرْشِ وَمَا دُونَهُ، مُحِيطٌ بِكُلِّ شَيْءٍ وَفَوْقَهُ، وَقَدْ أَعْجَزَ عَنِ الإِحَاطَةِ خَلْقَهُ.

---

هەروەها خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ التوبة:١٢٩، خوا خاوەنی (عَرْش)ی گەورەیە. قازی (بَيْضاوي) لە تەفسیری ئەم ئایەتەو ئایەتی ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ الأعراف:٥٤، ئەفەرموێ: بڕیارو فەرمانیخوا لە (عَرْش) دێنە خوارەوە. (أنوار التنزيل) ل٢٠٨و ٢٧٢ بهامش المصحف. واتە: (عَرْش) مەڵبەندی دەرچوونی بڕیاردانی کاروباری بوونەوەرە، چونکە خوای گەورە هەر لە دوای ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ ئەفەرموێ: ﴿يُدَبِّرُ الأَمْرَ﴾ يونس:٣، خوا کاروباری بوونەوەر ڕێك ئەخا. بڕوانە بەڵگەی (٥)ی (مُجَسِّمَة)و (جَهْمِيَّة) لەم کتێبەدا، کەواتە: (عَرْش) بارەگای زاتی خوا نیە، هەروەکو (مُجَسِّمَة)و (جَهْمِيَّة) وا ئەڵێنو لەمەو دوا باسی ئەکەین، إِنْ شاءَ اللهُ تَعالَى.

٢-(الكُرْسِيّ) دروستکراوێکی خوایە، ئەکەوێتە بن (عَرْش)ی خولو لە تێکڕای ئاسمانەکانو زەمین گەورەترە. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ البقرة:٢٥٥. کورسیی خوا بەرفراوانی بۆ ئاسمانەکانو زەمین بوو. بڕوانە (فتح الباري) ل٥٠٦ ب١٣.

ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(وَالْعَرْشُ وَالْكُرْسِيُّ حَقٌّ) هەبوونی عەرشو کورسی ڕاستەو باوەڕمان پێیان هەیە (وَهُوَ) خوای گەورە (مُسْتَغْنٍ عَنِ الْعَرْشِ) پێویستی بە (عَرْش) نیە لە سەری جێگیربێ، هەروەکو (مُجَسِّمَة) وا ئەڵێن (وَمَا دُونَهُ) هەروەها پێویستی بەو شوێنەش نیە-کە لە (عَرْش) بەرەو خوارترە- تێیدا نیشتەجێ بێ، هەروەکو (جَهْمِيَّة) وا ئەڵێن، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَإِنَّ اللهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ﴾ آل عمران:٩٧، خوای گەورە دەوڵەمەندە پێویستی بە هیچ بوونەوەرێك نیە. (مُحِيطٌ بِكُلِّ شَيْءٍ) خوای گەورە دەورەی لە هەموو شتێك داوە بە (عِلْم) زانستی خۆی، هەروەکو ئەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ اللهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾الطلاق:١٢، خوای گەورە دەورەی لە هەموو شتێك داوە لە ڕووی زانستەوە، واتە: نەك بە زاتی خۆی.

(وَفَوْقَهُ) خوای گەورە لە سەرەوەی هەموو شتێکە: بە (قُدْرَة) دەسەڵاتی خۆی، نەك بە زاتی خۆی، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ﴾ الأنعام:١٨، خوای گەورە زاڵو بە دەسەڵاتە لەسەرەوەی دەسەڵاتی بەندەکانی (وَقَدْ أَعْجَزَ عَنِ الإِحَاطَةِ خَلْقَهُ) خوای گەورە خەڵکی بێتوانا کردوە: لە ناسینی تەواوی خوا، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلاَ يُحِيطُونَ بِهِ عِلْمًا﴾ طه:١١٠، بە هیچ زانستێك دەورە لە خوا نادەن. کەواتە: کەس نازانێ خوا چۆنەو چی ئەکا، هەر بە خۆی ئەزانێ زاتی خۆی چۆنە.

## ﴿ خوای گەورە لە هیچ شوێنێك جێگیر نیە ﴾

بزانە: کە ئیمامی (الطّحاوی) ئەفەرموێ: (وَهُوَ مُستَغنٍ عَنِ العَرْشِ) خوا پێویستی بە (عَرْش) نیە. مەبەستی ئەوەیە (أهل السّنّة والجَماعة) چینی (سَلَف)و (خَلَف) یەکدەنگن: کە خوای گەورە نە لە سەر (عَرْش)و نە لە هیچ شوێنێکیتر جێگیرو نیشتەجێ نیە.

ئیمامی (علی) ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذی أَیَّنَ الأیْنَ، لاَ یُقالُ لَهُ: أَیـــنَ؟﴾ ئەو خوایەی شوێنی کردۆتە شوێن، پرسیاری شوێن (لە کوێیە)ی بۆ ناگوترێ. واتە: چونکە خوای گەورە لە (أزَل)دا تەنها بەخۆی هەبو، شوێنی نەبو، کەواتە: لە دوای دروستکردنی شوێنیش پێویستی بە شوێن نیەو نابێ لە سیفەتە (أزَلیَـة)کەی خۆی بگۆڕێ. بڕوانە (الکَوْکَبُ الأزْهَر شَرْح الفقه الأکبَر، للإمام الشافعی) ل٦٧،٦٩.

(إبنْ حَجَر العَسْقَلاَنی) لە (إبْن بَطال) ئەگێڕێتەوە: خوای گەورە (جِسْم) لاشە نیە، کەوابوو: پێویستی بە شوێن نیە: تێیدا جێگیر بێ، بێگومان خوا لە (أزَل)دا هەبو، شوێنیشی نەبو، (فتح الباري) ل٥١٢ ب١٢.

ئیمامی (الطّحاوی) ئەفەرموێ: (لاَ تَحْویهِ الْجِهاتُ السِّتُ کَسائِرِ الْمُبْتَدَعات) شەش لایەکان خوای گەورە وە ناوەخۆ ناگرن وەکو شتە دروستکراوەکان، بگەڕێوە باسی (خوا پێویستی بە شوێن نیە).

ئینجا بزانە: (مُجَسِّمَة)و (مُشَبِّهَة) -کە دوو کۆمەڵی (أهْل البِدْعَة)ن- ئەڵێن: خوا لە سەر (عَرْش) جێگیرە، هەروەها (جَهْمیَّة)-کە کۆمەڵێکیتری (أهْل البِدْعَـة)ن- ئەڵێن: خوا بە زاتی خۆی لە هەموو شوێنێکە، واتە: لە سەر (عَرْشُ)و لە ئاسمانو لە زەمینە. بڕوانە (الإعْتِقاد) ل١١٤و (شَرْح المَواقف) ل٤٩٢ ب٢.

دیسان بزانە: ئەو باوەڕە: کە دەڵێن: خوا لە سەر (عَرْش) جێگیرە. لە جولەکە وەرگیراوە، هەروەك (إبنْ حَجَر العَسْقَلاَنی) ئەفەرموێ: جولەکە (مُشَبِّهَة)نەو باوەڕیان بە (تَجْسیم) هەیەو باوەڕیان وایە: خوا لاشەیەو ئەندامی هەنە، (مُشَبِّهَة) توندڕەوەکانی ئەم ئوممەتەش ئەو باوەڕەیان هەیە، بڕوانە (فتح الباري شرح البخاري) ل٤٩٠و٤٩١ ب١٢.

هەروەها زانایانی (تَفسیر) دەفەرموون: (جولەکە دەڵێن: خوا لە ڕۆژی یەك شەممە دەستی بە دروستکردنی ئاسمانو زەمین کردو لە ڕۆژی هەینیدا تەواوی کردن، ئینجا لە ڕۆژی شەممەدا حەساوەو لەسەر (عَرْش) پاڵی داوە). ئینجا خوای گەورە ڕەددی جولەکەکانی داوەتەوەو ئەم ئایەتەی ناردۆتە خوارەوە: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَیْنَهُمَا فِی سِتَّةِ أَیَّـامٍ وَمَا مَسَّنَا مِنْ لُغُوبٍ﴾ ق:٣٨، واتە: ئاسمانەکانو زەمینو ئەوەی نێوانیان ئێمە لە شەش ڕۆژدا دروستمان کردنو هیچ ماندووبوونیشمان نەگەیشتێ. بڕوانە (تَفْسیر رُوح المَعانی) ل١٩٢ ب٢٦و(التَفْسیر الکَبیر) ل١٨٤ ب٢٨.

ئینجا (أهل السّنّة) كە ئەڵێن: خوا لە هیچ شوێنێك جێگیر نیە، بۆ دەمكوتكردنی ئەم سێ كۆمەڵانە، ئەم بەڵگانە ئەهێننەوە:

**یەكەم:** خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿قُلْ اللهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ الرعد:١٦، خوا دروستكەری هەموو شتێكە. ﴿خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ الأنعام:١، خوا ئاسمانەكانو زەمینی دروست كردوە. پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿كَانَ اللهُ وَلَمْ يَكُن شَيْءٌ غَيْرُهُ﴾ رواه البخاري في بدأ الخلق، خوا لە (أزل)دا هەبو، جگە لە خۆی هیچ شتێكی تر نەبو. هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ خَلَقَ عَرْشَهُ عَلَى الْمَاءِ﴾ رواه أحمد والترمذي بسند حسن، ئینجا خوا (عَرْش)ی خۆی لە سەر ئاو دروست كرد. لەم ئایەتو حەدیسانەدا بۆمان ئاشكرا بوو: لە (أزل)دا تەنها هەر خوا هەبو، واتە: نە (عَرْش)و نە ئاسمانو نە زەمینو نە هیچ شتێكیتر نەبو، تا بڵێین: خوا لە سەری جێگیر بوو، یان تیایدا نیشتەجێ بوو، شتێكی ئاشكراشە: واجبە خوا بە زاتو سیفەتەوە (أزلی)و (أبدی)بێ، جا ئەگەر لە دوای دروستكردنی ئەم شوێنانە لە شوێنێك جێگیر بێ، سیفەتێكی (أزل)ی نامێنی: كە (غنی)یە، واتە: پێویست نەبوونە. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَإِنَّ اللهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ﴾ آل عمران:٩٧، خوا پێویستی بە هیچ بوونەوەرێك نیە.

ئیمامی (علیؓ) ئەفەرموێ: ﴿كَانَ اللهُ وَلاَ مَكَانَ، فَهُوَ عَلَى مَا كَانَ قَبْلَ خَلْقِ الْمَكَانِ لَمْ يَتَغَيَّر عَمَّا كَانَ﴾ نقله النسفي في تفسير سورة (طه) الآية:٥، واتە: خوای گەورە لە (أزل)دا هەبو، هیچ شوێنی نەبو، ئێستاش هەر لە سەر سیفەتەكەی خۆیەتی–كە لە پێش دروستكردنی شوێندا هەیبو– خوای گەورە لە سیفەتی (أزلیـة)ی خۆی نەگۆڕاوە، تا بڵێین: ئێستا شوێنی هەیە! بڕوانە (مَدارِكُ التَّنْزيل) ل٤٨ ب٢.

(عَبدُالرحيم)ی مەولەوی، دەربارەی (أزَلِيَّة)ی خوای گەورە ئەفەرموێ:

(وَكانَ آنْ كانَ كانَ لَيْسَا ثَوَى بِحَيْثُ لَيْسَ حَيْثُ أيْسَا).

خوا لە (أزل)دا هەبو، كاتی (بوو) نەبو–چونكە هیچ شتێك نەبو– هەبوونی خوا بە زاتی خۆیەوە ڕاوەستاوە، بە شێوەیەكی وەها: چۆنیەتی نیە (شَرْح الفَضيلَة) ل١٥.

**دووەم:** پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إهْتَزَّ عَرْشُ الرَّحْمَنِ لِمَوْتِ سَعْدِ بنِ مُعَاذٍ﴾ رواه البخاري ومسلم، (عَرْش)ی خوا هاتە هەژان لەبەر مردنی سەعدی كوڕی موعاز. جا ئەگەر خوای گەورە لە سەر (عَرْش) بێ، ئەویش لەگەڵ هەژانی (عَرْش) ئەهەژێتەوە، ئاشكراشە: هەژان بۆ خوا، كەمیو ناتەواویە، خوای گەورەش پاكە: لە هەموو كەمیو ناتەواویەك، كەوابوو: ئەم سیفەتە ناتەواوە بۆ خوا بەكار نایێو ئەڵێین: خوا لە سەر (عَرْش) جێگیر نیە، هەروەكو پێش دروستكردنی (عَرْش) لە هیچ شوێنێك جێگیر نەبو، چونكە شوێن نەبو.

**سێیەم:** بە ئایەتو حەدیس سەلماندمان: کە (عَرش) لە سەر ئاوەو هەشت (مَلائکة) هەڵیانگرن، جا ئەگەر بێتو بڵێین: خوا لە سەر (عَرْش) جێگیرە. ئەبێ بۆمان دروست بێ بڵێین: خوا لە سەر ئاوەو خوا لە سەر شانی هەشت (مَلائکَة)یە. ئەوەش زۆر دژایەتی لەگەڵ گەورەیی خوا هەیە: کە (هەڵگیراوی هەڵگیراوێکیتر بێ) چونکە هەموو هەڵگیراوێك پێویستی بە هەڵگرێك هەیە، بەڵام خوای گەورە پێویستی بە هیچ دروستکراوێکی خۆی نیە، چونکە خودا لە (أزَل)دا هەبو، نە (عَرْش) هەبو، نە ئاو هەبو، نە (مَلائکَة) هەبو...هتد: کەوابوو: هەروەکو لە (أزَل)دا-پێش دروستکردنی (عَرْش)- لە هیچ شوێنێك نەبو، ئێستاش لە دوای دروستکردنی (عَرْش) لە (أزَلیة)ی خۆی نەگۆڕاوەو نە لە سەر (عَرْش)و نە لە شوێنێکیتر نیشتەجێ نیە.

## ﴿وەڵامی بەڵگەکانی (مُجسِّمَة)و (جَهْمِیَّة)﴾

بزانە: (مُجَسِّمَة)و (مُشَبِّهَة) کە ئەڵێن: خوا لە سەر (عَرْش)و، (جَهْمِیَّة) کە ئەڵێن: خوا لە هەموو شوێنێکە، لە چەند ئایەتو حەدیسدا بە هەڵەدا چونەوەو کردونیانە بەڵگەی خۆیان، بۆ نموونە:

١- ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ طه:٥، هەرسێك گرۆهەکان ئەڵێن: خوا لە سەر (عَرْش) جێگیر بوو. چونکە (إسْتَوَى) واتە: جێگیر بوو.

**وەڵام:** (أهل السنّة) ئەڵێن: دروست نیە ئەم واتەیە بۆ خوا بە کار بێ، چونکە وشەی (إسْتَوَى) بە (فِعْلُ الْماضي) پانزە جار لە قورئاندا هاتوە، بە واتەی جۆراوجۆر:

- بە واتەی ویستنو ڕووتێ کردن: وەکو ﴿اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ﴾ البقرة:٢٩ و فصلت:١١ خوا ڕووی کردە ئاسمانو ویستی دروستی بکا.
- بە واتەی تەواوبوونو کامڵبوون: وەکو ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَاسْتَوَى﴾ القصص:١٤ لەو کاتەی موسی پێغەمبەرﷺ کامڵ بوو و چل ساڵی تەواو کرد.
- بە واتەی ڕاست ڕاوەستان: وەکو ﴿ذُو مِرَّةٍ فَاسْتَوَى﴾ النجم:٦، حەزرەتی جوبرائیل شێوەی جوانەو ڕاست ڕاوەستا ﴿فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ﴾ الفتح:٢٩، کشتوکاڵەکە ئەستوور بوو، لە سەر قامیشەکەی خۆی ڕاوەستا.
- بە واتەی جێگیر بوون: وەکو ﴿وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ﴾ هود:٤٤، کەشتی نوح پێغەمبەرﷺ لە سەر کێوی جودی جێگیر بوو ﴿إِذَا اسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ﴾ زخرف:١٣، کاتی لە سەر پشتی وڵاغ جێگیر بوون. ﴿فَإِذَا اسْتَوَيْتَ أَنْتَ وَمَنْ مَعَكَ عَلَى الْفُلْكِ﴾ المؤمنون:٢٨، کاتێ خۆتو ئەوانەی لەگەڵتان لە سەر کەشتی جێگیر بوون.

➢ حەفت جاریتریش بۆ خوای گەورە بەکار هاتوە ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ طه:٥و ﴿اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ الأعراف:٥٤و یونس:٣و الرعد:٢و الفرقان:٥٩و السجده:٤و الحدید:٤. ئینجا لەبەر ئەوەی وشەی (إسْتَوی) بەم چوار واتایە هاتوە، نابێتە بەڵگە، چونکە ناگونجێ: ئەم چوار واتەیە لەم حەوت ئایەتەدا بۆ خوا بەکار بێ، کەوابوو: رای (أهل السّنّة) بەم جۆرەیە:

﴿عَنْ مُجاهِدٍ: إسْتَوَى: عَلاَ عَلَى الْعَرْشِ﴾ رواه البخاري، واتە: خوا بەرز بوو لە سەر (عَرْش). جا بزانە: مەبەست: بەرزی پلەو پایەیە، نەك بەرزی لاشە، چونکە (إبنْ حَجَر العَسْقَلاني) لە شەرحی ئەم حەدیسەدا ئەفەرموێ (إبْن بطّال) فەرموویەتی: گوتەی (مُجَسِّمَة)–کە ئەڵێن: جێگیر بوو– پووچەڵە، چونکە جێگیربوون بۆ (جِسْم) لاشە بەکار دێ. ئینجا ئەفەرموێ: بەڵام (إسْتَوَى) بە واتەی بەرز بوو: راستەو فەرموودەی (أهل السّنّة)یە، چونکە خوایگەورە مەدحی خۆی بە بەرزی کردوەو ئەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ یونس:١٨، خوا پاکەو بەرزە لەو هاوبەشەی بۆی دادەنێن. کەوابوو: (إسْتَوَى) سیفەتێکی زاتی خوایە. (فتح الباري شرح البخاري) ل٥٠٠ ب١٣.

هەروەها (إبن كَثِير) لە تەفسیری ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ ئەفەرموێ: لێرەدا ئێمە رارەوی (السَّلَف الصَّالح) ئەگرینە بەر: وەکو ئیمام (مالك)و (الأوزاعي)و (الثوري)و (الشافعي)و (أحمد)و (إسحق بن راهَوَيه)و چەندانیتریش لە پێشەوایانی موسوڵمانان لە کۆن و تازە، کە ئەڵێن: بەو جۆرەی هاتوە ئەیخوێنینەوە، بە بێچۆنیەتی و وێچواندن و لەکارخستن، هەروەها واتەی ئاشکرای بۆ خوا بەکار نایێ، چونکە هیچ شتێك وەکو خوا نیە. (تَفسير إبن كثير) ل٢٢٠ ب٢.

هەروەها قازی (البَيْضاوي) ئەفەرموێ: (إسْتَوَاء) لە لای هاورێیانی ئێمە–(أهل السّنّة)– سیفەتێکی خوایە بە بێچۆنیەتی. (أنوار التَّنْزيل) ل٢٠٨ بهامش المصحف.

بەڵگە لە سەر فەرموودەکانی (إبن حَجَر)و (إبن كَثير)و (البَيْضاوي) ئەمەیە: ئیمامی (علی)و (أُم سَلَمَة)و (رَبيعَة)و (مالك) فەرموویانە: ﴿الإسْتِواءُ مَعْلُومٌ وَالْكَيْفُ مَجْهُولٌ وَالإيمَانُ بِهِ واجِبٌ وَالسُّؤالُ عَنْهُ بِدْعَةٌ﴾ أخرَجَهُ اللالكائي والنسفي، واتە: زاندراوە: (إسْتَوَاء) سیفەتێکی خوایە، بەڵام چۆنیەتی نەزاندراوەو واجبە ئیمانمان پێی هەبێ، پرسیارکردن لە چۆنیەتی (إسْتَوَاء) بیدعەیە، بڕوانە (فتح الباري) ل٥٠١ ب١٣و (الإتقان) ل٦ ب٢و(مَدارك التَّنْزيل) ل٤٨ ب٣.

کەواتە: (إسْتَوَى عَلَى العَرْشِ) بە (مُتَشابِهاتُ القُرآن) داندراوە، هەروەك ئیمامی (شافعی) فەرموویەتی، کەوابوو: هەر خوا ئەزانێ: مەبەستی چییە، لێکۆڵینەوەو بە بەڵگە

.................................................
هێنانەوەی (إِسْتَوَى عَلَى الْعَرْش)، پیشەی (أَهْل البِدْعَة)یە، بۆ دڵنیایی بڕوانە (الكوكب الأزهر شرح الفقه الأكبر للإمام الشافعي) ل٦٨.

٢- خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿أَأَمِنتُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ﴾ الملك:١٦، ئایا ئێوە ئەمین بون لەو کەسەی لە ئاسمانە. ﴿عَنْ مُعَاوِيَةَ بنِ الْحَكَم: أنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَأَلَ الْجارِيَةَ: أَيْنَ اللهُ؟ قَالَتْ: فِي السَّمَاءِ. قَالَ: مَنْ أَنَا؟ قَالَتْ: أَنْتَ رَسُولُ الله. قَالَ: أَعْتِقْهَا فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ﴾ رواهُ مُسْلِم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی کەنیزە، خوا لە کوێیە؟ گوتی لە ئاسمانە. فەرمووی من کێم؟ گوتی: تۆ پێغەمبەری خوای ﷺ. فەرمووی: ئازادی بکە چونکە ئیماندارە.

(**جَهْمِيَّة**) ئەڵێن: (فِي السَّماء) واتە: خوا لە ناو ئاسمانە، چونکە پیتی (فِي) بۆ (ظَرْفِيَّة) -واتە: جێبوونەوەی شتێك لە ناو شتێکدا- بە کار دێ.

(**مُشَبِّهَة**)و (**مُجَسِّمَة**) ئەڵێن: ئەم جۆرە ئایەتو حەدیسانە ئەبێ (تَأوِيلْ) بکرێن، واتە: پیتی (فِي) بە واتەی (عَلَى) چوونە سەر، بەکار دێ. کەوابوو: خوا لە سەر ئاسمانەو مەبەستیش بە ئاسمان: لای سەرەوەیە. بەڵام (جَهْمِيَّة) بۆیان هەیە بڵێن: ئەی کاکی (مُجَسِّمَة)، خۆ ئێوە دژی (تَأوِيلْ)کردنن، ئەی بۆچی ئەم ئایەتو حەدیسە (تَأوِيلْ) ئەکەن؟ بەڵگەتان چی‌یە؟ یان بە چ بەڵگەیەك ئەڵێن: مەبەست بە ئاسمان (لای سەرەوەیە)؟ خۆ بە ئایەتو حەدیس سەلمێندراوە: کە حەوت ئاسمان هەنەو لە نێوان (عَرْش)و ئاسمانی حەوتەمدا ناو هەیەو (عَرْش)ی لە سەر داندراوەو هەر خوا ئەزانێ قووڵایی ئەم ناوەش چەندە؟ کەوابوو: (عَرْش)و ئاسمان زۆر لە یەکتری دوورن، بەڵام ئێوە لێتان تێکەڵ بووە، کەواتە: خوا لە ئاسمانو لە هەموو شوێنێکیترە.

(**أهل السنّة**) لە وەڵامی هەرسێك گرۆهەکەدا ئەڵێن: بە ئایەتو حەدیس سەلمێندراوە: خوا لە (أزَل)دا شوێنی نەبو، کەوابوو: ئێستاش پێویستی بە دروستکراوی خۆی نیە، تا لە سەری جێگیر بێ، یان تێیدا نیشتەجێ بێ، هەروەك لە بەڵگەی یەکەمی (أهل السنّة)دا روونمان کردەوە، کەوابوو: وەڵامی بەڵگەکەتان ئەمەیە:

ئیمامی (النوَوِي) لە شەرحی حەدیسەکەدا ئەفەرموێ: **رای یەکەم** ئەوەیە: باوەڕمان بەم حەدیسە هەبێو لە واتەی نەکۆڵینەوەو باوەڕیشمان وابێ: کە خوای گەورە پاکەو نیشانەی دروستکراوی لێ نایەتە جێ. **رای دووەم** ئەوەیە: (تَأوِيلْ) بکرێ: بە واتەیەکی وا: لە خوا بوەشێتەوە، کەواتە: مەبەست تاقیکردنەوەی (جَارِيَة)-کەنیزەکە بوو: ئایا یەکخواپەرستەو باوەڕی بەو خوایە هەیە: کە ئەگەر دوعاکەر لێی بپاڕێتەوە، ڕوو ئەکاتە ئاسمانو ئەگەر نوێژ کەر نوێژی بۆ بکا، ڕوو ئەکاتە (كَعْبَة)؟ واتە: ئەوەش لەبەر ئەوە نیە، کە خوا لە ناو ئاسماندابێ، هەروەکو خوا لە لای (كَعْبَة)ش نیە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە: ئاسمان قیبلەی

دوعایەو (کَعْبَة)ش قیبلەی نوێژە، ئینجا ئەفەرموێ: قازی (عَیاض) ئەفەرموێ: سەرجەمی زانایانی ئیسلام جیاوازیان لەوەدا نیە: کە ئەم جۆرە ئایەتو حەدیسانەی (فی‌السَّماء) وا ئەگەیەنن: خوا لە ئاسمانە لە سەر واتەی ئاشکرای‌خۆیان نینو (تَأْوِیلْ) کراون لە لای هەموویان. بڕوانە (شرح صحیح مسلم) ل۱۹۰و ۱۹۱ ب۳.

واتە: کە ئێمە لە نوێژدا ڕوو لە (کَعْبَة) قیبلە ئەکەینو لە دوای نوێژدابەستن ئەڵێین: ﴿وَجَّهْتُ وَجْهِي لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ﴾...هتد، ڕووی خۆم لەو خوایە کرد، کە ئاسمانەکانو زەمینی دروست کردوە. ئەو ئایەتو ئەو ڕووتێکردنە، وا ناگەیەنن: کە خوا لە (کَعْبَة)دایە، هەروەهاش: دەست بەرزکردنەوە بەرەو ئاسمان لە دوعادلو ئاماژەکردنی خەڵك بۆ ئاسمان، وا ناگەیەنن: کە خوا لە لای سەرەوەیە، هەروەها کە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ﴾ سوجدە ببەو لە خوا نزیك ببەوە. ئەوەش وا ناگەیەنێ: خوا لە شوێنی سوجدەکەدایە، بەڵکو مەبەست نزیکیی پلەو ڕێزدارییە.

﴿ ئاگاداری ﴾: (إبنْ حَجَر العَسْقَلانی) ئەفەرموێ: ئەگەر جولەکەیەك–کە باوەڕی بە (تَجْسِیمْ) هەیە– بڵێ: (لاإلهَ إلاالَّذِی فی‌السَّماء) شایەدی ئەدەم: هیچ خودایەك نیە جگە لەو خودایەی لە ئاسمانە، ئەوە نابێتە ئیماندار، بەڵام ئەگەر کەسێکی سادەو نەخوێندەوار–کە واتەی (تَجْسِیم) تێناگا– وا بڵێ: ئەوە بۆ وی بەسەو بە ئیماندار دائەندرێ، هەروەك لە حەدیسی (جَارِیَة)کەدا هاتوە: پێغەمبەرﷺ پرسیاری لێکرد: خوا لە کوێیە؟ گوتی: لە ئاسمانە...ئینجا ئەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ بڕیاری ئیمانی بۆ (جَارِیَة)کە دا، ئەوەکو وا تێبگا: خوا سیفەتی نینە، چونکە تێگەیشتنی کەم بوو دەربارەی بە پاکناسینی خوا، لە وێچواندن. بڕوانە (فتح الباري) ل٤٤٥و ٤٩٥ ب١٣.

(إبنْ حَجَر الهَیْتَمی) ئەفەرموێ: لە حەدیسی (جَارِیَة)کە وەرگیراوە: کە چاوپۆشی لە خەڵکی سادەو نەخوێندەوار ئەکرێ: ئەگەر لاشەو لایەك بۆ خوا دابنێن، چونکە لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕێکی پتەویان بە پاکیو تەواوی خوا هەیە. بڕوانە (تحفة المحتاج) ل٨٦ ب٩.

٣– پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿يَنْزِلُ اللهُ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا كُلَّ لَيْلَة،﴾...الحدیث رواهُ البخاري ومُسْلِم، (مُجَسِّمَة) ئەڵێن: (يَنْزِل الله) خوا دێتە خوارەوە، کەواتە: دیارە خوا لە سەرەوەیە. (جَهْمِیَّة) ئەڵێن: ئەم حەدیسە بەڵگەی ئێمەیە کە ئەڵێین: خوا لە هەموو شوێنێکە، چونکە لە حەدیسەکەدا ئەفەرموێ: ﴿إلَى السَّماءِ الدُّنْيا﴾ واتە: خوا دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی دونیا، کەواتە: خوا: لە سەر (عَرْش) جێگیر نیە، بەڵکو لە هەموو شوێنێکە. بەم جۆرە (جَهْمِیَّة) بەڵگەی (مُجَسِّمَة) پووچەڵ ئەکەنەوە.

وەلامی ( **أهل السنّة** ): ئیمامی (النووي) ئەفەرموێ: زانایان لەم حەدیسەدا دوو ڕاڕەویان هەیە، **یەکەم**: باوەڕمان هەبێ: کە (نُزُول) هاتنە خوارەوە سیفەتێکی خوایەو واتەی ئاشکرای (یَنْزِل) دێتە خوارەوە مەبەست نیەو باوەڕمان وایە خوا پاکە: لە جموجۆڵو گواستنەوە. **دووەم**: لە ئیمام (مالك)و (الأوْزاعي) گێڕدراوەتەوە: ئەبێ (تَأويلْ) بکرێ، جا ئیمامی (مالك) ئەفەرموێ: واتە: ڕەحمەتو فەرمانی خوا، یان (مَلاَئکَة)ی خوا دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی دونیا. (شرح صحيح مسلم) ل٢٦ ب٤.

(إبنْ حَجَر العَسْقَلاَني) لە ئیمامی (الدار قطني) ئەگێڕێتەوە: هاتنەخوارەوە بۆ خوا مەحاڵە، چونکە هاتنەخوارەوە جموجۆڵێکە لە سەرەوە بۆ خوارەوە، خوای گەورەش پاکە: لە جموجۆڵ کردن، کەوابوو: یان ئەبێ (تَأويلْ) بکرێ بە هاتنەخوارەوەی ڕەحمەتی خوا، یان–مەلائیکەی خوا– یان ئەبێ (تَفْويض) بکرێو باوەڕیشمان هەبێ: خوا پاکە (فتح الباري) ل١٥٦ ب١١.

واتەی (تَفْويض): (نُزُول) سیفەتێکی خوایەو هەر خوا ئەزانێ چۆنەو مەبەستی چییە، واتە: هاتنەخوارەوەی ڕاستەقینە مەبەست نیە.

٤– خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ﴾ الأنعام:١٨و ﴿يَخَافُونَ رَبَّهُمْ مِنْ فَوْقِهِمْ﴾ النحل:٥٠، ( **مُجَسِّمَة** ) ئەڵێن: ووشەی (فَوْق) بە واتەی لای سەرەوە هاتوە، کەوابوو: خوا لە سەر (عَرْش) جێگیرە، چونکە (عَرْش) لە لای سەرەوەیە. ( **جَهْمِيَة** ) ئەڵێن: ووشەی (فَوْق) بە واتەی لای سەرەوە هاتوە، جا هەر شوێنێك بێ، ولتە: سەریان لای سەرەوەیە، نێوان ئاسمانو زەمین لای سەرەوەیە، ئاسمان لای سەرەوەیە...هتد، کەوابوو: خوا لە هەموو شوێنێکە.

**وەلامی ( أهل السنّة ) ئەمەیە**: (إبنْ حَجَر العَسْقَلاَني) لە (الراغب) ئەگێڕێتەوە: ووشەی (فَوْق) بەکار دێ بۆ شوێن، بۆ کات، بۆ لاشە، بۆ ژمارە، بۆ پلەو پایە، بۆ زاڵبوون، جا لەم دوو ئایەتەدا بە واتەی شەشەم بەکار دێ، واتە: خوا زاڵە بە سەر دەسەلاتی بەندەکانیدا (فتح الباري) ل٥٠٨ ب١٣.

(جَلاَل الدين السيُوطي) ئەفەرموێ: (فَوْق) سیفەتێکی خوایەو مەبەست بەرزی پلەو پایەیە، نەك لای سەرەوە، هەروەك خوای گەورە لە زمانی (فِرْعَوْن) ئەگێڕێتەوەو ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّا فَوْقَهُمْ قَاهِرُونَ﴾ الأعراف:١٢٧، ئێمە بە سەر دەسەلاتی ئەواندا زاڵین. گومان نیە: (فِرْعَوْن) بە ووشەی (فَوْق) مەبەستی لای سەرەوە نەبو. (الإتقان) ل٨ ب٢. ولتە: خۆ (فِرْعَوْن) لە زەمینی (مصر) بوو، نەك لە ئاسمان، لەگەڵ ئەوەشدا ووشەی (فَوْق)ی بۆ بەکار هات بە ولتەی دەسەلاتو زاڵبوون.

٥- پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ لَمَّا قَضَى الْخَلْقَ كَتَبَ فِي كِتَابٍ-فَهُوَ عِنْدَهُ فَوْقَ الْعَرْشِ-: إِنَّ رَحْمَتِي سَبَقَتْ غَضَبِي﴾ رواهُ البخاري ومُسْلم، (مُجسِّمَة)و (جهْمِيَة) ئەڵێن: ڕستەی (عِنْدَهُ فَوْقَ الْعَرْشِ) واتە: لەلای خۆیەتی لە سەرەوەی (عَرْش)، کەوابوو: خوا لە سەر (عَرْش) جێگیرە.

وەلامی (أهل السنة): لە شەرحی ئەم حەدیسەدا (إبن حَجر العَسْقلاني) لە (إبن التين) ئەگێڕێتەوە: واتەی (عِنْدَهُ): زانستی نووسراوەکە لە لای خوایە، چونکە خوای گەورە، کە فەرمانی بە نووسین کردوە، بۆ ئەوە نەبو: تاکو لە بیری نەچێتەوە، بەڵکو لەبەر ئەو فریشتانە نووسیویەتی کە کاروباری خەڵکیان لە دەستە، ئینجا ئەفەرموێ: (فَوْقَ عَرْشِه) سیفەتی نووسراوەکەیە. (فتح الباري) ل٤٧٥و ٥٠٨ ب١٣.

واتە: (فَوْقَ الْعَرْش) لەم حەدیسەدا سیفەتی خوا نیە، خودی نووسراوەکەش لە لای خوا دانەندراوە، چونکە خوای گەورە پێویستی پێ نیەو پێش نووسینی ئەیزانی: چی لە نووسراوەکەدا تۆمار ئەکرێ، ئینجا کە نووسراوەکە تەواو بوو: لە سەر (عَرْش) داینا، تاکو فریشتەکان لەم بڕیارە ئاگادار بن‌و ڕەفتاری پێ بکەن، چونکە (عَرْش) مەڵبەندی کاروباری خوای گەورەیەو بڕیارەکانی خوا لەوێوە دێنە خوارەوە، هەروەکو (زَيْنَب) رضي الله عنها ئەفەرموێ: ﴿زَوَّجَنِي اللهُ تَعَالَى مِنْ فَوْقِ سَبْعِ سَمَاوَات﴾ رواهُ البخاري، خوا لە سەرەوەی حەوت ئاسمانەکان منی لە پێغەمبەرﷺ مارە کرد. واتە: خوا بڕیاری مارەبڕینی بۆ پێغەمبەرﷺ ناردە خوارەوە. بگەڕێوە باسی (عَرْش).

٦- خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَمَا كُنتُمْ﴾ الحديد:٤، ﴿لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللهَ مَعَنَا﴾ التوبة:٤٠ ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾ طه:٤٦، ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلاَئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ﴾ الأنفال:١٢، ﴿إِنَّ مَعِي رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾ الشعراء:٦٢، هەروەها پێغەمبەرﷺ ئەیفەرموو: ﴿اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالخَلِيفَةُ فِي الأَهْلِ﴾ رواهُ مُسْلم، هەروەها لە حەدیسێکی (قُدْسِي)دا ئەفەرموێ: ﴿أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي وَأَنَا مَعَهُ حِينَ يَذْكُرُنِي﴾ رواهُ البخاري ومُسْلم.

(جهمية) ئەڵێن: ئەم ئایەت‌و حەدیسانە بەڵگەی ئێمەنە: کە خوا بە زاتی خۆی لە هەموو شوێنێکە، چونکە ئێمە لە هەر شوێنێك بین خوا لەگەڵمانە، هەروەها لە ئەشکەوتەکە لەگەڵ پێغەمبەرﷺو (أبوبكر)دابوو، لە (مصْر) لەگەڵ حەزرەتی (مُوسی)و(هَارون)دابوو، عليهما السلام، لە جەنگی (بَدْر) لەگەڵ (مَلاَئكَة)دابوو، حەدیسەکەش بەڵگەیە: لە هەر شوێنێك بەندە زیکری خوا بکا، خوا لەگەڵیدایە، کەوابوو: لەگەڵ (يُونس) پێغەمبەرﷺ لە ناو

زکی ماسی‌دابوو، هەروەها: ئەگەر بەندە لە ئاسمان، یان لە زەمین، یان لە دەریا، یان لە بەهەشت، یان لە دۆزەخ، زیکری خوا بکا، خوا لەگەڵی دایە، ئەگەر بەندە بڕواتە ناو شتێك: خوا لەگەڵی دایە.

**وەلام: ( أهل السنّة ) فەرموویانە:** ئەم ئایەتو حەدیسانە گشتی (تأوِیلْ) کراون بە (مَعَكُمْ بِعِلْمِهِ) خوا لەگەڵتانە بە زانستی خۆی، یان (بِرَحْمَتِهِ) لەگەڵتانە بە ڕەحمەتی خۆی، واتە: نەك بە زاتی خۆی(١٣). (الإعْتِقاد) ل١١٥و (فتح الباري) ل٦١١ ب١٣و (الإتقان) ل٨ ب٢.

**﴿ئاگاداری﴾** بەم (تأوِیلْ)کردنە بۆمان ڕوون بۆوە: کە (مَعِيَّة) لەگەڵدابوونی خوا سیفەتێکی زاتی خودیە، کەوابوو: مەرج نیە تەنها بە (بِعِلْمِهِ) زانستی خوا (تأوِیلْ) بکرێ، چونکە جاری وا هەیە پێویستە لە جیاتی (عِلْم) سیفەتێکی‌تری خوا بەکار بێ، وەکو (حِفْظ) پاراستن، (قُدْرَة) توانین...هتد، هەروەك ئەڵێی بڕۆ خوات لەگەڵ، واتە: بە (حِفظ) پاراستنی خۆی، وَاللهُ أعْلَمُ.

### ﴿ باسی ( إبراهیم ) پێغەمبەرو، ( موسی ) پێغەمبەر عَلَيْهِمَا الصَّلاةُ وَالسَّلامُ ﴾

ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَنَقُولُ) بە بیرو باوەڕەوە ئەڵێین: (إنَّ اللهَ إتَّخَذَ إبْرَاهِيمَ خَلِيلاً) خوای گەورە حەزرەتی (إبراهیم) پێغەمبەری کردۆتە دۆستی خۆی‌و خۆشەویستی خۆی، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَاتَّخَذَ اللهُ إبْرَاهِيمَ خَلِيلاً﴾ النساء:١٢٥، خوا (إبراهیم)ی کردۆتە دۆستی خۆی، بگەڕێوە باسی (پێغەمبەری ئیسلام). (وَكَلَّمَ اللهُ مُوسىَ تَكْلِيماً) خوا گفتوگۆی لەگەڵ موسی پێغەمبەرﷺ کرد، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَكَلَّمَ اللهُ مُوسَى تَكْلِيمًا﴾ النساء:١٦٤، خوا گفتوگۆی لەگەڵ موسی پێغەمبەرﷺ کرد. (إيمَاناً وَتَصْدِيقاً وَتَسْلِيماً) بە دڵو بیرو باوەڕەوە وا ئەڵێین: ئینجا بزانە: (جَهْمِيَّة) ئەڵێن: خوا (إبراهیم)ی <u>نەکردۆتە دۆستی خۆی‌و گفتوگۆی لەگەڵ موسی نەکردوە.</u>

(١٣) ئەی موسوڵمانی بەڕێز، بێگومان بۆت ئاشکرا بوو: کە هەر ئایەتێكو هەر حەدیسێك واتەی لاشەو ئەندامو شوێنی بۆ خوا لێ بفامێتەوە، (أهل السنّة): یان (تَفْوِیض)ی ئەکەن‌و ئەڵێن: باوەڕمان پێی هەیەو هەر خوا ئەزانی مەبەستی چییە؟ یان (تأوِیلْ)ی ئەکەن: بە سیفەتێك لە سیفەتەکانی خودا هەروەك بۆمان ڕوون کردیەوە.
بەلام (مُجَسِّمَة)و (مُشَبِّهَة) لەم جۆرە ئایەتو حەدیسانەدا دژی (تأوِیلْ)کردنن، جا لە کاتێکا لەگەڵ (جَهْمِيَّة) ڕووبەڕوو ئەبنەوە: دەمکوت ئەبن‌و ناتوانن بەلگەی (جَهْمِيَّة) پووچەڵ بکەنەوە، ناچار هاوار ئێننە بەر (أهل السنّة)و لە هەڵوێستی خۆیان پەشیمان ئەبنەوەو بەلگەی (جَهْمِيَّة) (تأوِیلْ) ئەکەن، بەلام (جَهْمِيَّة) بۆیان هەیە بڵێن: ئەگەر (تأوِیلْ)کردن ڕەوابێ، ئەوە ئەبی هەموو لایەك مافی (تأوِیلْ)کردنی هەبێ، چونکە قورئان هەر یەك قورئانە، کەوابوو: ئەگەر ئایەتی ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ﴾ بە (بِعِلْمِهِ) زانستی خوا (تأوِیلْ) بکرێ ئەبێ ڕەوا بێ ﴿إسْتَوَى عَلَى العَرْشِ﴾ (تأوِیلْ) بکرێ، یان بە (إسْتَوَى حُكْمُهُ وَأمْرُهُ) بڕیارو فەرمانی خوا لە سەر (عَرْش) جێگیر بوو، هەروەکو چینی (خَلَف)ی (أهل السنّة) وا ئەڵێن: یان بە (إسْتَوَى بِعِلْمِهِ) بە زانستی خۆی لە سەر (عَرْش) جێگیر بوو، چونکە (عَرْش)و ئاسمان‌و زەمین گشتی دروستکراوی خوایە، جیاوازی نیە لە نێوان ئەم سێیەدا، بۆچی خوا لە سەر (عَرْش) بێ، بەلام لە ئاسمان‌و زەمین نەبێ؟!!! ڕوونکەرەوە.

## ﴿ باوەڕ بە (مَلاَئِكَة)و پێغەمبەرانو (كُتُب)ی خوا ﴾

بزانە: ئیمان لە شەش ڕوكن پێك هاتووە، هەروەكو پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿الإِيْمَانُ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ﴾ متفق عليه، واتە: ئیمان ئەوەیە باوەڕت هەبێ: بە خواو مەلائیكەی خواو كتێبەكانی خواو پێغەمبەرانی خواو ڕۆژی دوایی‌و قەزاو قەدەر.

ئینجا ئیمامی (الطَّحاوي) باسی سێ ڕوكن ئەكاو ئەفەرموێ: (وَنُؤْمِنُ) باوەڕمان هەیە (بِالْمَلاَئِكَةِ) بە فریشتەكانی خوا (وَالنَّبِيِّنَ) باوەڕمان هەیە بە هەموو پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام (وَالْكُتُبِ الْمُنَزَّلَةِ عَلَى الْمُرْسَلِينَ) باوەڕمان هەیە بەو كتێبانەی ناردراونە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەكانی (مُرْسَل) عليهم الصلاة والسلام (وَنَشْهَدُ) شاهێدی بۆ هەموو پێغەمبەران ئەدەین (أَنَّهُمْ كَانُوا عَلَى الْحَقِّ الْمُبِينِ) كە هەموویان لە سەر ڕێگەی ڕاستن، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿كُلٌّ آمَنَ بِاللهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ﴾ البقرة:٢٨٥، هەموو ئیمانداڕێك باوەڕی هێناوە: بە خواو بەمەلائیكەی خواو بەكتێبەكانی خواو بە پێغەمبەرانی خوا، جیاوازی لە نێوان هیچ پێغەمبەرێكی خوا ناكەین‌و باوەڕمان بە پێغەمبەرایەتی گشتیان هەیە.

١-(المَلاَئِكَة) فریشتەی خوا: چینە خەڵكێكی لە چاو داپۆشراو و پیرۆزن، خوا لە ڕووناكی دروستی كردون ﴿عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: قَالَ النَّبِيُّﷺ: خُلِقَتِ الْمَلاَئِكَةُ مِنْ نُورٍ، وَخُلِقَ الْجَانُّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ، وَخُلِقَ آدَمُ مِمَّا وُصِفَ لَكُمْ﴾ رواهُ مُسْلِم، فریشتەی خوا لە ڕووناكی دروست كراون، جنۆكە لە بلێسەی ئاگر دروست كراون، ئادەم لە قوڕ دروست كراوە: كە لە قورئاندا باسی كراوە.

ئینجا بزانە: (المَلاَئِكَة) نە نێرن نە مێنن، خەو و خواردنیان نیە، ئەتوانن خۆیان بهێننە سەر هەموو وێنەیەكی جوان، توانای هەموو كارێكیان هەیە، كاروباری بوونەوەر هەڵئەسوڕێنن، لە ئاسمان‌و زەمیندا نیشتەجێن، لە هەموو شوێنێكدا جێیان ئەبێتەوە، هەردەم لە خواپەرستی دان‌و لە فەرمانی خوا دەرناچن. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْرًا﴾ النازعات:٥، سوێند بەو فریشتانەی كاروباری بوونەوەر بەڕێوە ئەبەن. هەروەها ئەفەرموێ: ﴿لاَ يَعْصُونَ اللهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ التحريم:٦، فریشتەكان لاملی لە فەرمانی خوا ناكەن‌و هەر فەرمانێكی پێیان بكرێ، جێبەجێی ئەكەن.

ئینجا بزانە: سێ فریشتە گەورەی هەموو فریشتەكانن، چونكە كاروباری ژیانیان لە دەستە: **یەكەم:** (جُبْرَائِيل) فریشتەی (وَحْي)هێنانە بۆ پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام، كە دڵی خەڵكی

پێ زیندوو ئەبێتەوە. دووەم: (میکائیل) فریشتەی بارانە، کە ئەبێتە هۆی زیندووبوونی زەمین‌و گیاو گشت گیانلەبەرێك. سێیەم: (إسْرافیل) فریشتەی (نَفْخ الصُّور)ە، کە هەموو کەسێکی لە دوای مردن پێ زیندوو ئەبێتەوە، (شرح الطحاویة) ل٤٠٨ ب٢.

﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ الْيَهُودَ سَأَلُوا النَّبِيَّ ﷺ: مَنْ صَاحِبُكَ؟ قَالَ: جِبْرِيلُ عليه السلام، قَالُوا: جِبْرِيلُ؟ ذَاكَ يَنْزِلُ بِالْحَرْبِ وَالْعَذَابِ عَدُوُّنَا، لَوْ قُلْتَ: مِيكَائِيلُ الَّذِي يَنْزِلُ بِالرَّحْمَةِ وَالنَّبَاتِ وَالْقَطْرِ لَكَانَ خَيْراً، فَنَزَلَتْ (قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللهِ)﴾ رواهُ أحمد والترمذی، جووەکان پرسیاریان لە پێغەمبەرﷺ کرد: ئایا کێ (وَحْي) بۆ تۆ دێنێ؟ فەرمووی: (جوبرائیل). گوتیان: (جوبرائیل) دوژمنی ئێمەیە، چونکە جەنگ‌و ئازاردان دێنێتە خوارەوە، ئەگەر گوتبات: میکائیل بۆم دێنێ، ئەوە باش بوو، چونکە ئەمەیان ڕەحمەت‌و باران دێنێتە خوارەوە. ئینجا ئایەتی ﴿قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ﴾ هاتە خوارەوە، واتە: هەرکەسێك دوژمنی (جوبرائیل) بێ، بێگومان ئەو قورئانی بۆ تۆ هێناوە بە ئیزنی خوا. (فتح الباري) ل٢٢٠ ب٨.

هەروەها (مَلَكُ الْمَوْت) فریشتەی مردن-روح کێشان- کە گیانی خەڵك دەردێنێ، پێی ئەڵێن: (عزرائیل). خوای‌گەورە ئەفەرموێ: ﴿قُلْ يَتَوَفَّاكُمْ مَلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي وُكِّلَ بِكُمْ﴾ السجدة:١١، بڵێ: فریشتەی مردن گیانی ئێوە وەرئەگرێ. هەروەها دوو فریشتەی تر پێیان ئەگوترێ: (الْكِرامَ الْكَاتِبِين) چاکەو خراپەی ئادەمیزاد ئەنووسن، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ﴾ ق:١٧، یەکیان لە ڕاستە دانیشتووەو یەکیان لە چەپە.

هەروەها نۆزدە فریشتەی‌تر کارگێڕی دۆزەخن، پێیان ئەگوترێ: (زَبانِيَة). گەورەکەیان پێی ئەگوترێ: (مَالك). خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ﴾ المدثر:٣٠، نۆزدە فریشتە لە سەر دۆزەخن. هەروەها فریشتەیەکی‌تریش کاروباری کۆرپەی ناو زگی لە دەستە، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ عز وجل قَدْ وَكَّلَ بِالرَّحِمِ مَلَكاً...﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، خوای گەورە فریشتەیەکی کردۆتە چاودێری منداڵدان.

جگە لەمانەش: هەشت فریشتەی‌تر هەڵگری (عَرْش)ی خودان، هەندێکی‌تر بەڕێوەبەری کەژو چیاکانن، هەندێکی‌تر بەڕێوەبەری بەهەشتن، هەندێکی‌تر لە ئاسمان خەریکی خواپەرستن، دووانی‌تر لە ناو قەبردا پرسیار لە مردوو ئەکەن پێیان ئەگوترێ: (مُنْكَرْ وَنَكِير). هەر گیانلەبەرێکیش دوو فریشتەی لەگەڵدایە پێیان ئەگوترێ: (سائِق)و (شَهِيدٌ) ئەیبەنە مەیدانی (مَحْشَر). ئەوانە گشتی: یان لە قورئان، یان لە حەدیس بەڵگەیان هەیە، لەبەر درێژی نەماننووسین، ئیتر هەر خوا ئەزانێ: ژمارەی فریشتەکان‌و کاروباریان

چەندەو چۆنە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلاَّ هُـوَ﴾ المدثر:٣١، تەنها خوا ئەزانێ لەشکری خۆی چەندە، واتە: ژمارەی فریشتە چەندە.

﴿ئاگاداری﴾ ئەگونجێ (مَلاَئكَة) لە سەر وێنەی (خۆگۆڕیو)دا بدیترێن، هەروەکو (صحابَة) حەزرەتی (جُبْرائيـل)یـان لـە شێوەی پیـاوێکی بـەرگ سپیو موو ڕەشدا دیت، بڕوانـە حەدیسی ئیمانو ئیسلام لە (بُخاری ومُسْلم)دا، بەلاّم لـە سـەر وێنـەی ڕاستەقینەیخۆیان جگە لە پێغەمبـەران عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ کەسـیتر نایـانبینی، پێغەمبـەری خۆشەویستمانﷺ دوو جار (جُبْرائیل)ی لـە وێنـەی ڕاستەقینەدا دیتـوە. بڕوانـە ئایـەتی (١٣) النجمو (٢٣) التكوير، و(شرح صحيح مسلم) ل٩٦ ب٢.

## ﴿باسی جنۆکە ـ الجِنّ﴾

(الجِنُّ) جنۆکە: چینە خەڵکێکی لە چاو داپۆشراون، خوای گەورە لـە ئـاگر دروستی کردون، خـوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿وَخَلَقَ الْجَانَّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَـارٍ﴾ الرحمن:١٥، خـوای گـەورە (جَانّ)ی باوکی جنۆکەی لە بڵێسەی ئاگر دروست کردوە. جنۆکـە نێـرو مـێو زاوزێـیان هەیـە، کافرو موسوڵمانیان هەیە، بڕوانە تەفسیری (سُورَةُ الجِنّ)، (إبْلِيس) واتە: شـەیتان، لـە جنۆکـە کافرەکانەو نەتەوەی هەیە، خوای گەورە ئەفـەرموێ: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْـجُدُوا لِـآدَمَ فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيـسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِـي وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ﴾ الكهف:٥٠، ئەو کاتەی بە فریشتەکانمان گوت: سوجدە بـۆ ئـادەم ببـەن، گشتیان سـوجدەیان بـرد، بـەلاّم (إبْلِيس) شـەیتانی گـەورە لـە نەتـەوەی جنۆکـە بـوو و لـە فەرمانی خوا دەرچو و سوجدەی نەبرد، چۆن ئێـوە (إبْلِيس)و نەتەوەکـەی ئەکەنـە دۆسـتی خۆتان–جگە لە خوا–؟ خۆ ئەوان دوژمنی ئێوەن!.

ئینجا بزانە: جنۆکە توانایان هەیە: خۆیان بگۆڕنە سەر هەموو وێنەیەك جـا ئـەگونجێ لـە وێنەی (خۆگۆڕیو)دا بدیترێن، بەلاّم لە وێنەی ڕاستەقینەدا–جگە لـە پێغەمبـەران عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ– هـیچ کەسـێك ناتوانـێ بیانبینـێ، بـەلاّم ئیمـامی (النـواوي) ئـەم گوتەیـەی بـە گوتەیەکی بێبەڵگە داناوە، بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل١٩٦ ب٣.

## ﴿ باوەڕ بە پێغەمبەرانی خوا عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ ﴾

**پێناسە:** پێغەمبەر: ئادەمیزادێکی نێرینەیە، لە لای خوا بەرنامەو یاسایەکی بـە (وَحْـي) لـە بۆ دێ، تاکو ڕەفتاری پێ بکاو بە خەڵکی ڕابگەیـەنێ، جیـاوازی نیـە: لـە لایخـوا کتێبێکـی تایبەتیی بۆ هاتبێ، یان بۆ پێغەمبەرێکی پێشەخۆی هاتبێو فەرمانی پێکرابێ: بە خەڵکی ڕابگەیەنێ، یان هیچ جۆرە کتێبێکی نەبێو تـەنها فـەرمانی ڕاگەیانـدنی(وَحْـي)ی پێکرابێ. ئەم جۆرە پێغەمبەرە پێی ئەگوترێ: (رَسُول)و (نَبيّ). چونکە ئەگەر فـەرمانی ڕاگەیانـدنی

پێنەكرابێ: تەنها پێی ئەگوترێ: (نَبِيٌّ). بڕوانە (فتح المبين بشرح الأربعين) ل١٠.
خوای گەورە بۆ دانیشتووانی سەر زەمین چەندەها پێغەمبەری ناردوون، تاكو بەرنامەو یاسای خوایان پێ ڕابگەیەننو ئەوانیش ڕەفتاری پێ بكەن: لە بواری ئاینیو خواپەرستیو كۆمەلایەتیو ئابووریو ڕامیاریو...هتد.
(إبن حَجَرْ الهَيْتَمِي) ئەفەرموێ: حەدیسی ژمارەی سەرجەمی پێغەمبەران: كە (١٢٤٠٠٠) سەدو بیستو چوار هەزار پێغەمبەرن، حەدیسێكی (صَحِيح)=ڕاستە، هەروەها حەدیسی ژمارەی (رُسُل): كە (٣١٥) سێ سەدو پانزە (رَسُول)ن، حەدیسێكی (صَحِيح)=ڕاستە، بەلام ئەو حەدیسەی ژمارەی (أنبياء)و (رُسُل)ی تێدا گوتراوە بێهێزە، جا چونكە لە زۆر ڕێگەوە هاتوە، بووەتە (حَسَنٌ لِغَيْرِهِ)و ئەبێتە بەلگە، هەم بەوەش بەهێز بووە: كە ئیمامی (أحمد) لە (مُسْنَد)ی خۆیدا زۆر دووبارەی كردۆتەوە، وەهاش بڕیار دراوە: حەدیسە بێهێزەكانی (مُسْنَد)ی ئیمام (أحْمد) لە پلەی (حَسَن)ن، بڕوانە (تحفة المحتاج) ل٢٦ ب١.
ئەمەش حەدیسەكەیە: ﴿عَنْ أَبِي أُمَامَةَ وَأَبِي ذَرٍّ رضي الله عنهما: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ كَمِ الأَنْبِيَاءُ؟ قَالَ: مِائَةُ أَلْفٍ وَأَرْبَعَةٌ وَعِشْرُونَ أَلْفًا، قُلْتُ: كَمِ الرُّسُلُ مِنْهُمْ؟ قَالَ: ثَلاثُمائَةٍ وَخَمْسَةَ عَشَرَ، وَفِي رِوَايَةٍ: وَثَلاثَةَ عَشَرَ﴾ رواه الإمام أحمد وابن حبان والحاكم.
ئینجا بزانە: لەو هەموو پێغەمبەرانە، تەنها ناوی (٢٥) بیستو پێنج پێغەمبەران لە قورئاندا هاتوە، كە ئەمانەن: (آدَم، إدْرِيس، نُوح، هُود، صَالِح، إبْرَاهِيم، لُوط، إسْمَاعِيل، إسْحَاق، يَعْقُوب، يُوسُف، شُعَيْب، أَيُّوب، ذُوالْكِفْل، مُوسَى، هَارُون، داوُد، سُلَيْمَان، إلْيَاس، اَلْيَسَع، يُونُس، زَكَرِيَّا، يَحْيَى، عِيسَى، مُحَمَّد عَلَيْهِ وَعَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ).

## ﴿ پێغەمبەرەكانی (أولُو العَزْم)و، بەلێن وەرگرتن ﴾

ئینجا بزانە: لەو پێغەمبەرانە، پێنجیان زۆر گەورەو بەڕێزن، بە (أُولُوالعَزْم) ناو ئەبرێن، كە لەم ئایەتەدا ناویان گوتراوە: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنْكَ وَمِنْ نُوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ﴾ الأحزاب:٧، باس بكە: ئەو كاتەی بەلێنمان لە هەموو پێغەمبەران وەرگرت كە ئاینی خوا بەخەلكی ڕابگەیێنینو هەمان بەلێنیشمان لە تۆ وەرگرت ئەی (مُحَمَّد)ﷺ، لە (نُوح)و (إبراهِيم)و (مُوسَى)و (عيسى)شمان وەرگرت.
ئینجا بزانە: یەكەم پێغەمبەر باب (آدَم) بوو، ئاخیر پێغەمبەر حەزرەتی (مُحَمَّد)ﷺ بوو، كە گەورەی هەموو پێغەمبەرانە عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ، هەروەك باسمان كرد، بگەڕێوە باسی پێغەمبەری ئیسلامﷺ. دیسان بزانە:-جگە لەم بەلێنە- خوای گەورە بەلێنێكیتری بۆ پێغەمبەرﷺ لە هەموو پێغەمبەران وەرگرتووەو ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ

لَمَا آتَيْتُكُمْ مِنْ كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُصَدِّقٌ لِمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنْصُرُنَّهُ﴾ الآية، باس بكه: كه خواى گەورە بەڵێنى له پێغەمبەران وەرگرتوه بە هۆى ئەو كيتابو زانستەى داومەتە ئێوە، ئەگەر هاتو گەيشتنە سەردەمى حەزرەتى (مُحَمَّد)پێغەمبەرﷺ ئەبێ ئيمانى پێ بێنن‌و ئەبێ يارمەتيشى بدەن. بڕوانە ئايەتى (٨١)ى (سُورة آل عِمْران) له (تَفْسِير القُرْطُبِي) ل١٢٥ ب٤.

## ﴿ باسى (مُعْجِزَة)و سيفاتى پێويست بۆ پێغەمبەران عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام ﴾

بزانە: هەر پێغەمبەرێك داواى پێغەمبەرايەتى بكا، ئەبێ لە لاى خوا بەڵگەيەكى بە دەستەوە بێ: كه ڕاست ئەكا. جا ئەم بەڵگەيە پێى ئەگوترێ: (مُعْجِزَة).

**پێناسە**: (مُعْجِزَة) بێتواناكردن، كارێكە لە سنوورى تواناى ئادەميزاددا نيە، خواى گەورە لە كاتى مەيدان خواستنەوەدا، لە سەر دەستى پێغەمبەرانى خۆى ئەيهێنێتە جێ، تاكو باوەڕيان پێبكرێ، كە ئەڵێ: (من پێغەمبەرى خوامە). وەكو نەسووتانى (إِبْراهِيم) پێغەمبەرﷺ، دارعەساى (موسى) پێغەمبەر، مردوو زيندووكردنەوەى (عيسى) پێغەمبەر عَلَيْهِمَا السَّلام، هەروەها: لەتكردنى مانگ بە ئامازەى پێغەمبەرمانﷺو هەڵقوڵانى ئاو لە نێوان پەنجەكانى پيرۆزى...هتد، جا گەورەترين (مُعْجِزَة)ى پێغەمبەرمانﷺ قورئانى پيرۆزە.

ئينجا بزانە: (مُعْجِزَة) لە بەهێزى بەڵگەيىدا، ئەگاتە ئەو پلەيە، كە خواى گەورە بفەرموێ: ﴿بەندەى من ڕاست ئەكا: لە هەموو ڕاگەياندنێكى لە لاى منەوە﴾.

ديسان بزانە: واجبە پێغەمبەران عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام ئەم چوار سيفەتە بەرزەو گەورانەيان لێ بێنە جێ: **يەكەم**: پارێزراو بن لە گشت گوناهێكى گەورەو بچووك. **دووەم**: ڕاستگۆبن لە گشت ڕاگەياندنێكياندا. **سێيەم**: زيرو هەشيارو زيرەك بن بۆ دەمكوتكردنى كێشەچى. **چوارەم**: ڕاگەيەنەر بن بۆ گشت ڕاگەياندێكى فەرمانكراو لەلاى خوا. كەوابوو: دژى ئەم چوار سيفەتانە بۆ پێغەمبەران مەحاڵەو ناگونجێ: وەكو خيانەتكردن: بە تاوان كردن‌و، درۆ كردن‌و، گێلەكەيى‌و، ناتێگەيشتن‌و، ڕانەگەياندن؟ چونكە ئێمە فەرمان پێكراوين شوێن پێغەمبەرﷺ بكەوين: لە گوفتارو لە كردارو لە گشت ڕەووشتێكى‌تر، خواى گەورەش فەرمان بە خراپە ناكا، (تحفة المريد) ل٦٥و ٦٦و ٧١و ٧٢.

## ﴿ ئايينى هەموو پێغەمبەران يەك ئايينە، بەڵام بەرنامەيان جيايە ﴾

بزانە: يەكەم بانگەوازى هەموو پێغەمبەران عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام بە گشتى بۆ يەكخوا پەرستى بوو، واتە: باوەڕ بە تاكوتەنيايى خواو دووركەوتنەوە لە ڕێبازى شەيتان، خواى گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾

النحل:٣٦، واتـه: بـۆ هـەموو گـەلێك پێغەمبـەرێكمان نـاردوە تـاكو پێیـان بڵـێن: خـوا بپەرستن‌و خۆتان لە (طَاغوت)[14] بپارێزن‌و شوێنكەوتووی مەبن.
بەڵام پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام لە لقەكانی ئاییندا بەرنامەیان جیابو، هـەروەك خـوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾ المائدة:٤٨، هەر یەكێك لە ئێوە -پێغەمبەران- جۆرە یاساو بەرنامەیەكمان داوەتێ. بگەڕێوە باسی (تاك‌و تەنیایی خوا).
ئینجا خوای گەورە بە ناردنی حـەزرەتی (محمد ﷺ) كۆتـایی بـە نـاردنی پێغەمبـەران هێنـاو كردیە پێغەمبەری ئیسلام، بە شەریعەت‌و یاسای ئیسلام، شـەرع‌و یاسـای گشـت پێغەمبـەران لە كار كەوت‌و (نَسْخ) بـوو. بـەڵام یەكخواپەرسـتی گۆڕانكـاری نەهاتـە سـەر، خـوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ آل عمران:٨٥، هەركەسێك جگە لە ئیسلام ئایینێكی‌تری بوێ-واتە: بە بەرنامەی خـوا پەرسـتی‌و ژیانی دابنێ- ئەوە لێی وەرناگیرێ‌و لە ڕۆژی دواییشدا لە زەرەرمەندەكانە.
ئینجا بزانە: هەروەكو خوای گەورە لەم ئایەتـەدا نـاوی لـە ئـایینی ئێمـە نـاوە: (إِسْلاَم)، ناویشی لە ئێمەی ئوممەتی(محمد ﷺ) نـاوە: موسـوڵمان، هـەروەك ئەفـەرموێ: ﴿هُـوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمينَ مِنْ قَبْلُ وَفِي هَذَا﴾ الحج:٧٨، خوا ناوی لە ئێوە نـاوە موسـوڵمان لـە پێش هـاتنی قورئـان، وە لـە قورئانیشـدا نـاوی نـاون موسـوڵمان. بڕوانـە باسـی (ئـایینی ئیسلام ئایینی خوایە).

## ﴿ باوەڕ بە كتێبەكانی خوا ﴾

باوەڕمان هەیە: كە خوای گەورە چەند كتێبێكی بـۆ چـەند پێغەمبـەرێك نـاردوە تـاكو بـە ئوممەتی خۆیان ڕابگەیێنن‌و ڕەفتـاری پـێ بكـەن، زانایـان ئـەڵێن: ژمـارەی ئـەو كتێبانـە (١٠٤) سەدو چوار كتێبە.-بڕوانە (فتح المبين) ل٦٣- بەڵام تـەنها نـاوی چـوار كتێـب لـە قورئاندا گوتراوە: (تَوْرَاة) بۆ (مُوسَى)، (إِنْجِيل) بۆ (عِيسَى)، (زَبُور) بـۆ (دَاود)، ( قُـرآن) بۆ (محمد) ﷺ وعليهم أجمعين.
ئینجا بزانە: جووەكان-كە ئوممەتی (مُوسَى) پێغەمبـەر بـوون- دەسـتكاری (تَـوْرَاة)یـان كـردو گۆڕییـان، وە دیانـەكان-كـە ئوممـەتی (عِيسَـى) پێغەمبـەر بـوون- دەسـتكاری (إِنْجِيل)یان كردو گۆڕییان. جگە لەمەش: جولەكەو دیان-چونكە باوەڕیان بە (قُرآن)و، بە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ نیە- هەردووكیان كافرن.

[14]-(طاغوت): گشت خۆ سەپێنەرێكە كە ڕێبازی شەیتانی گرتبێتە بەر. واتـە: لـە خـوای گـەورە یـاخی بـبێ‌و، سنووری خوا بشكێنێ‌و، یاسای دەستكرد بەسەر خەڵكیدا بسەپێنێ: بـە زۆرداری، یـان بـە فێڵبـازی، یـان بـە خوێندنێكی نارەوا.

ئینجا بزانە: خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ الحجر:٩، ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوەو ئێمە پارێزەری قورئانین. واتە: هیچ کەس ناتوانێ دەستکاری بکاو بیگۆڕێ، بە هۆی پاراستنی خوا هەروەك خۆی ئەمێنێتەوە، کەوابوو: قورئان (مُعْجِزَة)ی بەردەوامی پێغەمبەرە ﷺ.

## ﴿ قورئان بەرنامەی ژیانە ﴾

گومانمان نیە: ئەو خوایە بە تەنها ئەم خەڵکەی دروست کردوەو بە تەنها ئەیژێنێ و ئەیمرێنێ، کەوابوو: تەنها هەر ئەو خوایەش مافی هەیە یاسایەك بۆ دروستکراوی خۆی دابنێ، چونکە هەر ئەو ئەزانێ: دروستکراوی خۆی بەرێوە ببا، ﴿وَاللهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ النور:١٩، خوا ئەزانێ و ئێوە نازانن. جا لەبەر ئەوە بوو، خوای گەورە هەر پێغەمبەرێکی ناردبێ، (شَرِيعَة)، واتە: یاسای ژیان و خوا پەرستی ی بۆ ناردوە، تا لە کۆتاییدا (قرآن)ی بۆ حەزرەتی (محمد)ﷺ نارد و فەرمانی پێکرد: خۆی و ئوممەتی بە یاسای قورئان ڕەفتار بکەن و بیکەنە بەرنامەی ژیان و فەرمووی: ﴿وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ﴾ المائدة:٤٩، داد لە نێوان ئەم خەڵکەدا بکە: بە گوێرەی یاسای ئەو قورئانەی خوا ناردویەتیە خوارەوە، شوێن هەواو هەوەسی ئەوان مەکەوە.

بەڵێ: (أهْواءَهُم) ئەو یاسا دەستکردانەیە: کە ئادەمیزاد دایانئەڕێژێ، کەوابو: هەرکەسێك بە یاسای دەستکرد ڕەفتار بکاو واز لە قورئان بێنێ: ئەوە یان کافرە، یان زاڵم و فاسقە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾، عَنْ إبن عبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنْهُما فِي تَفْسِيرِ هَذِهِ الآيَة: ﴿مَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ جَاحِداً بِهِ فَقَدْ كَفَرَ، وَمَنْ أَقَرَّ بِهِ وَلَمْ يَحْكُمْ فَهُوَ ظَالِمٌ فَاسِقٌ﴾ رواه ابن جرير، (تفسير إبن كثير) ل٦١ ب٢. واتە: (إبن عَبَّاس) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەفەرموێ: هەرکەسێك بەم قورئانە ڕەفتار نەکاو باوەڕیشی پێی نەبێ ئەوە کافرە، بەڵام ئەگەر باوەڕی پێی هەبێ و ڕەفتاری پێ نەکا ئەوە (ظالم)و (فاسق)ە. هەروەکو لە دوو ئایەتەکەی‌تردا وای فەرمووە، المائدة الآيات:٤٤و ٤٥و ٤٧.

کەوابو: ئەو کەسە موسوڵمانە: باوەڕی بە قورئان هەبێ و گشت کاروبارێکیشی بە گوێرەی یاسای قورئان بێ: جا خواپەرستی بێ، یان ئابووری، رامیاری، کۆمەڵایەتی، خێزان، جەنگ، سزای تاوانەکان، گشت حەرام و حەڵاڵ... هتد، کەوابوو: هەرکەسێك جۆرە کاروبارێکی بە یاسای قورئان ئەنجام بداو هەندێکی‌تریش بە یاسای دەستکرد، ئەو بە (مُشْرِك) ناو ئەبرێ، چونکە هاوبەشی بۆ خوا داناوە، خوای گەورە ئەفەرموێ:

وَنُسَمِّي أَهْلَ قِبْلَتِنَا مُسْلِمِينَ مُؤْمِنِينَ مَا دَامُوا بِمَا جَاءَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ مُعْتَرِفِينَ، وَلَهُ بِكُلِّ مَا قَالَهُ وَأَخْبَرَ مُصَدِّقِينَ،

---

﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ الأنعام:١٢١، ئەگەر گوێڕایەڵی ئەوان بن لە حەرام و حەلاڵ، بێگومان ئێوە (مُشْرِك)ن، واتە: هاوبەشتان بۆ خوا داناوە.

جا هەر لەبەر ئەم ڕەفتارە گومڕایە بوو، خوای گەورە ڕەخنەی لە جووەکان گرت و فەرمووی: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَاءُ مَنْ يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنْكُمْ إِلاَّ خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَى أَشَدِّ الْعَذَابِ﴾ البقرة:٨٥، ئایا باوەڕتان بە بەشێکی کتێبی خوا هەیەو ڕەفتاری پێ ئەکەن، وە باوەڕتان بە بەشێکی تری نیەو ڕەفتاری پێ ناکەن؟ ئایا سزای ئەم جۆرە کەسانە چی یە؟ تەنها سەر شۆڕی یە لە دونیاو لە ڕۆژی دواییشدا ئەگەڕێندرێنەوە بۆ ناو توندترین سزا–کە دۆزەخە–.

## ﴿ حەدیس ڕوونکەرەوەی قورئانە ﴾

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾ الحشر:٧، پێغەمبەر ﷺ هەر فەرمانێکی پێ کردن وەری بگرن، هەر شتێکی لێ قەدەغە کردن مەیکەن. کەوابوو: حەدیسەکانی پێغەمبەر ﷺ وەکو قورئان–بە یاسای ئیسلام– دائەندرێن ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: تَرَكْتُ فِيكُمْ أَمْرَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا مَا تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا: كِتَابَ اللهِ وَسُنَّةَ رَسُولِ اللهِ﴾ رواه الإمام مالك والحاكم، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: لەدوای خۆم دوو شت لە ناو ئێوەدا ئەهێڵمەوە، تا دەستیان پێوە بگرن گومڕا نابن، یەکەمیان: قورئان. دووەمیان: حەدیسی پێغەمبەری خوا ﷺ.

## ﴿ (أهْل البِدْعَة) بە موسوڵمان ناو ئەبرێن ﴾

ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(وَنُسَمِّي أَهْلَ قِبْلَتِنَا مُسْلِمِينَ مُؤْمِنِينَ) هەر موسوڵمانێك ڕوو لە قیبلەی ئێمە نوێژ بکا، پێی ئەڵێین: موسوڵمان و ئیماندار (مَا دَامُوا بِمَا جَاءَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ مُعْتَرِفِينَ) بەو مەرجەی بەردەوام دان بەو شەریعەتەدا بهێنن: کە پێغەمبەر ﷺ لە لای خواوە هێناویەتی (وَلَهُ بِكُلِّ مَا قَالَهُ وَأَخْبَرَ مُصَدِّقِينَ) بەو مەرجەی هەرچی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی باوەڕی پێ بکەن.

کەوابوو: هەر بەو مەرجانەش حەفتاو دوو گرۆهەکەی گومڕابووی (أهْل البِدْعَة) گشتی بە ئیماندار و موسوڵمانی سەرلێشێواو ناو ئەبرێن و دروست نیە پێیان بگوترێ: کافر، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ صَلَّى صَلاَتَنَا وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنَا وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَا، فَذَلِكَ الْمُسْلِمُ الَّذِي لَهُ ذِمَّةُ اللهِ وَرَسُولِهِ، فَلاَ تُخْفِرُوا اللهَ فِي ذِمَّتِهِ﴾ رواهُ البُخاري، هەرکەسێك ئەو پێنج نوێژانەی ئێمە بکاو ڕوو لە قیبلەی ئێمە–كَعْبَة– بکاو ئاژەڵی سەربڕاوی ئێمە بخوا، ئەوە ئەو

موسـولمانه‌یه: كـه پـه‌یمانی خـواو پێغه‌مبـه‌ری دراوه‌تـێ، كـه‌وابوو: خیانـه‌ت له‌گـه‌ڵ خـوا مه‌كـه‌ن لـه پـه‌یمانه‌كـه‌ی. بـۆ دڵنیـایی بڕوانـه (شـرح صـحیح مسـلم) ل١٩ ب٥.

## ﴿ بیر له (ذات)ی خوا ناكه‌ینه‌وه ﴾

ئیمامی (الطحاوی) ئه‌فه‌رموێ:

(وَلاَ نَخُوضُ فِي‌اللهِ) خۆمان تێكه‌ڵی باسی (ذات)ی خـوا ناكـه‌ین (وَلاَ نُمَارِي فِـي دِيـنِ اللهِ) ململانه‌و ده‌مه‌قاڵێ له ئایینی خوادا ناكه‌ین، چونكه بیركردنـه‌وه لـه (ذات)ی خـواو به‌ڵگـه هێنانـه‌وه ده‌ربـاره‌ی چـۆنیه‌تی (ذات)ی خـوا، پیشـه‌ی (أَهْـل البِدْعَـة)یـه، پێغه‌مبـه‌رﷺ ئه‌فه‌رموێ: ﴿تَفَكَّرُوا فِـي آلاَءِ اللهِ وَلاَ تَفَكَّـرُوا فِـي‌اللهِ﴾ رواه الطبراني وابن عدي والبيهقي، قال السخاوي: هذه الأحاديث أسانيدها كلها ضعيفة لكن اجتماعها يكسب قوة. (فيض القدير) ل٣٤٧ ب٢، بیر لـه نیعمه‌تـه‌كانی خـوا بكه‌نـه‌وه، بـه‌ڵام بـیر لـه زاتـی خـوا مه‌كه‌نه‌وه. چونكه زاتی خوا وه‌كو هیچ شتێك نیه ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ كه‌وابوو: به هـه‌ر شێوه‌یه‌ك تێی بڕوانی، وا نیه، (شێخ معروف النودهی) ئه‌فه‌رموێ:

﴿ بِما، وَكَيْفَ، وَمَتَى، السُّؤَالُ * عَنْهُ وَأَيْنَ، مَا لَهُ مَجالُ ﴾

ڕێگه‌ی ئه‌م پرسیارانه نیه: خوا چی‌یه؟ خوا چۆنه؟ كه‌ینێ بووه‌ته خوا؟ خوا له كوێ‌یـه؟ بڕوانه (أَبْهَى القَلائِدْ) ل٣٤.

كه‌وابوو: هه‌ركه‌سێكو هه‌ر كۆمه‌ڵێك لـه زاتـی خـوا بكۆڵێتـه‌وه‌و ململانـه‌و ده‌مـه‌قاڵێ بكـا، نیشانه‌ی گومڕابوونیه‌تی، پێغه‌مبـه‌رﷺ ئه‌فـه‌رموێ: ﴿مَا ضَلَّ قَوْمٌ بَعْدَ هُدًى كَانُوا عَلَيْهِ إِلاَّ أُوتُوا الْجَدَلَ﴾ رواه الترمذي وحسنه، هیچ كۆمه‌ڵێك گومڕا نـابن پـاش ئـه‌وه‌ی چـوبنه سه‌ر ڕێی هیدایه‌ت، مه‌گه‌ر تووشی ململانه‌و ده‌مه‌قاڵێ بن.

## ﴿باسی (مُتَشَابِهَاتُ القُرآن وَالحَدِيث)﴾

بزانه: له قورئانی پیرۆزو له حه‌دیسـه‌كانی پێغه‌مبـه‌رداﷺ چـه‌ند ووشـه‌یه‌ك هه‌یـه پێیـان ئـه‌گوترێ: (مُتَشـابِه)، واتـه: وێكچـوویی، واتـه‌ی ئـه‌م (مُتَشـابِهات)ه ئاشـكرا نیـه: وه‌كـو ووشه‌ی سه‌ره سوره‌ته‌كان: ق، ص، حم، طسم...هتد، و(آياتُ الصِّفات): وه‌كو (يَدُ اللهِ)و (وَجْهُ رَبِّكَ)و (مَنْ فِي السَّماءِ)و (الرَّحْمَنُ عَلَى العَرْشِ اسْتَوَى)و...هتد، واته: ئه‌و ووشـانه‌ی واته‌ی لاشه‌و ئه‌ندام‌و شوێنی خوایان لێ‌ئه‌فامێته‌وه.

ده‌رباره‌ی ئه‌م جۆره ئایه‌تانه (أهل السُّنَّة) چینی (سَلَف)و زانایانی (حَدِيث) ئه‌فـه‌رموون: ئیمانمان به‌و ئایه‌تانه هه‌یه‌و ئه‌و واتـه‌یه‌ی مه‌به‌ستی خوایه (تَفْوِيض)ی ئه‌كه‌ین‌و ئه‌یده‌ینه پاڵ زانستی خوا، ئێمه واته‌یان ناڵێین، باوه‌ڕیشمان وایه: واته‌ی ڕاسته‌قینه‌ی ئه‌م ووشانه بۆ خوا ناگوترێ. (الإتقان في علوم القرآن) ل٦ ب٢.

ئیمام (مالك والشافعی وأحمد)و زانایانیتری (السَّلَف الصَّالح) فەرموویانە: ئێمە بەو ئایەتانەدا ئەڕۆین‌و چۆن هاتون ئەیانخوێنینەوەو لێیان ناکۆڵینەوەو باوەڕیشمان وایە: واتەی ئاشکرای ئەم ووشانە مەبەست نیەو بۆ خوا بەکار نایێ. بڕوانە (الكَوْكَبُ الأزهَر شَرح الفِقْه الأكْبَر للإمام الشّافعی) ل٦٨، و(تَفسیر إبن كَثیر) ل٢٢٠ ب٢.

خوای گەورە دەربارەی (مُتَشابهاتُ القُرآن) ئەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِی أَنْزَلَ عَلَیْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آیَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِینَ فِی قُلُوبِهِمْ زَیْغٌ فَیَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِیلِهِ وَمَا یَعْلَمُ تَأْوِیلَهُ إِلاَّ اللهُ، وَالرَّاسِخُونَ فِی الْعِلْمِ یَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا یَذَّكَّرُ إِلاَّ أُولُوا الأَلْبَابِ﴾ آل عمران:٧،

خوای گەورە قورئانی بۆ تۆ ناردۆتە خوارەوە: هەندێك لە ئایەتەكانی ئەم قورئانە واتەیان ئاشكرایەو ئەوان مەبەستی بنەڕەتی قورئانن-چونكە بۆ حەرام‌و حەڵاڵ‌و كاروباریتری ژیان هاتوون- هەندێك ئایەتی تریش (مُتَشابهات)ن، چونكە ووشەكە بە ووشەیەكیتر ئەچێ‌و واتەكەشی جیایەو ئاشكرا نیە، جا ئەو كەسانەی لە ڕاستی لایانداوە-وەكو (أهْل البِدْعَة)- بە شوێن ئایەتی (مُتَشابهات)دا ئەگەڕێن‌و خۆیان پێوە خەریك ئەكەن‌و ئەیانكەنە بەڵگەی خۆیان: تاكو خەڵكی گومڕا بكەن، بە هەوەسی خۆیان مانای لێ ئەدەنەوە، لە كاتێكدا هیچ كەس مەبەستی ئەم وێكچووانە نازانی تەنها خوا ئەیزانێ، جا ئەوانەی لە زانستدا ڕۆچوون ئەڵێن: باوەڕمان بەم وێكچووانە هەیە: گشتی فەرمودەی خوایە، كەس ئەو ئامۆژگارییە وەرناگرێ، تەنها خاوەن عەقڵەكان نەبێ.

﴿عَنْ عَائِشَةَ رضی الله عنها قَالَتْ: تَلاَ رَسُولُ اللهِ ﷺ هَذِهِ الآیَةَ، فَقَالَ: إِذَا رَأَیْتُمُ الَّذِینَ یَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ فَأُولَئِكَ الَّذِینَ سَمَّى اللهُ، فَاحْذَرُوهُمْ﴾ رواهُ البخاری وَمُسْلِم، (عَائِشَة) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە -آل عمران:٧- ئینجا فەرمووی: هەر كاتێك ئەو كەسانەتان دیتن كە بە دوای ئایەتی (مُتَشابهات)دا ئەگەڕێن، ئەوانە ئەو كەسانەن كە خوا لەم ئایەتەدا بە خراپە ناوی هێناون، ئێوە خۆتان لەم جۆرە كەسانە بپارێزن‌و لێیان دوور كەونەوە.

(إبن حَجَر العَسْقَلانی) ئەفەرموێ: ئەم ئایەتە باسی ئەو كەسانەی بە خراپە كردوە: كە بە شوێن (مُتَشابهات)دا ئەگەڕێن، باسی ئەو كەسانەشی بە چاكە كردوە: كە زانستەكە (تَفویض) ئەكەن‌و ئەیدەنە پاڵ زانستی خوا، ئینجا ئەفەرموێ: یەكەمجار شوێنكەوتنی (مُتَشابه) لە جوولەكانەوە ئاشكرا بوو، ئینجا یەكەمجاریش لە ئیسلامدا لە ناو (خَوارج)دا ئاشكرا بوو. بڕوانە (فتح الباری) ل٢٦٥و٢٦٧ ب٨. بگەڕێوە بۆ باسی (سنووری لاشەو ئەندام‌و عەرش‌و كورسی) لەم كتێبەدا.

وَلاَ نُجَادِلُ فِي الْقُرْآنِ، وَنَشْهَدُ أَنَّهُ كَلاَمُ رَبِّ الْعَالَمِينَ، نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الأَمِينُ، فَعَلَّمَهُ سَيِّدَ الْمُرْسَلِينَ مُحَمَّداًﷺ وَهُوَ كَلاَمُ اللهِ تَعَالَى لاَ يُسَاوِيهِ شَيْءٌ مِنْ كَلاَمِ الْمَخْلُوقِينَ، وَلاَ نَقُولُ بِخَلْقِهِ، وَلاَ نُخَالِفُ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ. وَلاَ نُكَفِّرُ أَحَداً مِنْ أَهْلِ الْقِبْلَةِ بِذَنْبٍ مَا لَمْ يَسْتَحِلَّهُ، وَلاَ نَقُولُ لاَ يَضُرُّ مَعَ الإِيمَانِ ذَنْبٌ لِمَنْ عَمِلَهُ،

---

ئیمامی (الطحاوی) لەم بابەتەدا ئەفەرموێ:

(وَلاَ نُجَادِلُ فِي الْقُرْآنِ) ململانەو دەمەقاڵێ لە واتەی قورئاندا ناکەین، وەکو (أَهْل البِدْعَة) وا ئەکەنو (وێکچووەکان) بە بەڵگە دێننەوە (وَنَشْهَدُ أَنَّهُ كَلاَمُ رَبِّ الْعَالَمِينَ) شاهیدی ئەدەین (قورئان) فەرموودەی پەروەردگاری بوونەوەرە (نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الأَمِينُ) حەزرەتی (جُبْرائِيل) هێناویە خوارەوە (فَعَلَّمَهُ سَيِّدَ الْمُرْسَلِينَ مُحَمَّداًﷺ) بە فەرمانی‌خوا (جُبْرائِيل) قورئانی فێری پێغەمبەرﷺ کردوە (وَهُوَ كَلاَمُ اللهِ تَعَالَى) قورئان فەرموودەی خوایە، گوتەی (جُبْرائِيل) نیە (لاَ يُسَاوِيهِ شَيْءٌ مِنْ كَلاَمِ الْمَخْلُوقِينَ) گوتەی خەڵك نایەتە ریزی قورئانو یەکسان نابن (وَلاَ نَقُولُ بِخَلْقِهِ) ئێمە ناڵێین: قورئان دروستکراوە، وەکو (مُعْتَزِلَة) وا ئەڵێن: (وَلاَ نُخَالِفُ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ) ئێمە لە کۆمەڵی موسوڵمانان جیا نابینەوەو ناچینە سەر رارەوی (أَهْل البِدْعَة)و خۆمان بە (مُتَشابِهاتُ القُرآن وَالحَدِيث) خەریك ناکەین.

## ﴿ موسوڵمان بە گوناهکردن کافر نابێ ﴾

ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَلاَ نُكَفِّرُ أَحَداً مِنْ أَهْلِ الْقِبْلَةِ) ئێمەی (أهل السُّنَّة) هیچ موسوڵمانێك -کە ڕوو لە قیبلە بکا- بە کافری دانانێین (بِذَنْبٍ) بەهۆی گوناه کردن: جا گوناهەکە بچووك بێ، یان گەورە بێ (مَا لَمْ يَسْتَحِلَّهُ) بەو مەرجەی ئەو گوناهە بە حەڵاڵ نەزانێ، واتە: ئەگەر گوناهەکە بە حەڵاڵ تێگەیشت، ئەوە کافر ئەبێ.

(ابن حَجَرالهَيْتَمي) لە شەرحی (مِنهاج النَّواوي)دا ئەفەرموێ: هەر کەسێك حەرامێك حەڵاڵ بکا، کە بە یەکدەنگی حەرام بێ: وەکو زیناو نێربازیو شەراب خواردنەوەو گومرگ وەرگرتن، ئەوە کافر ئەبێ، چونکە ئەبێتە بە درۆخستنەوەی پێغەمبەرﷺ، واتە: باوەڕ پێنەکردنی، هەروەها: حەرامکردنی حەڵاڵیش وەهایە. بڕوانە (تحفة المحتاج) ل٨٧ ب٩.

(وَلاَ نَقُولُ لاَ يَضُرُّ مَعَ الإِيمَانِ ذَنْبٌ لِمَنْ عَمِلَهُ) ئێمەی (أهل السُّنَّة) ناڵێین: ئەگەر مرۆڤ ئیماندار بێ، گوناه کردن زیانی لێ نادا، بەڵکو ئەڵێین: گوناه کردن زیانی هەیەو باوەڕ کەم ئەکاتەوەو مرۆڤ بە گوناه کردن (فَاسق) ئەبێ، بەڵام (كَافر) نابێ.

ئیمامی (النولوی) ئەفەرموێ: (أهل الحَق)-واتە: (أهل السُّنَّة)- یەکدەنگن: کە زیناکەرو دزو مرۆڤکوژو خاوەن تاوانە گەورەکانی‌تر-جگە لە کافربوون- هیچیان بەم گوناهانە کافر نابن، بەڵکو ئیماندارنو ئیمانیان ناتەواوە. بڕوانە (شرح صحیح مسلم) ل٣٦٢ ب١.

نَرْجُو لِلْمُحْسِنِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنْ يَعْفُوَ عَنْهُمْ وَيُدْخِلَهُمُ الْجَنَّةَ بِرَحْمَتِهِ، وَلاَ نَأْمَنُ عَلَيْهِمْ وَلاَ نَشْهَدُ لَهُمْ بِالْجَنَّةِ وَنَسْتَغْفِرُ لِمُسِيئِهِمْ وَنَخَافُ عَلَيْهِمْ وَلاَ نُقَنِّطُهُمْ.

---

ئینجا بزانە: ڕای (أهْل البِدْعَة) دەربارەی خاوەن گوناهی گەورە بەم شێوەیە:

- (مُرْجِئَة) ئەڵێن: ئەگەر مرۆڤ ئیماندار بێ، هیچ گوناهێك زیانی نیە، واتە: لە سەر هیچ گوناهێك خوا سزای نادا، هەروەکو هیچ کردەوەیەکی چاك لەگەڵ (کُفر)دا سوودی نیە.
- (خَوارِج) ئەڵێن: مرۆڤی ئیماندار بە گوناهی گەورە لە ئیمان دەرئەچێو کافر ئەبێو بە یەکجاری لە دۆزەخدا ئەمێنێتەوە.
- (مُعْتَزِلَة) ئەڵێن: مرۆڤی ئیماندار بە گوناهی گەورە لە ئیمان دەرئەچێ، بەڵام کافر نابێ، بەڵکو لە نێوان (کُفر)و (إیمان)دا ئەمێنێتەوەو بە یەکجاری ئەچێتە دۆزەخ، جا ئەمە پێی ئەگوترێ: (الْمَنْزِلَة بَيْنَ الْمَنْزِلَتَيْن). بڕوانە (شرح الطحاوية) ل٤٣٤ ب٢.

## ﴿ باسی ترسان لە خواو تکاکردنی ڕەحمەتی خوا (الخَوْفُ وَالرَّجاءُ) ﴾

ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(نَرْجُو لِلْمُحْسِنِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ) تکا ئەکەین: بۆ ئیماندارانی باش‌و چاکەکار (أَنْ يَعْفُوَ عَنْهُمْ) خوای گەورە لێیان ببورێ‌و (وَيُدْخِلَهُمُ الْجَنَّةَ بِرَحْمَتِهِ) بیانباتە بەهەشت بە ڕەحمەتی خۆی، چونکە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿لاَ يُدْخِلُ أَحَدًا مِنْكُمْ عَمَلُهُ الْجَنَّةَ وَلاَ يُجِيرُهُ مِنَ النَّارِ، وَلاَ أَنَا إِلاَّ بِرَحْمَةٍ مِنَ اللهِ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، کردەوەی هیچ کەسێکتان: نە ئەیباتە بەهەشت‌و نە لە ئاگر ئەیپارێزێ، منیش کردەوەکانم نامباتە بەهەشت‌و لە ئاگر نامپارێزێ، تەنها بە ڕەحمەتی خوا نەبێ.

(وَلاَ نَأْمَنُ عَلَيْهِمْ) لێیان دڵنیا نابین: کە خوا عەزابیان نەدا (وَلاَ نَشْهَدُ لَهُمْ بِالْجَنَّةِ) شاهیدی نادەین: بە چوونە بەهەشت بۆ هیچ ئیماندارێکی دیارکراو، مەگەر خواو پێغەمبەرﷺ شاهیدییان بۆ دابێ: وەکو پیاوەکەی (یس)و (العَشَرَة المُبَشَّرَة)...هتد، بەڵام بە گشتی، شاهیدی ئەدەین: کە ئیمانداران ئەچنە بەهەشت، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ يُدْخِلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ مُحَمَّدﷺ:١٢، بێگومان خوای گەورە بە ڕەحمەتی خۆی ئەو کەسانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردوە، ئەیانباتە ئەو بەهەشتانەی ڕووبار لە ژێر درەختەکانیاندا ئەڕوا.

(وَنَسْتَغْفِرُ لِمُسِيئِهِمْ) داوای لێخۆشبوونی گوناهەکان لە خوای گەورە ئەکەین بۆ ئیماندارانی خراپ‌و تاوانبار (وَنَخَافُ عَلَيْهِمْ) ئەترسێین خوا لە سەر تاوانەکانیان سزایان بدا (وَلاَ نُقَنِّطُهُمْ) بەڵام بێئومێدیان ناکەین لە ڕەحمەتی خوا، چونکە –جگە لە کافربوون– خوا لە هەموو گوناهێك خۆش ئەبێ، ئەگەر حەز بکا.

وَالأَمْنُ وَالإِيَاسُ يَنْقُلاَنِ عَنْ مِلَّةِ الإِسْلاَمِ، وَسَبِيلُ الْحَقِّ بَيْنَهُمَا لأَهْلِ الْقِبْلَةِ.

## ﴿ باسی دڵنیابوون و بێئومێدی (الأَمْنُ وَالْيَأسُ) ﴾

بزانە: واجبە مرۆڤ لە نێوان (خَوْفُ)و (رَجَاءْ)–واتـە: تـرس و تکـادا–بـێ، بـە شـێوەیەکی وەها: لە عەزابی خوا بترسێ، بەڵام بێئومێد نەبێ لـە ڕەحمـەتی خـوا. تکـای ڕەحمـەتی خوا بکا، بەڵام دڵنیا نەبێ لە عەزابی خوا.

ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَالأَمْنُ) دڵنیابوون لە عەزابی خوا، کە باوەڕی وابێ خوای گەورە هیچ کەسێك سـزا نـادا (وَالإِيَاسُ) بێئومێدبوون لە ڕەحمەتی خوا، کە باوەڕی وابێ خـوا ڕەحـم بـە هـیچ کەسـێك ناکا (يَنْقُلاَنِ) هەردووکیان مرۆڤ لائەدەن (عَنْ مِلَّةِ الإِسْلاَمِ) لە ئوممەتی ئیسلام، واتە: ئـەم جۆرە دڵنیاکردنەو بێئومێدکردنە: مرۆڤ کافر ئەکەن، چـونکە خـوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿إِنَّهُ لاَ يَيْئَسُ مِنْ رَوْحِ اللهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الكَافِرُونَ﴾ یوسـف:٨٧، هـیچ کەسـێك بێئومێد نابێ لە ڕەحمەتی خوا، تەنها کافرەکان بێئومێد ئـەبن. ﴿فَلاَ يَأْمَنُ مَكْرَ اللهِ إِلاَّ الْقَـوْمُ الْخَاسِــرُونَ﴾ الأعـراف:٩٩، هـیچ کەسـێك دڵنیـا نابـێ لـە عـەزابی خـوا، تـەنها کـافرە زەرەرمەندەکان دڵنیا ئەبن.

واتە: مرۆڤی (کافر) لە بەر ئەوە بێئومێدە لـە ڕەحمـەتی خـواو دڵنیایـە لـە عـەزابی خـوا، چونکە هەر باوەڕی بە خواو بە ڕەحمەتی خواو بە عەزابی خوا نیە، بەڵام مرۆڤی موسوڵمان باوەڕی بە خـواو بـە ڕەحمـەتی خـواو بـە عـەزابی خـوا هەیـە، کەوابوو: دروست نیـە: نـە بێئومێد بکرێ، نە دڵنیا بکرێ، چونکە خوای گەورە ئەفـەرموێ: ﴿يُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ وَيَرْحَمُ مَنْ يَشَاءُ﴾ العنكبوت:٢١، خوای گەورە ئەگـەر حـەز بکـا: عـەزابی ئـەدا، ئەگـەر حـەز بکـا: ڕەحمی پێ ئەکا. ئیتر ئێمە نازانین: ڕەحم بە کێ ئەکاو کێ سزا ئـەدا، چـونکە حـەزکردنی خوا لـە ئێمـە دیـار نیـە (وَسَبِيلُ الْحَقِّ) ڕێگـەی ڕاسـتی (أهـل السُّنَّة)، (بَيْنَهُمَـا) لـە نێـوان دڵنیایی و بێئومێدیدایە (لأَهْلِ الْقِبْلَةِ) دەربارەی موسوڵمانی ڕوو لە قیبلە.

(إبن حَجَر العَسْقَلاَني) لـە (کرمـانی) ئەگێڕێتـەوەو ئەفـەرموێ: پێویسـتە مـرۆڤ لـە نێـوان (خَوْف)=ترس و (رَجاءْ)=تکادا بێ، نەوەکو لە (رَجاء)=تکادا لـە سـنوور دەربچـێ و وەکـو (مُرْجِئَة) بڵێ: هیچ گوناهێك لەگەڵ ئیماندا زیانی نیە، هەروەها لە (خَـوْف)=ترسیشـدا لـە سـنوور دەرنەچێ، وەکو (خَوارِج)و (مُعْتَزِلَة) بڵێ: بە یـەکجاری لـە دۆزەخـدا ئەمێنێتـەوە، بـەڵکو مامنـاوەنجی بـێ، لـە نێـوان هەردووکیانـدا، هـەروەکو خـوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿يَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ﴾ الإسراء:٥٧، تکای ڕەحمەتی خوا ئەکەن و لە عـەزابی خوا ئەترسن. جـا هەرکەسـێك تەماشـای بنچینەو لقـەکانی ئیسـلام بکـا، ئـەبینی گشـتی مامناوەنجییە. بڕوانە (فتح الباري) ل٣٦٥ ب١١.

ئیمامی (النواوي) ئەفەرموێ: زانایان هاودەنگن: کە لەعنەت لێکردن حەرامە، چونکە (لَعْنَة) لە شەرعدا بە واتای دوورخستنەوە لە ڕەحمەتی خوا هاتوە، کەوابوو: دروست نیە: کەسێك لە ڕەحمەتی خوا دوور بخەینەوە: کە نەزانین دواکردەوەی چی یە بە زانستێکی بێگومان، بۆیێ زانایان فەرموویانە: دروست نیە لەعنەت لە کەسێکی دیارکراو بکرێ، جا موسوڵمان بێ، یان کافر بێ، یان ئاژەڵ بێ، مەگەر لە ڕێگەی شەرعەوە بزانین: ئەم دیارکراوە بە کافری مردووە، یان ئەمرێ: وەکو (أَبُو جَهْل)و (شَيْطان)، بەڵام لەعنەتکردن بە سیفەتێکی گشتی دروستە: وەکو لەعنەت لە ڕیباخۆران‌و کافران‌و زاڵمان‌و...هتد. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٣٩٢ ب١.

پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ لَعَنَ شَيْئاً لَيْسَ لَهُ بِأَهْلٍ رَجَعَتِ اللَّعْنَةُ عَلَيْهِ﴾ رواه أبوداود والترمذي بسند حسن، هەرکەسێك لەعنەت لە شتێك بکا، ئەو شتەش بەرلەعنەت نەبێ، ئەوە لەعنەتەکە ئەگەڕێتەوە سەر خۆی.

﴿ئاگاداری﴾ کافربوون بە هۆی (أمن)=دڵنیابوون‌و بە هۆی (يَأْس)=بێ‌ئومێدی، ڕاڕەوی زانایانی (عَقيدَة)یە، (هەروەکو لێرەدا ئەیبینی)، هەروەها بشڕوانە (شرح العقائد النَّسفية) ل١٩١. بەڵام لە لای زانایانی (تَفْسير)و (حَديث) بێ‌ئومێدی بە گوناهی گەورە داندراوە، بڕوانە (تَفْسِير القُرْطُبي) ل٢٥٢ ب٩و (فتح الباري) ل٤٧٦ ب١٣.

هەروەها لە لای زانایانی (فِقْه) دڵنیایی‌و بێ ئومێدی هەردووکی بە گوناهی گەورە داندراون، بڕوانە (مُغْني‌الْمُحْتاج بِشَرْحِ الْمِنْهاج) ل٤٢٧ ب٤. جا ئەگونجێ –وَاللهُ أَعْلَمُ– ئەم زانا بەڕێزانە مەبەستیان ئەو جۆرە (أَمْن)و (يَأْس) نەبێ: کە زانایانی (عَقيدَة) مەبەستیانەو لە پێناسەدا ئەڵێن: بێ‌ئومێدکردن‌و دڵنیاکردنی خەڵك، بەڵکو مەبەستیان ئەو جۆرە (أَمْن)و (يَأْس)ە بێ: کە مرۆڤ هەر بەرانبەری بە خۆی دڵنیا بێ‌و بێ‌ئومێد بێ.

## ﴿ باسی (کافر)بوون‌و، جۆرەکانی (کُفْر)﴾

بزانە: (کافر) دوو بەشە: یەکەم (الكافِرُالأَصْلي) واتە: کافری بنەڕەتی: کە هەر بە نەژادەوە کافر بێ. دووەم: (مُرْتَدّ) واتە: موسوڵمانی کافربووەوە: کە بە خۆی، یان بە نەژادەوە موسوڵمان بێ، ئینجا بگەڕێتەوە بۆ کافربوون.

ئیمامی (الطحاوي) دەربارەی بەشی دووەم ئەفەرموێ:

(وَلاَ يَخْرُجُ الْعَبْدُ مِنَ الإِيمَانِ) بەندە لە ئیمان دەرناچێ‌و نابێتە کافر (إِلاَّ بِجُحُودِ مَا أَدْخَلَهُ فِيهِ) مەگەر باوەڕی بەو شتە نەبێ، کە پێی هاتوتە ناو ئیمان، واتە: باوەڕی بە شتێك لەو ئاینە نەبێ: کە پێغەمبەرﷺ لە لای خواوە هێناویەتی، ئینجا بزانە: ئەم فەرموودەیە هەموو جۆرە کافربوونێك ناگرێتەوە، چونکە ئیمامی (النواوي) ئەفەرموێ: کافربوونەوە:

پچڕاندنی ئیسلامەتی یە، جا بە دڵ نیازی وابێ: خۆی کافر بکا، یان بە زوبان (کُفر)ێك بکا، یان بە کردار (کُفر)ێك بکا، جیاوازی نیە ئەم (کُفر)کردنە: بە گاڵتە بێ، یان بە ڕقەکاری بێ، یان بە باوەڕەوە بێ، کەوابوو: هەرکەسێك بڵێ: خوا نیە، یان پێغەمبەر نیە، یان بڵێ: فڵان پێغەمبەر درۆ دەکا، یان حەرامێك حەڵاڵ بکا، یان حەڵاڵێك حەرام بکا –کە بە یەکدەنگی حەرام، یان حەڵاڵ بێ– یان واجبێکی ئیسلام بە واجب دانەنێ، یان شتێك واجب نەبێ و بە واجبی دابنێ –کە بە یەکدەنگی واجب، یان ناواجب بێ– ئەوە کافر ئەبێ. بڕوانە (تحفة المحتاج) ل٧٩ تا٩١ ب٩.

بە کورتی هەرکەسێك باوەڕی بە هەر شەش ڕوکنەکانی ئیمان نەبێ، یان لە هەموو بوارێکەوە باوەڕی بە شەریعەتی ئیسلام نەبێ، ئەوە کافرە، هەروەك ڕوونی ئەکەینەوە.

## ﴿ جۆرەکانی (کُفر) ﴾

بزانە: دەربارەی باوەڕ بە خواو بە پێغەمبەرﷺ باوەڕ بە خوایەتی خواو بە تاكو تەنیایی خوا، چوار جۆرە (کُفر) هەنەو، کافرەکان چوار جۆرن:

**یەکەم**: کوفری (إنکار)=(جُحُود)، واتە: دانەنەهێنان بە هەبوونی خوا، جیاوازی نیە: بە دڵیش باوەڕی بە هەبوونی خوا نەبێ، یان بە دڵ باوەڕی هەبێ، بەڵام بە زوبان بڵێ: خوا نیە. وەکو کوفری (فِرْعَون)، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَاأَيُّهَا الْمَلأُ مَا عَلِمْتُ لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرِي﴾ القصص:٣٨، (فِرْعَون) گوتی: ئەی خەڵکینە نەمزانیوە ئێوە هیچ خوایەکتان هەبێ جگە لە من. (إبن أبي العزّ) ئەفەرموێ: (فِرْعَون) زیاتر لە هەموو کەس بەوە ناسرا بوو: کە دانی بە هەبوونی خوا نەئەهێنا، بە دڵیش ئەیزانی خوا هەیە. بڕوانە (شرح الطحاوية) ل٢٦ ب١. ئێنجا بزانە: کوفری (مارکسية) کە لە سەردەمی ئێستاماندا بڵاو بۆتەوە، وەکو کوفری (فِرْعَون) وایە، چونکە دان بە هەبوونیخوادا ناهێنن!!!.

**دووەم**: کوفری (إباء)=(عناد) واتە: ڕقەکاری و دانەنەهێنان بە (أُلوهيَّة)=خوایەتی خوا، هەرچەند باوەڕیشی بە هەبوونی خواو بە (رُبوبيَّة)=پەروەردگاریەتی خوا هەبێ، وەکو کوفری (إبْليس)=شەیتان، واتە: شەیتان باوەڕی بە هەبوونی خواو بە (رُبوبيَّة)= پەروەردگاریەتی خوا هەبوو، چونکە دانی پێدا هێناو گوتی: ﴿خَلَقْتَنِي مِنْ نَارٍ وَخَلَقْتَهُ مِنْ طِينٍ﴾ الأعراف:١٢، خوایە منت لە ئاگر دروست کردووەو (آدَم)شت لە قوڕ دروست کردووە. بەڵام لەبەر ئەوە شەیتان کافرە، چونکە دانی بە (أُلوهيَّة)=خوایەتی خوا نەهێناو ڕەخنەی لە یاسای خوا گرتو گوتی: ﴿أَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا﴾ الإسراء:٦١، چۆن ڕەوایە من سوجدە بۆ (آدَم)ێك ببەم کە لە قوڕ دروستت کردووە؟. بەڵێ:–لەم یاسا دانانەدا– شەیتان خوای گەورەی بە لێنەزان و بەهەڵەداچوو داناو گوتی: ﴿أَنَا خَيْرٌ مِنْهُ﴾ الأعراف:١٢، من لە (آدَم) چاکترم!!!.

ئینجا بزانە: کوفری (دیمقراطیـة)[١٥] و (إشتراكيَّة)و (ماسۆنيَّة) گشتیان وەکو کوفری شەیتانە؟ چونکە ئەم سیستەمانە-هەرچەند باوەڕیان بە هەبوونی خوا هەبێ- بەڵام باوەڕیان بە (ألوهيَّة)=خوایەتی خوا نیەو دانی پێدا ناهێنن، چونکە خوای گەورە، بە (حَاكِم) دادوەر ناناسن‌و-وەکو شەیتان- ڕەخنە لە یاسای خوا ئەگرن‌و ئەڵێن: یاسای دەستکرد لە یاسای خوا باشترە، بۆ دڵنیایی بڕوانە (شرح الطحاوية) ل٤٤٦ ب٢.

**سێیەم**: کوفری (إشْراك) هاوبەش دانان بۆ خوا: لە (ألوهيَّة)=خوایەتی‌دا، واتە: لە (حاكميَّة)=دادپەروایی‌دا، یان لە (عبادَة)=پەرستندا، وەکو کوفری (قُرَيْشي)یەکانی (مَكَّة)، واتە: (قُرَيْشي)یەکان باوەڕیان بە (رُبوبيَّة)=پەروەردگاریەتی خوا هەبوو چونکە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللهُ﴾ لقمان:٢٥، ئەگەر لێیان بپرسی کێ ئاسمان‌و زەمینی دروست کردوە؟ لە وەڵاما ئەڵێن: خوا دروستی کردون. هەروەها باوەڕیشیان بە (ألوهيَّة)=خوایەتی خوا هەبوو، بەڵام هاوبەشیان بۆ دائەناو ئەیانگوت: ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إلاَّ لِيُقَرِّبُونَا إلَى اللهِ زُلْفَى﴾ الزمر:٣، ئێمە هەر بۆ ئەوە ئەم بتانە ئەپەرستین: تاکو لە خوامان نزیك بکەنەوە.

---

(١٥)- (دیمُقراطيَّة) سیستەمێکە لە کافرەکان وەرگیراوەو باوەڕی بە یاسای ئیسلام نیەو ئەڵێ: پێویستە گەل بە خۆی نوێنەری خۆی هەڵبژێرێ، تاکو لە (بَرلَمان) یاسای دەستکردیان بۆ دابنێن‌و خەڵکیش ڕەفتاری پێ‌بکا، هەرچەند ئەم یاسایەش بە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلام بێ، ئینجا ئەم سیستەمەی (دیمقراطيَّة) بە ڕوشەی سەرفڕێزو بێ ئاڵۆز خەڵکیان بەنج کردوەو لە ژێر دروشمی مافی مرۆڤو مافی ئافرەت‌و...هتد، پێیان ئەڵێن: ئیسلام لەگەڵ سەردەمی ئێستادا ناگونجێ، چونکە یاسای ئیسلام ناتەواوەو چارەی کێشەکانی خەڵك ناکاو ستەمکارەو مافی مرۆڤو ئافرەت‌و گەل نادا. کەواتە: ئێمەی ڕۆشنبیر-ئەندامانی بەرلەمان- یاسایەکی باشتر لە یاسای ئیسلام بۆ ئێوە دائەنێین.

ئینجا ئێمەی موسوڵمان لێیان ئەپرسین: ﴿أَأَنْتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللهُ﴾ البقرة:١٤٠، ئایا ئێوە زاناترن، یان خوای گەورە؟. ئینجا هەرچەند دەمکوتن لە بەرامبەر ئەم پرسیارە، ئێمە هەر بە فەرموودەی خوا وەڵامیان ئەدەینەوە: ﴿فَلاَ تَضْرِبُوا لِلّهِ الأَمْثَالَ إنَّ اللهَ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ النحل:٧٤، هاوێنە بۆ خوای گەورە دامەنێن، خوای گەورە ئەزانێ‌و ئێوە نازانن. کەواتە: ئێوە خۆتان مەکەنە هاوێنەی خوا، چونکە هەر ئەو خوایە بە تەنها ئەم خەڵکەی دروست کردوەو هەر ئەو خوایەش بە تەنها مافی هەیە: یاسایەك بۆ دروستکراوی خۆی دابنێ، ئێمە بەندەی خوای گەورەین، نەك بەندەی ئێوەی بەند کراو بە داوی شەیتان.

ئینجا بە داخەوە: زۆر لە موسوڵمانان-بە تایبەتی ئەوانەی خۆیان بە زاناو ڕۆشنبیر دائەنێن- بانگەوازی بۆ (دیمُقراطيَّة) ئەکەن‌و ئەڵێن: (دیمُقراطيَّة) دژ بە ئیسلام نیەو ئیسلام هەر بە خۆی ئایینێکی (دیمُقراطي)یە. ئایا نازانن: شەیتان بۆیێ لەعنەتی لێکرا، چونکە ڕەخنەی لە یاسای خوا گرت‌و پێی ڕازی نەبو و گوتی: ﴿أَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِيناً﴾ الإسراء:٦١، چۆن سوجدە بۆ (آدَم)ێك ببەم کە لە قوڕ دروستت کردوە؟. جگە لەمەش: یاسای خۆی پێ باشتر بوو لە بڕیاری خوای گەورەو، خوای گەورەی بە لێنەزان داناو گوتی: ﴿أَنَا خَيْرٌ مِنْهُ﴾ الأعراف:١٢، من لە ئادەم چاکترم. ئینجا بە ویژدانتان جیاوازی چییە؟! ڕوونکەرەوە.

بەڵێ: (قُرَيْشى)یەکان بۆیێ هاوبەشیان بۆ خوا دائەنا، چونکە باوەڕیان وابوو: یەك خودا بە تەنها بەڕوەستی حوکمڕانی ئەم خەڵکە ناکاو ئەیانگوت: ﴿أَجَعَلَ الآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ﴾ص:٥، ئایا (مُحَمَّدﷺ) خوایەتی کردۆتە مافی یەك خودا بە تەنها؟ ئەوە شتێکی سەیرە!!!.

ئینجا بزانە: کوفری (علمانيَّة) وەکو کوفری (قُرَيْشى)یەکانە، چونکە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرﷺ هەیە، بەڵام ئەڵێن: یاسای ئیسلام بە تەنها چارەسەری ئەم خەڵکە ناکاو هەمەلایەن نیەو پێویستە یاسای دەستکردیشی لەگەڵدابێ، کەوابوو: نابێ ئایین خۆی تێکەڵی کاروباری دەوڵەت بکا. جا ئەمەش بە پێچەوانەی یەکخواناسینە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾ یوسف:٤٠، دادڕەوایی (حاكِميَّة) تەنها مافی خودایە، فەرمانی داوە: جگە لە خوا کەسیتر نەپەرستن‌و بە (حاكِمْ) دادوەری دانەنێن، ئەوە ئایینی ڕاستەقینەیە.

کەوابو: جگە لە خوا کەسیتر مافی حەڕامکردن‌و حەڵاڵکردنی نیە، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ الأنعام:١٢١، ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی ئەوان بن لە حەڕام‌و حەڵاڵ: بێگومان ئێوە (مُشْرِك)ن، واتە: هاوبەشتان بۆ خوا داناوە. بگەڕێوە بۆ (باوەڕ بە کتێبەکانی خوا).

**چوارەم:** کوفری (نِفاق)=دوو ڕوویی، واتە: مرۆڤی (مُنافِق) بە زوبان شادە بێنێ‌و بڵێ: من موسوڵمانم‌و باوەڕم هەیە، بەڵام لە ڕاستیدا بە درۆ وا بڵێ‌و بە دڵ باوەڕی بە ئیسلام نەبێ. جا ئەم کوفرە بە زۆری لەو کەسانە ڕوو ئەدا: کە لە (دارُ الإِسْلام)=خانەی ئیسلامدا نیشتەجێن، تاکو بتوانن لەگەڵ موسوڵماناندا ژیان بەرنە سەر، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللهِ وَبِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ، يُخَادِعُونَ اللهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا﴾ البقرة:٨-٩، هەندێ کەس هەنە ئەڵێن: باوەڕمان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە. بەڵام لە ڕاستیدا باوەڕدار نین، فێڵ لە خواو لە موسوڵمانان ئەکەن. هەروەها ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ﴾ البقرة:١٤، کاتێ ئەگەنە ئیمانداران، ئەڵێن: باوەڕمان بە ئیسلام هەیە، کاتێ ئەچنەوە لای دۆستە شەیتانەکانی خۆیان، ئەڵێن: ئێمە لەگەڵ ئێوە داین، ئێمە تەنها گاڵتەچین‌و گاڵتە بە موسوڵمانان ئەکەین.

## ﴿ باسی (إيمان)=باوەڕ ﴾

ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(الإيمانُ) پێناسەی باوەڕ: (هُوَ الإقْرارُ باللِّسانِ) ئەوەیە: بە زوبان شادە بێنێو بڵێ: ﴿أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ﴾. (وَالتَّصْديقُ بالْجَنانِ) هەروەها بە دڵیش باوەڕی هەبێ: بە هەموو ئەو ئاینەی پێغەمبەرﷺ لە لای خوا هێناویەتی، واتە: ئیمان کردەوەی دڵو زوبانە بە یەکەوە.

ئینجا بزانە: ئەو فەرموودەی (طَحاوی) ڕاڕەوی ئیمامی (حَنَفی)و چەند زانایەکیترە ﷭.

بەڵام چەند زانایەکیتر فەرموویانە: (إیمان) تەنها باوەڕی دڵە: بە هەموو ئەو ئاینەی پێغەمبەرﷺ لە لای خوا هێناویەتی، شادەهێنان بەشێك نیە لە ئیمان، بەڵکو مەرجە لە ئیماندا: بۆ چەسپاندنی بڕیارەکانی ئیمانداران لە دونیادا بە سەر ئەو کەسانەدا: کە شادەیان هێناوە. مەبەست لەو بڕیارانە: میرات گرتنو مارەبڕینو نوێژ لەسەرکردنو ناشتن لە گۆڕستانی موسوڵمانانو داوالێکردنی نوێژو زەکاتو ڕۆژوو... هتد: بڕیارەکانیتری ئیسلام.

کەوابو: هەرکەسێك بە دڵ ئەم باوەڕەی هەبێ، بەڵام بە زوبان شادە نەهێنێو هیچ بیانۆو ڕقەکاریشی نەبێ، ئەوە لە لای خوا ئیماندارەو لە بڕیارەکانی دونیادا بە کافر دائەنرێ.

هەروەها ئەگەر داوای شادە هێنانی لێکرا، بەڵام لەبەر ڕقەکاری شادەی نەهێنا، ئەوە لە دونیاو لە قیامەتدا کافرە، واتە: هەرچەند بە دڵیش باوەڕی هەبێ، ئەم باوەڕە سوودی نیە.

هەروەها ئەگەر بە زمان شادەی هێناو بە دڵ ئەم باوەڕەی نەبو، ئەوە لە بڕیارەکانی دونیادا ئیماندارەو لە لای خوا کافرەو پێی ئەگوترێ: (مُنافق).

بەڵام هەرکەسێك بە دڵ ئەم باوەڕەی هەبێو لەبەر لاڵی نەتوانی شادە بێنی، ئەوەش لە دونیاو قیامەتدا ئیماندارە، بەو مەرجەی بە ئاماژە باوەڕەکەی ئاشکرا بکا. بگەڕێوە بۆ باسی (ووشەی یەکخوا ناسین).

ئینجا بزانە: ئەم ڕوونکردنەوەیە دەربارەی کافری (أصْلی) بنەڕەتی بوو، کە بیەوێ ببێتە موسوڵمان، چونکە نەتەوەی موسوڵمانان بە ئیماندار دائەنرێنو بڕیارەکانی ئیماندارانیان بە سەردا ئەسەپێنرێ لە دونیادا، هەرچەند بە درێژایی تەمەنیشیان شادە نەهێنن. بۆ ئەم باسە بڕوانە (فتح المبین) ل٥٨و٥٩، (تحفة المرید) ل٢٥و٢٦.

کەوابو: هەردوو لا یەکدەنگن: کە ئەبێ شادە هێنان هەر هەبێ، بەڵام لەوەدا جیاوازن: ئایا شادەهێنان بەشێکە لە ئیمان، یان مەرجە لە ئیماندا؟ إنْ شاءَ اللهُ لە باسی ڕوکنەکانی ئیسلام زیاتر ڕوونی ئەکەینەوە.

وَجَمِيعُ مَا صَحَّ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ مِنَ الشَّرْعِ وَالْبَيَانِ كُلُّهُ حَقٌّ، وَالإِيمَانُ وَاحِدٌ، وَأَهْلُهُ فِي أَصْلِهِ سَوَاءٌ، وَالتَّفَاضُلُ بَيْنَهُمْ بِالْخَشْيَةِ وَالتُّقَى وَمُخَالَفَةِ الْهَوَى وَمُلاَزَمَةِ الأَوْلَى. وَالْمُؤْمِنُونَ كُلُّهُمْ أَوْلِيَاءُ الرَّحْمَنِ وَأَكْرَمُهُمْ عِنْدَاللهِ أَطْوَعُهُمْ وَأَتْبَعُهُمْ لِلْقُرْآنِ. وَالإِيمَانُ: هُوَ الإِيمَانُ بِاللهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ وَحُلْوِهِ وَمُرِّهِ مِنَ اللهِ تَعَالَى،

---

(وَجَمِيعُ مَا صَحَّ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ) هەر فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە ڕێگەیەكی ڕاست بە ئێمە گەیشتبێ (مِنَ الشَّرْعِ وَالْبَيَانِ كُلُّهُ حَقٌّ) دەربارەی شەریعەتو ڕوونكردنەوەی شتیتر، هەمووی ڕاستو ڕەوایە (وَالإِيمَانُ وَاحِدٌ) باوەڕ هەر یەك باوەڕە –كە باوەڕی ناو دڵو شادە هێنانە– (وَأَهْلُهُ) ئیمانداران (فِي أَصْلِهِ سَوَاءٌ) لە بنچینەی ئیماندا یەكسانن–كە پێویستە گشت كەسێك بە دڵ باوەڕی هەبێو بە زوبان شادە بێنێ– بەڵام لە پلەی ئیماندا یەسكان نینو جیاوازن، چونكە باوەڕی پێغەمبەران بەهێزترە لە باوەڕی خەڵكی تر.

(وَالتَّفَاضُلُ بَيْنَهُمْ) گەورەییو بەڕێزی لە نێوان ئیمانداراندا (بِالْخَشْيَةِ وَالتُّقَى) بە هۆیترسان لە خواو خۆ پاراستنە لە تاوان (وَمُخَالَفَةِ الْهَوَى) وە بە هۆی دژایەتی هەولو هەوەسی خۆیەتی (وَمُلاَزَمَةِ الأَوْلَى) وە بە هۆی گرتنە بەری ڕێگەی باشترە لە هەموو خوا پەرستییەكدا (وَالْمُؤْمِنُونَ) ئیمانداران (كُلُّهُمْ أَوْلِيَاءُ الرَّحْمَنِ) گشتیان دۆستی خودان، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿أَلاَ إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ، الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾ یونس:٦٢و٦٣، ئاگادار بن: دۆستانی خوا ترسیان لە سەر نیەو دڵتەنگ نابن، ئەو دۆستانەی باوەڕیان هێناوەو لە خوا ئەترسن. (بڕوانە باسی (وَلِی) لەم كتێبەدا).

(وَأَكْرَمُهُمْ عِنْدَاللهِ) بەڕێزترین ئیماندار لە لای خوا (أَطْوَعُهُمْ وَأَتْبَعُهُمْ لِلْقُرْآنِ) ئەوەیە: كە گوێڕایەڵترو شوێن كەوتووتر بێ بۆ قورئان، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللهِ أَتْقَاكُمْ﴾ الحجرات:١٣، بەڕێزترتان لە لای خوا: ئەو كەسەیە لەخوا ترسنتر بێ.

## ﴿ باسی ڕوكنەكانی (إیمان) ﴾

(وَالإِيمَانُ) باوەڕ لەم شەش ڕوكنانە پێك هاتووە: (هُوَ الإِيمَانُ بِاللهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ) كما رواهُ البخاری ومُسْلم، ئیمان ئەوەیە: باوەڕت هەبێ بە خواو مەلائیكەی خواو كتێبەكانیخواو پێغەمبەرانی خواو ڕۆژی قیامەتو قەزاوقەدەر: چاكەیو خراپەی (وَحُلْوِهِ وَمُرِّهِ) شیرنیو تاڵی (مِنَ اللهِ تَعَالَى) لەلای خواوەیە.

ئینجا بزانە: ئەم شەش ڕوكنانە پێنجیان لەم ئایەتەدا باس كراون: ﴿وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ﴾ البقرة:١٧٧. وە ڕوكنی شەشەم لەم ئایەتەدا باس كراوە: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ القمر:٤٩.

کەواتە: هەرکەسێك باوەڕی بە یەکێك لەم شەش ڕوکنانە نەبێ، ئەوە کافرە، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَكْفُرْ بِاللهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾ النساء:١٣٦، هەرکەسێك کافر بێو باوەڕی بە خواو مەلائیکەو کتێبەکانی خواو پێغەمبەرانی خواو ڕۆژی قیامەت نەبێ، بێگومان کافرە بە کافربوونێکی دوور لە ڕاستی. هەروەها لە بارەی بێباوەڕان بە قەزاو قەدەر، دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ القمر:٤٨-٤٩، لە ڕۆژی قیامەت لە سەر ڕووەکانیان ڕادەکێشرێنو پێیان دەگوترێ: سزای دۆزەخ تام بکەن، ئێمە هەموو شتێکمان بە قەدەر دروست کردوە.

(وَنَحْنُ مُؤْمِنُونَ بِذَلِكَ كُلِّه) ئێمە باوەڕمان بەو هەموو ڕوکنانە هەیە (لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِه) جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێکداو باوەڕمان بە گشتیان هەیە (وَنُصَدِّقُهُمْ كُلُّهُمْ) باوەڕ بە گشتیان ئەکەین (عَلَى مَا جَاؤُا بِه) لەو ئایینەی لەلای خوا هێناویانە.

## ﴿ئیمان زیاد ئەبێو کەم ئەبێ﴾

ئیمامی (النواوی) ئەفەرموێ:

ڕاڕەوی (سَلَف)و پێشەوایانی(خَلَف)و زانایانی(حَدیث)و کۆمەڵێکیزانایانی(عَقیدَة) لە سەر ئەوەیە: کە ئیمان زیاد ئەبێو کەم ئەبێ، بەلام زۆربەی زانایانی(عَقیدَة) ئەڵێن: ئیمان زیادو کەم نابێ. (شرح صحیح مسلم) ل١٩٠ ب١. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا﴾ الأنفال:٢، کاتێ ئایەتەکانی خوایان بە سەردا ئەخوێندرێتەوە ئیمانیان زیاد ئەکا. کەواتە: ئیمان بە هۆی کردەوەی چاکو خوا پەرستی زیاد ئەبێ، بە هۆی کردەوەی خراپ کەم ئەبێ. بڕوانە (تحفة المريد) ل٢٧و٢٨.

﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: لَيْسَ الإِيمَانُ بِالتَّمَنِّي وَلاَ بِالتَّحَلِّي، وَلَكِنْ هُوَ مَا وَقَرَ فِي الْقَلْبِ وَصَدَّقَهُ الْعَمَلُ﴾ رواه إبن النّجار والديلمي، وهذا حديث منكر، ولكن روى معناه بسند جيد موقوفاً عَلى الحَسَنِ البَصْرِي ﷺ، بڕوانە (فَيْضُ القَدير) ل٢٥٦ ب٥و (شرح الطحاوية) ل٤٧٣ ب٢، ئیمان بە خۆزگەییو دڵ بۆچوونی کاری باش نیەو بە گفتوگۆی جوانیش نیە، بەڵکو ئیمانیڕاستەقینە ئەوەیە: لە ناو دڵدا جێگیر بێو کردەوەی باشیش ببێتە شاهیدی ڕاستیی.

کەواتە: ئەو پێناسەیەی چینێکی زانایانی (سَلَف) بۆ ئیمان ئەیکەنو ئەڵێن: (اَلإِيمَانُ: إِقْرَارٌ بِاللِّسَانِ وَعَمَلٌ بِالأَرْكَانِ وَإِعْتِقَادٌ بِالْجَنَانِ) واتە: ئیمان شادە هێنانەو کردەوەیەو باوەڕی ناو دڵە. مەبەستیان ئەوە نیە: کردەوە (رُكْن)-بەشێکی سەرەکیە لە ئیماندا، بەڵکو

مەبەستیان ئەوەیە: تەواوکەری ئیمانە، چونکە (خَوارج)ش هەمان پێناسە بۆ ئیمان بەکار دێنن، بەڵام ئەوان مەبەستیان ئەوەیە: کردەوەکان (رُکْن)=بەشێکی سەرەکی ئیمانن، واتە: لە لای ئەوان ئەگەر کردەوەکان نەکران مرۆڤ کافر ئەبێ، بڕوانە (فتح المبین) ل٥٨.
ئینجا بزانە: بەندەکانی خوا دەربارەی زیاد بوونو کەم بوونی ئیمان سێ بەشن:
**یەکەم:** پێغەمبەران عَلَیْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ، بەردەوام ئیمانیان هەر زیاد ئەبێ، کەم نابێ.
**دووەم:** مەلائیکەتان ئیمانیان نە زیاد ئەبێو نە کەم ئەبێ.
**سێیەم:** ئادەمیزادانیترو جنۆکە، ئیمانیان زیاد ئەبێو کەم ئەبێ: بە گوێرەی کردەوەی باشو خراپ، بڕوانە (تحفة المرید) ل٢٨.

## ﴿باسی ڕوکنەکانی ئیسلام﴾

**ئیسلام:** ملکەچیو دانپێداهێنانی ئاشکرایە: بۆ ئەو ئاینەی پێغەمبەرﷺ لە لای خوا هێناویەتی. (فتح المبین) ل٥٥و (تحفة المرید) ل٢٦.
ئیسلام لە پێنج ڕوکن پێك هاتوە: کە لەم حەدیسەدا گوتراون: ﴿عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّﷺ قَالَ: الإِسْلاَمُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًارَسُولُ اللهِ، وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلاً﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، ئیسلام ئەوەیە: شادە بێنیو بڵێی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ) وە هەر پێنج نوێژەکان بکەی، زەکات بدەی، مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو بی، حەج بکەی ئەگەر توانای ڕێگەت هەبێ.
ئیمامی (النواوی) لە ئیمام (إبن الصلاح) ئەگێڕێتەوە: بنچینەی (إیمان) باوەڕی ناو دڵە، بنچینەی (إسْلاَم) خۆ تەسلیمکردنو ملکەچی ئاشکرایە، جا بە هۆی شادەهێنان بڕیاری ئاشکرا بە ئیسلامەتی ئەدرێ، نوێژو زەکاتو ڕۆژوو و حەج لە بەر ئەوە خراونەتە پاڵ شادە هێنان: چونکە لە هەموو دروشمێکی ئیسلام ئاشکراترنو گەورەترنو بە جێبەجێکردنی ئەم ڕوکنانە بەندە بە تەواوی تەسلیمی خوا ئەبێ، نەکردنی ئەم ڕوکنانەش نیشانەی پچڕانی زنجیرەی ملکەچییە. (شرح صحیح مسلم) ل١٨٩ ب١.
**﴿ئاگاداری﴾:** ئیمامی (النواوی) ئەفەرموێ: لە ڕێڕەوی (أهْل الحَقّ)دا: باوەڕی یەکخواناسین بە بێشادەهێنان سوود نادا، شادەهێنانیش بە بێ ئەم باوەڕە سوود نادا، بەڵکو پێویستە هەردووکیان بە یەکەوە کۆبکرێنەوە. (شرح صحیح مسلم) ل٢٠٢ ب١.
بۆ وێنە: ئیمانی (أبوطالب)و ئیسلامەتی (إبن سَلُول). کەوابوو: شادەهێنان پەیوەندی بە (إیمان)و بە (إسْلاَم)وە هەیە، هەروەك (إبن حَجَر الهَيْتَمي)ش ئەفەرموێ: ئیمانو ئیسلام

-له واتەدا- پابەندی یەکترن، واتە: لە شەرعدا ئیمان بە بێئیسلامەتی بە هیچ ناچێ، ئیسلامیش بە بێئیمان بە هیچ ناچێ. (فتح المبین) ل٦٠و (تحفة المرید) ل٢٦.

## ﴿باسی دۆستایەتیو دوژمنایەتی (الوَلاءُ والبَراءَةُ)﴾

**دۆستایەتی**-(الولاء) ئەوەیە: موسوڵمان لە پێناوی‌خوادا، خواو پێغەمبەرﷺ موسوڵمانی خۆش بوێو پشتگیری‌یان بکاو کۆمەڵگەیان زۆر بکاو دژایەتی دوژمنی ئایینی‌یان بکا.

**دوژمنایەتی**-(البَراءَة) ئەوەیە: موسوڵمان لە پێناوی خوادا، دژایەتی دوژمنانی خواو پێغەمبەروﷺ دوژمنانی موسوڵمانان بکاو پشتگیری‌یان نەکا، هەرچەند ئەم دوژمنانەش خزمو کەسی خۆی بن، کۆمەڵگەیان زۆر نەکا. پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿أَوْثَقُ عُـرَى الإِيمانِ: اَلْمُوالاةُ فِي اللهِ وَالْمُعاداةُ فِي اللهِ، وَالْحُبُّ فِي اللهِ وَالْبُغْضُ فِي اللهِ﴾ رواه الطبراني وأبوداود بسند صالح، پتەوترین پەیوەندی‌و دەستپێوەگرەکانی ئیمان: دۆستایەتی کردنە لە پێناوی خوداو دوژمنایەتی کردنە لە پێناوی خوادا، خۆشویستنە لە پێناوی خواداو ڕق لێهاتنە لە پێناوی خودا. (التَّرْغيب والتَّرْهيب) ل٢٤ ب٤.

ئیمامی (النَّسَفي) ئەفەرموێ: خۆشویستن لە پێناوی خوادلو ڕق لێهاتن لە پێناوی خوادا بەشێکی گەورەیە لە ئیمان. (مَدارِكُ التَّنْزيل) ل٢٢٧ ب١.

ئینجا کە زانیت: (الْوَلاء والبَراءَة) دۆستایەتی‌و دوژمنایەتی ئەوەندە گرنگەو بەشێکە لە ئیمان، ئەوەش بزانە: دۆستی تۆ تەنها خواو پێغەمبەرو موسوڵمانن، کەوابوو: خۆشت بوێنو پشتگیری‌یان بکە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُـونَ﴾ المائدة:٥٥، دۆستی ئێوە تەنها خواو پێغەمبەری خواوﷺ ئیماندارەکانن، ئەو جۆرە ئیماندارانەی نوێژ ئەکەنو زەکات ئەدەنو ملکەچی فەرمانی خواو پێغەمبەرنﷺ. واتە: ئەگەر موسوڵمان ئەو سێ مەرجەی لێنەهاتنە جێ: هەر واجبە بە هۆی ئیمانەکەی دۆستایەتی‌ی بکەی، بەڵام واجبیشە بە ئەندازەی تاوانباریەکەی ڕقت لێی بێو دژایەتی بکەی، کەوڵتە: موسوڵمانی تاوانبار وەکو ئیمانداریکی ڕاستەقینە دۆستایەتی ناکرێو بە ئەندازەی دوژمنێکی ئایینیش دژایەتی ناکرێ. بۆ دڵنیایی بڕوانە (الفَتاوَى الْحَديثِيَّة) ل٥٧و (شرح الطحاوية) ل٥٠٧ ب٢.

هەروەها بزانە: چوار کەس دوژمنی تۆنە: کافرەکان، ستەمکارەکان، شەیتان، هەواو نەفس. کەوابوو: ڕقت لێیان بێو بە گوێرەی شەرع دژایەتی‌یان بکەو یارمەتییان مەدە.

١- دەربارەی کافرەکان، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُوا لَكُـمْ عَـدُوًّا مُبِينًا﴾ النساء:١٠١، بە ڕاستی کافرەکان دوژمنی ئێوەنە بە ئاشکرا. کەوابوو: جیاوازی نیە: ئەو کافرانە جولەکە بن، یان دیان بن، یان جۆرە کافرێکی‌تر بن، هەروەك خوای

گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاء بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾ المائدة:٥١، ئەی ئیمانداران ئێوە جوولەکان و دیانەکان مەکەنە دۆستی خۆتان، ئەوان دۆستی یەکترن، هەرکەسێك لە ئێوە ئەوان بکاتە دۆستی خۆی، ئەویش یەکێکە لەوان.

٢- دەربارەی ستەمکاران(١٦)، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا

(١٦) مەبەست بە (ظالم)-ستەمکار ئەو کەسەیە: کارێکی ناڕەوا بە ڕەوا دابنێ، ئەم پێناسەیەش بە پلەی یەکەم ئەو کەسانەش ئەگرێتەوە: کە بە شەریعەتی ئیسلام ڕەفتار ناکەن و یاسای دەستکرد بە ڕەوا دائەنێن و ڕەفتاری پێ ئەکەن، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ هەرکەسێك ڕەفتار بەو قورئانە نەکا کە خوا ناردیتیە خوارەوە، ئەوانە ستەمکارن. کەواتە: ئەم ئایەتە پیرۆزەش بە ئاشکرایی ئەو گرۆه و کاربەدەستە (علمانی)یانە ئەگرێتەوە: کە خۆیان بەسەر وڵاتانی ئیسلامدا سەپاندووە و بە قورئانی پیرۆز ڕەفتار ناکەن. کەوابوو: دۆستایەتی و گوێڕایەڵی بۆ ئەم کاربەدەستە ستەمکارانە و یارمەتی دانیان و باس کردنیان بە چاکە ئەبێتە هۆی لادان لە ڕێبازی پێغەمبەرﷺ، هەروەك پێغەمبەرﷺ خۆی ئەفەرموێ: ﴿سَتَكُونُ بَعْدِي أُمَرَاءُ مَنْ صَدَّقَهُمْ بِكَذِبِهِمْ وَأَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ فَلَيْسَ مِنِّي وَلَسْتُ مِنْهُ وَلَيْسَ بِوَارِدٍ عَلَيَّ الْحَوْضَ﴾ رواه الترمذي، لە دوای من چەند کاربەدەستێك ئەبن، هەرکەسێك بە درۆی ئەوان باوەڕ بکا و یارمەتییان بدا: لە ستەمکاریدا، ئەو کەسە لە ئوممەتی من نیە و منیش لە کۆمەڵی وی نیم و ڕۆژی قیامەت لە سەر حەوزی (الکوثر) نایێتە لام.
هەروەها یارمەتی دان و زۆرکردنی کۆمەڵی ستەمکاران ئەبێتە هۆی سزای دۆزەخ، هەروەك پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿الظَّلَمَةُ وَأَعْوَانُهُمْ فِي النَّارِ﴾ رواه الديلمي، ستەمکارەکان و یارمەتیدەرەکانیان لە ناو ئاگری دۆزەخ سزا ئەدرێن.
هەروەها خۆشویستنیان و دڵ بە لادابوونیان هۆی سەرشۆڕییە لە قیامەت، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ﴾ رواه الشيخان، مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەدا حەشری ئەکرێ: کە لە دونیادا خۆشی ویستوە.
هەروەها دۆستایەتی و هەڵسان و دانیشتن لەگەڵیان و زەردەخەنە لە ڕوویان ئەبێتە هۆی ژماردنی مرۆڤ لە چینی ستەمکاران، هەروەك پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿الْمَرْءُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ﴾ رواه الترمذي، مرۆڤ لە سەر ئایین و ڕەوشتی دۆستی خۆیەتی، کەوابوو: هەر یەکێکتان تەماشا بکا: دۆستایەتی کێ ئەکا؟
ئەی موسوڵمانی بەڕێز: لەم حەدیسانەدا بۆمان دەرکەوت: کە بە هیچ جۆرێك دۆستایەتی و یارمەتیدانی ستەمکاران دروست نیە، بۆمان دەرکەوت: بایەخ پێنەدانی (عقيدة الولاء والبراءة)-دۆستایەتی و دوژمنایەتی، نیشانەی کەم باوەڕییە، کەوابوو: ئەو کەسانەی دۆستایەتی ستەمکاران و نوێژ ئەکەن و شەرابخۆر...هتد، ئەکەن و ئەم دۆستایەتییەش بە پێشکەوتن دائەنێن، نیشانەی دواکەوتنیانە لە عەقیدەی (الولاء والبراءة)، چونکە واجبە موسوڵمان هەردەم هەوڵ بدا: بۆ ڕازیکردنی خوا و پێغەمبەرﷺ، هەرچەند ستەمکار و کەم ئایینەکانیش پێ پەست بن، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَاللهُ وَرَسُولُهُ أَحَقُّ أَنْ يُرْضُوهُ إِنْ كَانُوا مُؤْمِنِينَ﴾ خوا و پێغەمبەری خوا زیاتر مافی ڕازیکردنیان هەیە ئەگەر ئەوان بە ڕاستی ئیماندارن.
ئینجا هەر کاتێك مرۆڤ خوا و پێغەمبەریﷺ ڕازی کردن و بووە دۆستی ڕاستەقینەی خوا و پێغەمبەرﷺ، خوای گەورەش بەرگری لێئەکا و کاروباری بۆ ڕێك ئەخا و زەلیل و ژێر دەستەی ناکا، هەروەك پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿ثَلاَثٌ هُنَّ حَقٌّ: لاَ يَجْعَلُ اللهُ مَنْ لَهُ سَهْمٌ فِي الإِسْلاَمِ كَمَنْ لاَ سَهْمَ لَهُ، وَلاَ يَتَوَلَّى اللهُ عَبْداً فَيُوَلِّيَهُ غَيْرَهُ، وَلاَ يُحِبُّ رَجُلٌ قَوْماً إِلاَّ حُشِرَ مَعَهُمْ﴾ رواه الطبراني في الصغير والأوسط بإسناد جيد، سێ بڕیاری ڕاست هەنە و گومانیان تێدا نیە: یەکەم: ئەو کەسەی بەشی هەیە لە ئیسلام خوای گەورە نایهێنێتە ڕیزی ئەو کەسەی بەشی نیە. دووەم: هەرکەسێك خوا دۆستایەتی بکا خوای گەورە نایداتە دەست کەسێکیتر. سێیەم: هەرکەسێك کۆمەڵێکی خۆش بوێ لەگەڵ ئەواندا حەشر ئەکرێ. کەوابوو: ئەی موسوڵمانی ڕێزدار خۆت بێبەش مەکە لە بەرزکردنەوەی ئیسلام، دۆستایەتی خوا بکە و دوژمنانی ئیسلامت خۆش نەوێ. ڕوونکەرەوە.

وَاَهْلُ الْكَبَائِرِ مِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍﷺ فِي النَّارِ لاَ يُخَلَّدُونَ إِذَا مَاتُوا وَهُمْ مُوَحِّدُونَ، وَإِنْ لَمْ يَكُونُوا تَائِبِينَ، بَعْدَ أَنْ لَقُوا اللهَ عَارِفِينَ وَهُمْ فِي مَشِيئَتِهِ وَحُكْمِهِ: إِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُمْ وَعَفَا عَنْهُمْ بِفَضْلِهِ،

---

فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ﴾ هود:١١٣، دڵتان بەلای ستەمکارانەوە نەڕوا ئەوەکو ئاگری دۆزەخ بتانگرێتەوە.

٣- دەربارەی شەیتان، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلإِنسَانِ عَدُوًّا مُبِينًا﴾ الإسراء:٥٣، بێگومان شەیتان دوژمنێکی ئاشکرای ئادەمیزادە.

٤- دەربارەی هەولو نەفس، خوایگەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللهِ﴾ ص:٢٦، شوێن هەواو نەفس مەکەوە، ئەوەکو لە ڕێگەی خوا لاتبداو گومڕات بکا.

﴿ئاگاداری﴾: ئاشکرایە موسوڵمان تەنها یەك دڵی هەیە، ئەو دڵەش بارەگای ئیمانە، کەوابوو: هەرگیز ناگونجێ: خۆشویستنی ئەم سێ دۆستەو خۆشویستنی ئەو چوار دوژمنە بە یەکەوە لە ناو یەك دڵدا جێگەی ببێتەوە، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿لاَ تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾ المجادلة:٢٢، هیچ گەلێکی وەهات دەست ناکەوێ -کە باوەڕیان بە خواو ڕۆژی قیامەت هەبێ- لە هەمان کاتیشدا ئەو کەسانەیان خۆش بوێ: کە دژایەتی خواو پێغەمبەرﷺ ئەکەن، هەرچەند ئەم دژانەش باوکی خۆیان بن، یان کوڕیان بن، یان برایان بن، یان هۆزی خۆیان بن.

## ﴿ئیمانداری گوناهبار بە یەکجاری لە دۆزەخدا نامێنێتەوە﴾

**پێشەکی:** گوناه دوو بەشە: گوناهی گەورە، گوناهی بچووك.

ئینجا بزانە: پێناسەی گوناهی گەورە ئەمەیە: هەر گوناهێك ببێتە نیشانەی کەم بایەخی بە ئایین، جا لە دونیادا سزای بۆ دانرابێ، یان هەڕەشەی قیامەتی لە سەر هاتبێ، یان لەعنەت، یان غەزەبی خوا، ئەمانە گوناهی گەورەنە، جگە لەمانەش گوناهی بچووکن. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٤١٤و ٤١٥ ب١.

ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَاَهْلُ الْكَبَائِرِ) خاوەن گوناهە گەورەکان (مِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍﷺ) لە ئوممەتی پێغەمبەرﷺ (فِي النَّارِ لاَ يُخَلَّدُونَ) بە یەکجاری لە ئاگری دۆزەخدا نامێننەوە (إِذَا مَاتُوا وَهُمْ مُوَحِّدُونَ) بەو مەرجەی بە ئیمانەوە لە سەر یەکخواناسین مردبن (وَإِنْ لَمْ يَكُونُوا تَائِبِينَ) هەرچەند پێش مردن تۆبەشیان نەکردبێ، هەر نامێننەوە بە یەکجاری (بَعْدَ أَنْ لَقُوا اللهَ عَارِفِينَ) پاش ئەوەی بە ئیمانداری بێنە خزمەت خوا (وَهُمْ فِي مَشِيئَتِهِ وَحُكْمِهِ) ئەو گوناهبارانە لە ژێر بڕیاری خواو حەزکردنی خوای گەورەدانە (إِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُمْ وَعَفَا عَنْهُمْ بِفَضْلِهِ) ئەگەر

كَمَا ذَكَرَ عَزَّ وَجَلَّ فِي كِتَابِهِ [وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ]. وَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُمْ فِي النَّارِ بِعَدْلِهِ، ثُمَّ يُخْرِجُهُمْ مِنْهَا بِرَحْمَتِهِ وَشَفَاعَةِ الشَّافِعِينَ مِنْ أَهْلِ طَاعَتِهِ، ثُمَّ يَبْعَثُهُمْ إِلَى جَنَّتِهِ،

---

حەز بکا لێیان خۆش ئەبێو ئەیانبورێ بە گەورەیی خۆی (كَمَا ذَكَرَ عَزَّ وَجَلَّ فِي كِتَابِهِ) هەروەکو خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾ النساء:٤٨، خوای گەورە لەوە خۆش نابێ: کە هاوبەشی بۆ دابندرێو لە گوناهەکانی لە (کفر) بەرەو خوارتر خۆش ئەبێ، ئەگەر بە خۆی حەز بکا: لە کەسێك خۆش ببێ.

(وَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُمْ فِي النَّارِ بِعَدْلِهِ) وە ئەگەر حەز بکا: لە ناو ئاگری دۆزەخ سزایان ئەدا، بە دادپەروەری خۆی (ثُمَّ) ئینجا دوای ئەوەی بە گوێرەی حەزکردنی خوا سزا دران (يُخْرِجُهُمْ مِنْهَا بِرَحْمَتِهِ) خوا ئەیانهێنێتە دەرەوە بە ڕەحمەتی خۆی (وَشَفَاعَةِ الشَّافِعِينَ مِنْ أَهْلِ طَاعَتِهِ) هەروەها بە هۆی پاڕانەوەی تکاکارانی خوا پەرستیش خوای گەورە تاوانباران لە دۆزەخ ڕزگار ئەکا، هەروەك لە باسی (شَفَاعَة)دا باسمان کرد (ثُمَّ يَبْعَثُهُمْ إِلَى جَنَّتِهِ) ئینجا لە دوای ڕزگار کردنیان ئەیانباتە بەهەشت بە ڕەحمەتی خۆی، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿أَمَّا أَهْلُ النَّارِ الَّذِينَ هُمْ أَهْلُهَا: فَإِنَّهُمْ لاَ يَمُوتُونَ فِيهَا وَلاَ يَحْيَوْنَ، وَلَكِنْ نَاسٌ أَصَابَتْهُمُ النَّارُ بِذُنُوبِهِمْ -أَوْ قَالَ: بِخَطَايَاهُمْ- فَأَمَاتَهُمْ إِمَاتَةً حَتَّى إِذَا كَانُوا فَحْمًا، أُذِنَ بِالشَّفَاعَةِ، فَجِيءَ بِهِمْ ضَبَائِرَ ضَبَائِرَ، فَبُثُّوا عَلَى أَنْهَارِ الْجَنَّةِ، ثُمَّ قِيلَ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ أَفِيضُوا عَلَيْهِمْ، فَيَنْبُتُونَ نَبَاتَ الْحِبَّةِ تَكُونُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ﴾ رواهُ مُسْلِم، واتە: دۆزەخییە کافرەکان لە دۆزەخدا نامرنو بە ژیانێکی خۆشیش نازیێن، بەلام خەلکێکی ئیمانداری تاوانبار لە دوزەخدا دەسوتێن، ئینجا خوا ئەیانمرێنێو گیانیان دەرئەچێو ئەبنە خەلووزو ئیزن ئەدرێ: شەفاعەتیان بۆ بکرێ، ئینجا کۆمەڵ کۆمەڵ ئەیانهێنن لە سەر ڕووبارەکانی بەهەشت بلاویان ئەکەن، ئینجا ئەگوترێ: هۆ بەهەشتییەکان ئاویان بە سەردا بڕێژنن، ئینجا زیندوو ئەبنەوە، وەکو دەنکە گیای لافاو. بڕوانە (شرح صحیح مسلم) ل١٣٢ ب٢.

ئیمامی (النـواوی) ئەفەرموێ: ڕاڕەوی (أهل السنّة) چینی (سَلَف)و (خَلَف) ئەوەیە: هەرکەسێك بە باوەڕی یەکخوا ناسینەوە بمرێ، ئەوەبێگومان هەر ئەچێتە بەهەشت، ئینجا ئەگەر هیچ گوناهێکی نەبو: وەکو منداڵو ئەو شێتەی لە پێش بلوغ بوونیەوە شێت بووەو ئەو کەسەی تۆبەیەکی ڕاستو بێگەردی کردوە لە هەموو گوناهێکو هیچیتریش گوناهی نەکردبو، یان هەر لە ژیانیا تووشی هیچ گوناهێك نەبوبێ، ئەوانە گشتیان ئەچنە بەهەشتو بە هیچ جۆرێك ناچنە دۆزەخ، تەنها بە سەر پردی دۆزەخ (الصِّراط)دا ڕائەبرن، بەلام ئەگەر گوناهی گەورەی هەبو و بە بێتۆبەکردن مرد، ئەوە ئەکەوێتە ژێر حەزکردنی خوایگەورە،

وَذَلِكَ بِأَنَّ اللهَ تَعَالَى تَوَلَّى أَهْلَ مَعْرِفَتِهِ وَلَمْ يَجْعَلْهُمْ فِي الدَّارَيْنِ كَأَهْلِ نَكْرَتِهِ الَّذِينَ خَابُوا مِنْ هِدَايَتِهِ وَلَمْ يَنَالُوا مِنْ وَلاَيَتِهِ، أَللَّهُمَّ يَا وَلِيَّ الإِسْلاَمِ وَأَهْلِهِ ثَبِّتْنَا عَلَى الإِسْلاَمِ حَتَّى نَلْقَاكَ بِهِ.

---

ئەگەر خوا حەز بكا: ئەيبورێو بە بێ‌سزادان ئەيباتە بەهەشت، ئەگەر حەزیش بكا: ئەيباتە دۆزەخ بۆ ماوەيەكی وەها: كە خوا بيەوێ، ئینجا ڕزگاری ئەكاو ئەيباتە بەهەشت، كەوابوو: هەركەسێك بە باوەڕی يەكخوناسینەوە بمرێ، بە يەكجاری لە دۆزەخدا نامێنێتەوە، هەرچەند گوناهی زۆریشی هەبێ، هەروەها ئەو كەسەی بە كافری بمرێ ناچێتە بەهەشت، هەرچەند چاكەی زۆریشی هەبێ. (شرح صحيح مسلم) ل٢٧٧ ب١.

(وَذَلِكَ) ئەو ڕەحم پێ‌كردن‌و سزادانەی خوا (بِأَنَّ اللهَ تَعَالَى تَوَلَّى أَهْلَ مَعْرِفَتِهِ) بە هۆی ئەوەيە: كە خوای گەورە دۆستی خواناسانی خاوەن باوەڕە (وَلَمْ يَجْعَلْهُمْ فِي الدَّارَيْنِ كَأَهْلِ نَكْرَتِهِ) خوای گەورە ئیماندارەكانی وەكو خوانەناسەكان دانەناوێ: نە لە دونياو نە لە قيامەت (الَّذِينَ خَابُوا مِنْ هِدَايَتِهِ) ئەو خوانەناسانەی بێ‌بەش بوينە لە (هداية)ی خواو (وَلَمْ يَنَالُوا مِنْ وَلاَيَتِهِ) هيچ بەشيان نيە لە دۆستايەتی خوا (أَللَّهُمَّ يَا وَلِيَّ الإِسْلاَمِ وَأَهْلِهِ ثَبِّتْنَا عَلَى الإِسْلاَمِ حَتَّى نَلْقَاكَ بِهِ) ئەی خودای دۆستی ئیسلام‌و موسوڵمانان بە موسوڵمانی بمانهێڵەوە، تا بە موسوڵمانی دێينە خزمەتت لە قيامەت، آمين.

## ﴿ تۆبەو چاكە كردن گوناه لائەبەن ﴾

**پێناسە:** تۆبە، واتە: پەشيمانبوونەوە لە گوناه كردن، ئینجا بزانە: تۆبەكردن دەم‌و دەست لە هەموو گوناهێك واجبە، جا گوناهەكە بچووك بێ، يان گەورە بێ، هەروەها بزانە: خوای گەورە لە گەورەيی خۆی تۆبە قبوڵ ئەكا، واتە: گوناهەكە لە سەر تۆبەكار ئەسڕێتەوەو لە سەر گوناهەكە سزای نادا، بەو مەرجەی تۆبەكە ئەم چوار ڕوكنانەی لێ بێتە جێ:

يەكەم: وازبێنێ لە گوناهەكە. دووەم: پەشيمان ببێتەوە لە كردنی ئەو گوناهە. سێيەم: بڕياری ناو دڵ بدا: جارێكی‌تر نەگەڕێتەوە سەر ئەو گوناهە. **چوارەم:** ئەگەر گوناهەكە مافی ئادەميزاد بوو، ئەبی مافەكە بداتەوە خاوەن ماف، يان گەردەنی خۆی پێ ئازاد بكا، وە ئەگەر مافی خوای گەورە بوو و لە شەرعدا قەزاكردنەوە، يان كەففارەتی بۆ دانرابو: ئەبی ئەنجاميان بدا. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل١٧٠ ب١٠و (فتح الباري) ل١٢٣و١٢٤ ب١١.

- هەروەها بە هۆی (أَسْتَغْفِرُ اللهَ) گوتن‌و زيكری خواو نوێژو هەموو جۆرە چاكەكردنێك گوناهی‌بچووك-نەك گوناهی‌گەورە- لائەچن، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾ هود:١١٤، بە ڕاستی چاكەكان خراپەكان لائەبەن.
- هەروەها بە هۆی بەڵاو موسيبەتی دونيا گوناه لائەچن-هەرچەند ئەم بەڵايەش سزای تاوانەكە بێ لە دونيادا- پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ

نَصَبٍ وَلاَ وَصَبٍ وَلاَ هَمٍّ وَلاَ حُزْنٍ وَلاَ غَمٍّ حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا: إِلاَّ كَفَّرَ اللهُ بِهَا مِنْ خَطَايَــاهُ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، هەرچى تووشى موسولّمان ئەبێ: لە ماندووبوونو نەخۆشىو دەردو غەمو خەفەتو ئازارو دڵتەنگى، تا دڕكێكیش بچەقێتە لاشەی، بە هۆی ئەوانە، خوای گەورە گوناهەكانی ڕەش ئەكاتەوە.

- هەروەها بە هۆی بەخشینی خێركردنو قورئان خوێندنو حەج كردنو...هتد: كە زیندوو بۆ مردووان ئەیكەن، گوناهی مردووەكانی پێ ئەسڕێتەوە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ أَبِي مَاتَ وَتَرَكَ مَالاً وَلَمْ يُوصِ، فَهَــلْ يُكَفِّــرُ عَنْــهُ أَنْ أَتَصَدَّقَ عَنْهُ؟ قَالَ: نَعَمْ﴾ رواهُ مُسْلِم، پیاوێك گوتیە پێغەمبەر ﷺ باوكم مردوەو ماڵی لە پاش بەجێ ماوەو وەسیّتی نەكردوە، ئایا ئەگەر خێری بۆ بكەم ئەم خێرەی من گوناهەكانی وی ئەسڕێتەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ.
- هەروەها شەهیدبوون لە ڕێگەیخوا گشت گوناهەكانی مرۆڤ–جگە لە مافی ئادەمیزادان– ئەسڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿يُغْفَرُ لِلشَّهِيدِ كُلُّ ذَنْبٍ إِلاَّ الدَّيْنَ﴾ رواهُ مُسْلِم، لە گشت گوناهەكانی شەهید ئەبوردرێ، تەنها قەرز نەبێ. ئیمامی (النواوی) ئەفەرموێ: ئەمە ئاگاداركردنەوەیە لە گشت مافەكانی ئادەمیزادان: كە (جهاد)و شەهیدبوونو كردەوە چاكەكانیتر، مافی ئادەمیزادان لانابەن، بەڵكو تەنها مافی خوا لائەبەن. بۆ دڵنیایی بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٨٩ ب٧و ل٨٣ ب٨و (فتح المبين) ل١٤٧و١٤٨و (شرح الطحاوية) ل٤٥١ تا ٤٥٥ ب٢.
- هەروەها بزانە: ئەگەر (كافر) ئیمان بێنێو موسولّمان ببێ، خوای گەورە لە هەموو تاوانێكی ڕابووردوی خۆش ئەبێ، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿قُــلْ لِلَّــذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَنْتَهُوا يُغْفَرْ لَهُمْ مَا قَدْ سَلَفَ﴾ الأنفال:٣٨، بە كافرەكان بڵێ: ئەگەر واز لە كوفرەكەیان بێننو موسولّمان بن، لە ڕابووردوویان ئەبوردرێ.

### ﴿ باسی نوێژكردن لە دوای (فاسق)و، لە سەر مردووی تاوانبار ﴾

ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَنَرَى الصَّلاَةَ) ئێمەی (أهل السنّة) باوەڕمان وایە: دروستە نوێژ بە جەماعەت بكرێ (خَلْفَ كُلِّ بَرٍّ وَفَاجِرٍ مِنْ أَهْلِ الْقِبْلَةِ) لە دوای هەر پیاوچاكێكو هەر پیاوخراپێكی موسولّمان كە ڕوو لە قیبلە نوێژ بكا، هەرچەند زۆریش زاڵمو فاسق بێ ﴿عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: كَيْفَ أَنْتَ إِذَا كَانَتْ عَلَيْكَ أُمَرَاءُ يُؤَخِّرُونَ الصَّلاَةَ عَــنْ وَقْتِهَا؟ قُلْتُ: فَمَا تَأْمُرُنِي؟ قَالَ: صَلِّ الصَّلاَةَ لِوَقْتِهَا، فَإِنْ أَدْرَكْتَهَا مَعَهُمْ فَصَلِّ فَإِنَّهَا لَكَ

وَعَلَى مَنْ مَاتَ مِنْهُمْ. وَلاَ نُنْزِلُ أَحَداً مِنْهُمْ جَنَّةً وَلاَ نَاراً، وَلاَ نَشْهَدُ عَلَيْهِمْ بِكُفْرٍ وَلاَ بِشِرْكٍ

نَافِلَةً﴾ رواهُ مُسْلِم، پێغەمبەرﷺ بە (أبي‌ذر)ی فەرموو: ئایا ئەبێ وەزعت چۆن بێ لەو کاتەی چەند کاربەدەستێك فەرمانڕەواییت ئەکەن کە نوێژ لە کاتی خۆی دوا ئەخەن؟ گوتی: فەرمانت چی‌یە؟ فەرمووی: تۆ لەکاتی خۆی‌دا نوێژەکەت بکە، ئینجا ئەگەر لەگەڵ ئەوانیشدا گونجا دووبارە بیکەوە بە جەماعەت، چونکە بە سوننەت بۆت ئەنووسرێ. واتە: ووشەی (فَصَلِّ) فەرمانی پێغەمبەرەﷺ. کە ئەبی نوێژ بە جەماعەت لە دوای ئەو ئیمامە بکرێ کە نوێژەکەی دواخستووە، هەرچەند بەم دوا خستنەش تاوانبارە.

﴿وَعَنْ عَبْدِالْكَرِيمِ: أَدْرَكْتُ عَشْرَةً مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍﷺ يُصَلُّونَ خَلْفَ أَئِمَّةِ الْجُورِ﴾ رواه البخاري في التاريخ، دە سەحابەی پێغەمبەرمﷺ دیتن نوێژیان لە دوای ئیمامی زالمو فاسق ئەکرد. بڕوانە (سُبُلُ السَّلام) ل٢٩ ب٢. ئینجا بزانە: (خَوارِج) نوێژی بە جەماعەت لە دوای خەڵکی‌تر ناکەن، چونکە بە کافریان تێ‌ئەگەن، لە بەر ئەوەی خراپە قەدەغە ناکەن (تحفة المحتاج) ل٦٧ ب٩.

(وَعَلَى مَنْ مَاتَ مِنْهُمْ) هەروەها باوەڕی (أهل السّنّة) ئەوەهایە: نوێژی (جَنازة) لە سەر هەموو جۆرە مردووێکی موسوڵمان ئەکرێ، هەرچەند زۆریش فاسقو تاوانبار بووبێ.

ئیمامی (النواوي) ئەفەرموێ: قازی ئەفەرموێ: ڕاڕەوی زانایان بە گشتی ئەمەیە: کە نوێژی (جَنازَة) لە سەر هەموو مردووێکی موسوڵمان ئەکرێ، جیاوازی نیە: داری سزای لێدرابێ، بەردباران کرابێ، بە خۆی خۆی کوشتبێ، یان منداڵی زینا بێ. لە ئیمام (مَالك)و کەسانی‌تریش گێڕدراوەتەوە: کە پێشەوای موسوڵمانان ئەبی خۆی بپارێزێ: نوێژی (جَنازَة) لە سەر کوژراوی سزا نەکاو پیاوچاك نوێژی (جَنازَة) لە سەر فاسقەکان نەکا، تاکو تەمبێ ببن... ئیمام (أبوحَنيفَة) ئەفەرموێ: نوێژی (جَنازَة) لە سەر ئەو موسوڵمانە ناکرێ: کە جەنگ لە دژی موسوڵمانان ئەکا. (شرح صحيح مسلم) ل٣١٦ ب٤.

ئینجا بزانە: دروست نیە نوێژی (جَنازَة) لە سەر هیچ جۆرە کافرێك بکرێ، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ﴾ التوبة:٨٤، نوێژی (جَنازَة) لە سەر هیچ کەسێك لەو کافرانە مەکەو لەسەر گۆڕەکەیشی مەوەستە. بگەڕێوە باسی کافربوونو، بڕوانە (تَفسير القُرْطبي) ل٢٢١ ب٨.

## ﴿ لە ناو دڵی خەڵك ناکۆڵینەوە ﴾

(وَلاَ نُنْزِلُ أَحَداً مِنْهُمْ جَنَّةً وَلاَ نَاراً) ئێمەی (أهل السّنّة) هیچ موسوڵمانێکی دیارکراو: نە بە بەهەشتی دائەنێین‌و نە بە دۆزەخی، مەگەر لە قورئان، یان لە حەدیسدا پێمان گەیشتبێ، هەروەکو لە باسی (ترسان لە خوا) ڕوونمان کردەوە (وَلاَ نَشْهَدُ عَلَيْهِمْ) شاهیدی لە سەر هیچ موسوڵمانێك نادەین (بِكُفْرٍ) نە بە کافربوون (وَلاَ بِشِرْكٍ) نە بە هاوبەش دانان بۆ خوا

وَلا بِنِفَاقٍ مَا لَمْ يَظْهَرْ مِنْهُمْ شَيْءٌ مِنْ ذَلِكَ، وَنَذَرُ سَرَائِرَهُمْ إِلَى اللهِ تَعَالَى. وَلاَ نَرَى السَّيْفَ عَلَى أَحَدٍ مِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ ﷺ إِلاَّ مَنْ وَجَبَ عَلَيْهِ السَّيْفُ.

---

(وَلا بِنِفَاقٍ) نه به بوونه موونافیق (مَا لَمْ يَظْهَرْ مِنْهُمْ شَيْءٌ مِنْ ذَلِكَ) مەگەر به زوبان یان بـه کردەوە کافربوونیان ئاشکرا ببێ، یان له ڕێگەی قورئان، یـان حـەدیس پێمـان گەیشتبێ ﴿عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ: يَقُولُ لاَ يَرْمِي رَجُلٌ رَجُلاً بِالْفُسُوقِ وَلاَ يَرْمِيهِ بِالْكُفْرِ إِلاَّ ارْتَدَّتْ عَلَيْهِ إِنْ لَمْ يَكُنْ صَاحِبُهُ كَذَلِكَ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، هـەر مرۆڤێـك بـه یـەکێکیتر بڵـێ: فاسـق، یـان پێـی بڵـێ: کـافر، ئـەوە فاسـق بـوون و کافربوونـه کـه ئەگەڕێتەوە سەر خۆی ئەگەر ئەویتر فاسق، یان کافر نەبێ.

(وَنَذَرُ سَرَائِرَهُمْ إِلَى اللهِ تَعَالَى) نهێنی نـاو دڵـی موسـوڵمانان واز لێدێنین و ئەیدەینـه پـاڵ زانستی خوای گەورە، هەروەك پێغەمبـەر ﷺ ئەفـەرموێ: ﴿إِنِّي لَمْ أُومَرْ أَنْ أَنْقُبَ عَنْ قُلُوبِ النَّاسِ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، من فەرمانم پێنەکراوە: له ناو دڵی خەڵك بکۆڵمەوە. بڕوانه (فتح المبين) ل١١٢.

(وَلاَ نَرَى السَّيْفَ عَلَى أَحَدٍ مِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ ﷺ) ئێمـەی (أهـل السّنّة) باوەڕمـان وایـە: کـه کوشتنی هیچ موسوڵمانێك دروست نیه (إِلاَّ مَنْ وَجَبَ عَلَيْهِ السَّيْفُ) تـەنها ئـەو موسـوڵمانه نەبێ: که شەریعەتی ئیسلام کوشتنی واجب کردبێ، هـەروەکو پێغەمبـەر ﷺ ئەفـەرموێ: ﴿لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثِ خِصَالٍ: الثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، خوێن ڕشتنی هـیچ موسـوڵمانێك دروست نیه، تەنها به هـۆی یـەکێك لـه سـێ جـۆرە تـاوان نـەبێ: یەکـەم: زیناکـەرێك کـه جیمـاعێکی حـەڵاڵی کردبـێ. دووەم: مرۆڤکوژێـك کـه لـه تۆڵـه بکوژرێـت. سـێیەم: ئـەو کەسەی واز له ئاینی خـۆی بهێنـێ: بـه هـۆی کـافربوون، یـان بـه هـۆی جیابوونـەوە لـه کۆمەڵی موسوڵمانان: وەکو (خوارج)و ئەو کەسانەی لـه دژی فـەرمانڕەوایی موسـوڵمانان جەنگ ئەکەن. بڕوانه (شرح صحيح مسلم) ل١٨٢ ب٧و (فتح المبين) ل١٣٢و١٣٣.

## ﴿ باسی پێشەوای موسوڵمانان ﴾

**پێشـەکی**: بـه بڕیـاری شەریعەتیئیسـلام لـه لای (أهـل السّنّة) واجبـه: موسـوڵمانان پێشەوایەکی گشتی بۆ خۆیـان دابنێن، تـاکو بـه یاسـای خـودا، لـه سـەر زەمـینی خـودا، بەنـدەکانی خـودا بـەڕێوە ببـاو لـه بەندایـەتی بەنـدە ڕزگاریـان بکـاو بیانکاتـه بەنـدەی ڕاستەقینەی خوا. بەڵگەش ئەمەیە: سەحابەکان له دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بـه تێکڕایـی ئیمامی (أبو بَكر)یـان هەڵبـژارد بـه جێنیشـی پێغەمبـەر ﷺ پـێش ئـەوەی تـەرمی پـیرۆزی پێغەمبەر ﷺ به خاك بسپێرن. بڕوانه (الصّواعق المحْرقة) ل٧و (تحفة المريد) ل١٠٨.

وَلاَ نَرَى الْخُرُوجَ عَلَى أَئِمَّتِنَا وَوُلاَةِ أُمُورِنَا وَإِنْ جَارُوا، وَلاَ نَدْعُو عَلَيْهِمْ، وَلاَ نَنْزِعُ يَداً مِنْ طَاعَتِهِمْ، وَنَرَى طَاعَتَهُمْ مِنْ طَاعَةِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ فَرِيضَةً مَا لَمْ يَأْمُرُوا بِمَعْصِيَةٍ، وَنَدْعُو لَهُمْ بِالصَّلاَحِ وَالْمُعَافَاةِ.

---

ئینجا بزانە: واجبە موسوڵمانان گوێڕایەڵو ملکەچی فەرمانەکانی ئەم پێشەوایەو فەرمانڕەوایەکانی لەویش بەرەوخوارتر بن، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الأَمْرِ مِنْكُمْ﴾ النساء:٥٩، ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرﷺ بنو گوێڕایەڵی ئەو کاربەدەستانە بن: کە لە خۆتانن، واتە: موسوڵمانن.

ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَلاَ نَرَى الْخُرُوجَ عَلَى أَئِمَّتِنَا) لە بیرو باوەڕی ئێمەی (أَهلُ السُّنَّة)دا دروست نیە لە دژی پێشەوایەکانی خۆمان ڕاپەڕین (وَوُلاَةِ أُمُورِنَا) هەروەها دروست نیە لە دژی کاربەدەستەکانیتریش ڕاپەڕین (وَإِنْ جَارُوا) هەرچەند تاوانبارو ستەمکاریش بن، بەو مەرجەی: کافر نەبن ﴿عَنْ إِبْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: عَنِ النَّبِيِّﷺ: مَنْ كَرِهَ مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئاً فَلْيَصْبِرْ فَإِنَّهُ مَنْ خَرَجَ مِنَ السُّلْطَانِ شِبْراً مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً﴾ رواهُ البخاري ومُسْلم، هەرکەسێك ڕەفتارێکی فەرمانڕەوای خۆی پێناخۆش بوو ئەبێ خۆی ڕابگرێ، چونکە هەرکەسێك بستێك لە فەرمانی فەرمانڕەوا دەرچێ، وەك مردنی (جَاهِلِيَّة)ی پێش ئیسلام ئەمرێ. کەواتە: هەرچەند فەرمانڕەوایەکان ستەمکارو تاوانباریش بن، هەر دروست نیە لە دژیان ڕاپەڕی، مەگەر کافر ببن، یان گۆڕانکاری بهێننە سەر شەریعەتی ئیسلام، بڕوانە (شرح صحیح مسلم) ل٥١ ب٨و (فتح الباري) ل٨ ب١٢.

(وَلاَ نَدْعُو عَلَيْهِمْ وَلاَ نَنْزِعُ يَداً مِنْ طَاعَتِهِمْ) دوعای خراپیان لێ ناکەینو دەستی خۆمان بەرنادەین لە گوێڕایەڵی فەرمانڕەواکانمان (وَنَرَى طَاعَتَهُمْ مِنْ طَاعَةِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ فَرِيضَةً) باوەڕمان وایە: گوێڕایەڵی ئەوان بەشێکە لە خواپەرستیو واجبی سەرشانی ئێمەیە، هەرچەند فەرمانڕەواکانیش لە خۆیاندا پیاوی خراپ بن (مَا لَمْ يَأْمُرُوا بِمَعْصِيَةٍ) بەڵام بەو مەرجەی: فەرمان بە خراپە نەکەن، ئەگینا: گوێڕایەڵی دروست نیە، هەرچەند پیاوی چاکیش بن، چونکە فەرمان بە خراپە شتێکە، خراپەی فەرمانڕەواش لە خۆیدا شتێکی ترە (وَنَدْعُو لَهُمْ بِالصَّلاَحِ وَالْمُعَافَاةِ) لە خوا ئەپاڕێینەوە: بیانکاتە پیاوی چاكو بێبەلایان بکا.

﴿ڕوونکردنەوە﴾: واجبە گوێڕایەڵی فەرمانڕەواکانمان بینو دروست نیە لە دژیان ڕاپەڕین، هەرچەند لە خۆیاندا فاسقو ستەمکاریش بن، بەو چوار مەرجانەی خوارەوە:

**یەکەم:** بەو مەرجەی بە قورئانی پیرۆز خەڵکی بەڕێوە ببەنو گۆڕانکاری نەهێننە سەر یاسای ئیسلام، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنْ أُمِّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ مُجَدَّعٌ أَسْوَدُ يَقُودُكُمْ

بكتاب الله تعالى فاسمَعُوا لَهُ وَأطيعُوا﴾ رواهُ مُسْلم، ئەگەر قولەڕەشێكی لوتبڕاو كرایە (أمیر)تان‌و بە قورئانی پیرۆز ئێوەی بەڕێوە ئەبرد، ئێوەش گوێڕایەڵی بن.

**دووەم:** بەو مەرجەی بە ئاشكرایی نوێژ بكەن‌و فەرمانیشی پێبكەن، دەربارەی فەرمانڕەوایانی خراپ، پرسیاریان لە پێغەمبەرﷺ كرد: ﴿أفلاَ نُنابذُهُمْ بالسَّیف؟ فقال: لاَ، مَا أقامُوا فیكُمْ الصَّــلاةَ﴾ رواهُ مُسْلم، ئایا بە هێزی چەك دژایەتییان نەكەین؟ فەرمووی: نا، هەتا ئەوان نوێژ لە ناو كۆمەڵگای ئێوەدا بكەن دژایەتییان مەكەن.

**سێیەم:** بەو مەرجەی فەرمان بە خراپە نەكەن‌و بەدڕەوشتی بڵاو نەكەنەوە، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿...فإذا أُمِرَ بِمَعْصِیَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طاعَةَ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلم، هەر كاتێك مرۆڤ فەرمانی بە خراپە پێ كرا، گوێڕایەڵی دروست نیە. ئینجا بزانە: ئەم سێ حەدیسانە بەڵگەیە: كە لەم سێ مەرجانەدا جیاوازی نیە: فەرمانڕەوا لە خۆیدا پیاوی چاك بێ، یان فاسق‌و ستەمكار بێ، چونكە گوێڕایەڵی‌و فەرمانكردن شتێكەو چاكی‌و خراپی ئەوانیش شتێكی ترە.

**چوارەم:** بەو مەرجەی موسوڵمان بێ‌و كافر نەبێ ﴿عَنْ عُبادَةَ بن الصَّامتﷺ: بَایَعْنا رَسُولَ اللهﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَة فِي مَنْشَطنَا وَمَكْرَهنَا وَعُسْرِنَا وَیُسْرِنَا وَأثَــرَةَ عَلَیْنَــا، وأنْ لاَ نُنَازِعَ الأمْرَ أهْلَهُ...إلاَّ أنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا عِنْدَكُمْ مِــنَ اللهِ فِیــهِ بُرْهَــانٌ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلم، پەیمانمان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بەست: كە گوێڕایەڵ بین لە كاتی چوستی‌و پێناخۆشی‌و سەختی‌و ئاسانی‌و جیاوازیكردن لە نێوانماندا، لە دژی فەرمانڕەواكان ڕانەپەڕین، مەگەر كافربوونێكی ئاشكرا ببینن‌و لە لای خوا بەڵگەیەكتان بە دەستەوە بێ.

ئینجا بزانە: هەر فەرمانڕەوایەك یەكێكی لەم چوار مەرجانە لێنەهاتە جێ، واجبە لابدرێ، ئیمامی (النواوی) ئەفەرموێ: قازی (عیاض) فەرموویەتی: زانایان یەكدەنگن: كە كافر نابێتە پێشەوا، هەروەها ئەگەر پێشەوا بووە كافر، یان وازی لە نوێژكردن هێناو بانگەوازی خەڵكی نەئەكرد بۆ نوێژكردن... هەروەها فەرمووی: ئەگەر پێشەوا گۆڕانكاریی هێنا سەر یاسای ئیسلام، یان بووە بیدعەچی، بەم تاوانانە لە فەرمانڕەوایی لائەچێ‌و واجبە موسوڵمانان لە دژی ڕاپەڕن‌و لایببەن‌و یەكێكی‌تری دادپەروەر لە جێی وی دابنێن ئەگەر بۆیان بگونجێ، ئەگەر نا: ئەبێ موسوڵمان كۆچ بكا بۆ شوێنێكی‌باشتر. (شرح صحیح مسلم) ل٣٥ ب٨، هەروەها (فتح الباري) ل١٥٤ ب١٣.

## ﴿ باسی (أهل السنّة والجماعة) ﴾

**پێناسە:** (أهل السنّة والجَماعة): بەو كۆمەڵە موسوڵمانە ئەگوترێ: كە لە سەر ڕێبازی پێغەمبەرﷺ‌و كۆمەڵی سەحابەی پێغەمبەرﷺ‌و پێشینەی چاكن‌و باوەڕیان بە (خلافة الرّاشدین) –أبوبكر وعمر وعثمان وعلی– هەیەو گشت سەحابەكانی پێغەمبەرﷺ

بە دادپەروەر ئەزانن...هتد: ئەو بیروباوەڕەی لەم (عَقِیدَة)دا باس کراوە، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿افْتَرَقَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى عَلَى ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَسَتَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، ثِنْتَانِ وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ وَوَاحِدَةٌ فِي الْجَنَّةِ وَهِيَ الْجَمَاعَةُ، وَفِي رِوَايَةٍ قِيلَ: مَا هِيَ؟ قَالَ: مَا أَنَا عَلَيْهِ الْيَوْمَ وَأَصْحَابِي﴾ رواه أبوداود والترمذی بسند صحیح، جووەکانو دیانەکان هەر یەکەیان بونە حەفتاو دوو کۆمەڵ، ئوممەتی منیش ئەبێتە حەفتاو سێ کۆمەڵ، حەفتاو دوو کۆمەڵ ئەچنە دۆزەخ، تەنها یەك کۆمەڵ ئەچێتە بەهەشت، کە کۆمەڵە گەورەکەی موسوڵمانانە، گوترا: ئەم کۆمەڵە کێیە؟ فەرمووی: ئەو کۆمەڵەی لە سەر ڕێبازی ئێستای منو سەحابەی منە. بڕوانە (باسی هەر چوار خەلیفەکان).

کەوابوو: ئەم حەفتاو دوو کۆمەڵە گشتی بە (أَهْل البِدْعَة وَالضَّلالَة) ناو ئەبرێنو واجبە مرۆڤ خۆی لێیان بپارێزێو شوێنکەوتەیان نەبێو بە گوفتاری سەرقۆڕو بێ ناوەرۆکی ئەوان تەفرە نەدرێ، چونکە ئەم حەفتاو دوو کۆمەڵە گشتی بە ناوی ئایین بانگەوازی ئەکەنو پەرتەوازە ئەخەنە ناو موسوڵمانان، هەروەك لە چەند شوێنێکی ئەم کتێبەدا ناوی چەند کۆمەڵێکی (أَهْل البِدْعَة)مان هێناوە، تاکو خۆت لە ئەوان بپارێزێو لە سەر ڕێبازی (أَهْل السُّنَّة والجَماعة) بەردەوام بی.

حەزرەتی(عبدالله)ی کوڕی(مسعود)-کە سەحابەیەکی پێغەمبەرەﷺ- ئەفەرموێ: ئا ئەوانە سەحابەی پێغەمبەرنﷺ لە هەموو ئەم ئوممەتە گەورەترنو چاکترنو زاناترن، چینێکی وەها باش بون: خوای گەورە بۆ هاوڕێیەتی پێغەمبەری خۆیﷺ هەڵیبژاردبونو بۆ دامەزراندنی ئایینی ئیسلام هەڵیبژاردبون، کەوابوو: ڕێزیان لێبنێنو شوێن ڕەوشتی ئەوان بکەون، چونکە ئەوان لە سەر ڕێگەی ڕاست بون. بڕوانە (شرح الطحاوية) ل٥٤٦ ب٢.

ئیمامی (الطَحاوی) ئەفەرموێ:

(وَنَتَّبِعُ السُّنَّةَ) ئێمە شوێن ڕێبازی پێغەمبەرﷺ ئەکەوین (وَالْجَمَاعَةَ) شوێن کۆمەڵی موسوڵمانان ئەکەوین، کە لە سەر ڕێبازی پێغەمبەرﷺو سەحابەکانن (وَنَجْتَنِبُ الشُّذُوذَ وَالْخِلافَ وَالْفُرْقَةَ) خۆمان ئەپارێزین لە جیابوونەوەو پەرتەوازەو تاکڕەوی، چونکە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿عَلَيْكُمْ بِالْجَمَاعَةِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْفُرْقَةَ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ مَعَ الْوَاحِدِ وَهُوَ مِنَ الإِثْنَيْنِ أَبْعَدُ، مَنْ أَرَادَ بَحْبُوحَةَ الْجَنَّةِ فَلْيَلْزَمِ الْجَمَاعَةَ﴾ رواه الترمذی بسند صحیح، ئێوە هەردەم کۆمەڵ بنو لەگەڵ کۆمەڵدابن، زۆر ئاگاداری خۆتان بن: لە جیابوونەوەو پەرتەوازە، چونکە شەیتان لەگەڵ یەك کەسدایەو لە دوو کەسان دوورترە، هەرکەس ئەیەوێ بچێتە ناوەندی بەهەشت، با هەر لەگەڵ کۆمەڵی موسوڵماناندابێ.

(وَنُحِبُّ أَهْلَ الْعَدْلِ وَالأَمَانَةِ) ئێمەی (أهل السُّنَّة) مرۆڤی دادپەروەرو دڵپاكو دەستپاکمان خۆش ئەوێ، چونکە خوا خۆشی ئەوێن، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ:

وَنُبغِضُ أَهْلَ الْجَوْرِ وَالْخِيَانَةِ، وَنَقُولُ: اللهُ أَعْلَمُ فِيمَا اشْتَبَهَ عَلَيْنَا عِلْمُهُ. وَنَرَى الْمَسْحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ فِي السَّفَرِ وَالْحَضَرِ كَمَا جَاءَ فِي الأَثَرِ.

---

﴿فَإِنَّ اللهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ﴾ آل عمران:٧٦، خوای گەورە مرۆڤە لە خواترسەكانی خۆش ئەوێ. واتە: ئەو كەسانەی شوێنكەوتەی پێغەمبەرن ﷺ (وَنُبْغِضُ أَهْلَ الْجَوْرِ وَالْخِيَانَةِ) هەروەها ڕقمان لە مرۆڤی ستەمكارو دڵپیس ئەبێتەوە، چونكە خوا خۆشی ناوێن، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ لاَ يُحِبُّ الْخَائِنِينَ﴾ الأنفال:٥٨، خوای گەورە دڵپیسەكانی خۆش ناوێن. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ وَأَبْغَضَ لِلَّهِ وَأَعْطَى لِلَّهِ وَمَنَعَ لِلَّهِ فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الإِيمَانَ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، هەركەسێك لە بەر خاتری خوا، كەسێكی خۆش بوێ‌و لە بەر خاتری خوا ڕقی لە كەسێك ببێتەوە، لە بەر خاتری خوا شت ببەخشێ‌و لە بەر خاتری خوا نەیبەخشێ، ئەوە بە ڕاستی ئیمانی تەواوە. بگەڕێوە (باسی دۆستایەتی).

(وَنَقُولُ) ئەڵێین: (اللهُ أَعْلَمُ) هەر خوا ئەزانێ (فِيمَا اشْتَبَهَ عَلَيْنَا عِلْمُهُ) دەربارەی ئەو جۆرە ئایەت‌و حەدیسانەی لێمان ئەشێوێن‌و واتەیان نازانین: وەكو (مُتَشابِهاتُ القُرآنِ والحديث) كە باسمان كردن، چونكە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ قَالَ فِي الْقُرْآنِ بِغَيْرِ عِلْمٍ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ﴾ رواه الترمذي بسند صحيح، هەركەسێك لە خۆیەوە بە بێزانست لە واتەی قورئان شتێك بڵێ، با شوێنی خۆی لە دۆزەخ ئامادە بكا.

(وَنَرَى الْمَسْحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ) باوەڕمان وایە: لەجیاتی قاچ شوشتن لە دەستنوێژدا، دروستە دەستی تەڕ بە سەر جووتە (خُفّ)دا بێنین—جووتە گۆرەوییەكە ئاوی تێناچێ— (فِي السَّفَرِ وَالْحَضَرِ كَمَا جَاءَ فِي الأَثَرِ) جا لە ماڵەوە بین، یان ڕێبوار بین، هەروەك لە حەدیسدا هاتووە: ﴿عَنْ عَلِيٍّ كَرَّمَ اللهُ وَجْهَهُ قَالَ: جَعَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ لِلْمُسَافِرِ، وَيَوْماً وَلَيْلَةً لِلْمُقِيمِ، يَعْنِي فِي الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ﴾ رواهُ مُسْلِم، پێغەمبەر ﷺ دایناوە: مرۆڤی ڕێبوار سێ شەو و سێ ڕۆژان مەسحی (خُفّ) بكاو ئەوەی لە ماڵەوەیە شەو و ڕۆژێك مەسح بكا. ئینجا بزانە: (خَوارِج)و (شيعَة) ئەڵێن: مەسحكردنی (خُفّ) لە دەستنوێژدا دروست نیە. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٢٨٤ ب٢.

## ﴿(جیهاد)و بانگەوازی ئیسلام﴾

**پێناسە**: (جیهاد) واتە: تێكۆشان بۆ بەرزكردنەوەی ئیسلام، بە چەسپاندنی حوكمی خوا، لە سەر زەمینی خوداو ڕزگاركردنی بەندەكانی خوا لە بەندایەتی بەندەو كردنیان بە بەندەی ڕاستەقینەی خودا. جا ئەم تێكۆشانە: بە گیان‌و بە ماڵ‌و بە زمان ئەكرێ، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿جَاهِدُوا الْمُشْرِكِينَ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ وَأَلْسِنَتِكُمْ﴾ رواه أحمد وصححه الحاكم، جیهاد لە دژی كافرەكان بكەن: بە ماڵتان، بە گیانتان، بە زمانتان.

ئینجا بزانە: تێکۆشانی چەکدارانە-کە پێی ئەگوترێ: (غەزا)- لە هەردوو بەشەکەیتری (جهادْ) گەورەترە، چونکە گیانی خۆی فرۆشتۆتە خوا.
(إبن حَجَر الهَيْتَمي) ئەفەرموێ: (إبن أبيعَصْرون) لە چەند حەدیسێکی (صَحِيح)ی وەرگرتوە: کە (جهادْ) لە هەموو کردەوەکانی مرۆڤ گەورەترە لە پاش ئیمان، ئیمامی (أذْرعي)ش ئەم رایەی هەڵبژاردوە. (تحفة المحتاج) ل٢١١ ب٩.
﴿عَنْ أبيهُرَيْرَةَ ﷺ: قِيلَ: يَا رَسُولَ الله، مَا يَعْدِلُ الْجِهَادَ فِي سَبِيلِ الله تَعالَى؟ قَالَ: لاَ تَسْتَطِيعُونَهُ، فَأَعَادُوا عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا؟ كُلُّ ذَلَكَ يَقُولُ: لاَ تَسْتَطِيعُونَهُ، وَقَالَ فِي الثَّالِثَةِ: مَثَلُ الْمُجَاهِد فِي سَبِيلِ الله كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ الْقَانِت بآيَاتِ الله، لاَ يَفْتُرُ مِنْ صَلاَةٍ وَلاَ صِيَامٍ حَتَّى يَرْجِعَ الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ الله﴾ رواهُ البخاري ومُسْلم، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام کردەوە بە قەد (جهادْ) گەورەیە؟ فەرمووی: ناتوانن، تا دوو جار، یان سێ جار پرسیارەکەیان لێ کردەوە؟ هەر ئەیفەرموو: ناتوانن، ئینجا لە جاری سێیەمدا فەرمووی: خێری (مُجاهِد) وەکو خێری ئەو کەسەیە: کە بەردەوام بە رۆژوو بێو شەونوێژ بکاو قورئان بخوێنێو هیچ کاتێك لە نوێژو رۆژوو نەوەستێ تا (مُجاهدْ) لە غەزا ئەگەڕێتەوە.

## ﴿ قۆناغەکانی ( جهادْ ) ﴾

ئینجا بزانە: (جهادْ) بە چوار قۆناغ پێگەیشتوە:
**یەکەم**: بانگەوازیینهێنی بە بێجەنگ، ئەم قۆناغە لە دوای هاتنی (وَحْي) بۆ پێغەمبەر ﷺ دەستی پێکرد، بە هاتنی سورەتی ﴿يَاأَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ قُمْ فَأَنذِرْ﴾ ئەی ئەو پێغەمبەرەی خۆت بە جلەکانی پۆشیوە، هەڵسە خەڵك بترسێنە لە عەزابی خوا. ئەم قۆناغە تا سێ ساڵ بەردەوام بوو.
**دووەم**: بانگەوازیئاشکرا بە بێجەنگ، ئەم قۆناغە لە دوای ئەو سێ ساڵە دەستی پێکرد، بە هاتنی ئایەتی ﴿فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ﴾ الحجر:٩٤، ئاشکرا بکە ئەو بانگەوازیەی فەرمانت پێکراوە. ئەم قۆناغەش تا کۆچکردن بەردەوام بوو.
**سێیەم**: بانگەوازیئاشکرا شان بە شانی جەنگکردن لەگەڵ ئەو کەسانەی جەنگ لەگەڵ موسوڵمانان ئەکەن، ئەم قۆناغە لە دوای کۆچکردن دەستی پێکرا، بە هاتنی ئایەتی ﴿وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ﴾ البقرة:١٩٠، لە ڕێگەی خوا جەنگ لەگەڵ ئەوانە بکەن کە جەنگتان لەگەڵ ئەکەن. ئەم قۆناغەش تا ڕزگارکردنی (مَكّة) بەردەوام بوو.
**چوارەم**: دوا قۆناغ، واتە: بانگەوازیئاشکرا شان بە شانی جەنگکردن لەگەڵ ئەو کەسانەی باوەڕیان بە ئیسلام نیە، یان ئەبنە کۆسپ لە ڕێی بانگەوازیی ئیسلام، ئەم قۆناغە لە دوای ڕزگارکردنی (مَكّة) دەستی پێکرا، بە هاتنی (آيَةُ السَّيْف)=ئایەتیشمشێر،

وَالْحجُّ وَالْجِهَادُ مَاضِيَانِ مَعَ أُولِي الأَمْرِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ بَرِّهِمْ وَفَاجِرِهِمْ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ لاَ يُبْطِلُهُمَا شَيْءٌ وَلاَ يَنْقُضُهُمَا.

---

كه ئەمەیە: ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً﴾ التوبة:٣٦، جەنگ لەگەڵ كافرەكان بكەن بە گشتی. یان ئەمەیە: ﴿انْفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالاً وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللهِ﴾ التوبة:٤١، راپەڕن بە سووكیو بە گرانی، (جهادْ) بكەن بە ماڵو بە گیان لە ڕێگەی خوا. بۆ دڵنیایی بڕوانە (تحفة المحتاج) ل٢١٢ ب٩ و(السيرة الحلبية) ل١٢٩ ب٢.

ئینجا لەم قۆناغەیچوارەم بڕیاری خوا دەربارەی (جهادْ) جێگیر بوو، تا دونیا وێران ئەبێ هیچ گۆڕانكاریی نایەتە سەر، هەروەك ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(وَالْحَجُّ) حەج كردن (وَالْجِهَادُ) تێكۆشان لە ڕێگەی خوا (مَاضِيَانِ) هەردووكیان بەردەوامنو هەر ئەبێ بكرێن (مَعَ أُولِي الأَمْرِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ) لەگەڵ كاربەدەستی موسوڵمانان (بَرِّهِمْ وَفَاجِرِهِمْ) جا پیاوی چاك بن، یان ستەمكار بن (إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ) تا دونیا وێران ئەبێ، هەر بەردەوامن (لاَ يُبْطِلُهُمَا شَيْءٌ وَلاَ يَنْقُضُهُمَا) هیچ شتێك بڕیاری حەج كردنو جیهادكردن هەڵناوەشێنێتەوە، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿الْجِهَادُ مَاضٍ مُنْذُ بَعَثَنِيَ اللهُ إِلَى أَنْ يُقَاتِلَ آخِرُ هَذِهِ الأُمَّةِ الدَّجَّالَ، لاَ يُبْطِلُهُ جَوْرُ جَائِرٍ وَلاَ عَدْلُ عَادِلٍ﴾ رواه أبوداود بسند صحيح، جیهاد واجبەو بەردەوامە لەو ڕۆژەوە كە خوا منی ناردوە بە پێغەمبەر، تا دواییینی ئەم ئوممەتەم جەنگ لەگەڵ دەججال ئەكا، بڕیاری (جهاد) بە ستەمی هیچ ستەمكارێكو بە دادپەروەریی هیچ دادپەروەرێك هەڵناوەشێتەوە.

واتە: جیاوازی نیە: فەرمانڕەواكانمان پیاوچاك بن، یان پیاوخراپ بن: واجبە (جهاد) لە ژێر سەركردایەتی ئەواندا هەر بكرێ، چونكە (جهاد) واجبێكی گەورەیەو نابێ بە هۆی تاوانباریی چەند كەسێك ئەم واجبە دوابخرێ، بۆ دڵنیایی بڕوانە (فتح الباري) ل٨ ب١٣.

ئەی (موسوڵمانیخۆشەویست)، وا بە چاوی خۆت ئەبینی: (كُفْر)–بە هەر چوار جۆریەوە– وڵاتی ئیسلامی داگیر كردوەو یاسای ئیسلامی قەدەغە كردوەو یاسای (كُفْر)ی بە سەر موسوڵماناندا سەپاندوە، كەوابوو: واجبی سەرشانی گشت موسوڵمانێكە: بە گیانو بە ماڵو بە زمان تێبكۆشێ: بۆ گەڕاندنەوەی (حوكمی) خوداو دەركردنی(كُفْر) لە ڕەگو ڕیشەوە، تاكو یاسای ئیسلام بەرقەرار بێو دەسەڵاتی(كُفْر) بە سەر ئیسلامدا نەمێنێ، خوایگەورە ئەفەرموێ: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَتَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ﴾ الأنفال:٣٩، جەنگیان لەگەڵ بكەن تاكو ئاژاوەو دەسەڵاتی (كُفْر) نەمێنێو گوێڕایەڵیو پەرستنو دەسەڵات گشتی بۆ خوا بێ.

شتێكی ئاشكرایە: تا موسوڵمانان نەچنەوە سەر لوتكە بەرزەكەی ئیسلام، سەربەرز نابنەوە، بۆیێ پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ﴾ رواه الترمذي بسند

صحيح، لوتكەی هەرە بەرزی ئیسلام جیهادکردنە. کەوابوو: ئەی موسوڵمانی ڕاستەقینە، تۆش لە ڕێگەی خودا ڕاپەڕەو خوێنە بە نرخەکەی خۆت بە پارەیەکی بە نرخ بفرۆشە خوای گەورە: کە بەهەشتەو جێگەی غیرەتمەندانە، برای موسوڵمان، بە قسەی ئەو کەسانە تەفرە نەدرێی کە ئەڵێن: (جهاد) سودی نیە، یان ئەڵێن: کاتی نەهاتوە، چونکە پەیتا پەیتا خوێنە بە نرخەکەت کەم نرخ دەبێو لە ناو ڕەگەکانتدا ووشك ئەبێتەوەو دەمرێو فریای (جهاد) ناکەوی، پێغەمبەریش ﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ وَلَمْ يُحَدِّثْ بِهِ نَفْسَهُ مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ نِفَاقٍ﴾ رواهُ مُسْلِم، هەرکەسێك بمرێو غەزای نەکردبێ، بە دڵیش نیازی غەزای نەبوبێ، ئەوە بە بەشێکی نیفاقەوە ئەمرێ.

## ﴿ باسی فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە (الأمرُ بالمَعْرُوفِ والنَّهيُ عَنِ المُنكَر) ﴾

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ آل عمران:١٠٤، ئەبێ کۆمەڵێك لە ئێوە ببێ: بانگەوازی بۆ چاکە بکەنو فەرمان بە چاکە بکەنو خراپە قەدەغە بکەن. هەم پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ﴾ رواهُ مُسْلِم، هەرکەسێك لە ئێوە خراپەیەکی دیت، واجبە بە دەستی خۆی لایبا، جا ئەگەر توانای نەبو، واجبە بە زوبانی خۆی لاببا، جا ئەگەر توانای نەبو، واجبە بە دڵی خۆی پێی ناخۆش بێ، ئەمەی سێیەم لاوازترینی ئیمانە. واتە: ئەگەر بە دڵیش پێی ناخۆش نەبو، ئەوە نیشانەی بێئیمانییە، هەروەك لە حەدیسێکیتردا هاتوە، کە (مُسْلِم) گێڕاویەتیەوە.

ئیمامی (النولوی) ئەفەرموێ: قورئانو حەدیسو یەکدەنگی موسوڵمانان یەکتریان گرتۆتەوە: کە فەرمان بە چاکەو قەدەغەکردنی خراپە واجبەو بەشێکە لە ئامۆژگاری. ئینجا ئەفەرموێ: فەرمان بە چاکەو قەدەغەکردنی خراپە تایبەت نیە بە کاربەدەستەکان، بەڵکو تاکە تاکەی موسوڵمانیش ئەم ئەرکەیان هەیە. ئینجا ئەفەرموێ: (إمامُ الحَرَمَيْن) ئەفەرموێ: بەو مەرجە تاکە تاکەی موسوڵمانان ئەم ئەرکەیان هەیە: کە نەگاتە پلەی چەك ڕاکێشانو جەنگکردن، ئەگینا: هەر کاربەدەست ئەبێ ئەم ئەرکە ئەنجام بدا، جا ئەگەر کاربەدەست ستەمکار بوو: ئەو کاتە واجبە پیاوماقوڵان ڕێك کەونو یەکتر بگرن: تاکو لە سەر کار لایبدەن، هەرچەند بەهێزی چەکیش بێو جەنگیش ڕووبدا. ئینجا ئەفەرموێ: بەو مەرجەی خراپەیەکی گەورەتر لەم خراپەیە ڕوو نەدا. (شرح صحيح مسلم) ل٢٣٧ تا ٢٤٢ ب١.

ئینجا بزانە: مەرجی واجببوونی فەرمان بە چاکەو قەدەغەکردنی خراپە ئەمەیە: دڵنیا بێ: کە زیان بە گیانی خۆیو خەڵکیترو ماڵی خۆیو خەڵکیترو ئابرووی خۆیو خەڵکیتر

وَنُؤمِنُ بِالْكِرَامِ الْكَاتِبِينَ فَإِنَّ اللهَ قَدْ جَعَلَهُمْ عَلَيْنَا حَافِظِينَ، وَنُؤمِنُ بِمَلَكِ الْمَوْتِ الْمُوَكَّلِ بِقَبْضِ أَرْوَاحِ الْعَالَمِينَ.

---

ناگا، جا ئەگەر ئەم زيانانە تووشی خەڵكی‌تر ئەبون: ئەوە واجب نيە، بەڵكو حەرامە، بەلام ئەگەر زيانەكان تەنها تووشی خۆی ئەبون: ديسان واجب نيە بەڵكو سوننەتە، تاكو بە پلەی شەهيدی بگا، بۆ دڵنيايی بڕوانە (تحفة المحتاج) ل٢١٦ ب٩. پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿سَيِّدُ الشُّهَدَاءِ حَمْزَةُ وَرَجُلٌ قَامَ إِلَى سُلْطَانٍ جَائِرٍ فَأَمَرَهُ وَنَهَاهُ فَقَتَلَهُ﴾ رواه الحاكم، گەورەی شەهيدان (حمزة)ی مامی پێغەمبەرەﷺو هەم ئەو پياوەشە: كە ڕووبەڕووی كاربەدەستێكی ستەمكار ببێتەوەو فەرمانی بە چاكە پێ بكاو لە خراپە قەدەغەی بكا، ئينجا ستەمكارەكە بيكوژێ.

## ﴿باسی چەند جۆرە فريشتەيەك﴾

ئيمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَنُؤْمِنُ بِالْكِرَامِ الْكَاتِبِينَ) باوەڕمان هەيە بەو فريشتە بەڕێزانەی كردەوەكانمان ئەنووسن (فَإِنَّ اللهَ قَدْ جَعَلَهُمْ عَلَيْنَا حَافِظِينَ) چونكە خوای گەورە ئەوانی كردوتە چاودێر لە سەر ئێمەو بەردەوام لەگەڵماندانە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ، كِرَامًا كَاتِبِينَ، يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ﴾ الإنفطار:١٠-١٢، بە ڕاستی چەند فريشتەيەك لە سەر ئێوە چاودێرن‌و لە لای خوا بەڕێزن‌و نووسەری كردەوەكانتانن‌و ئەزانن ئێوە چی ئەكەن. واتە: كردەوەكانتان ئەنووسن.

ئينجا بزانە: فريشتەيەك لە لای ڕاستەيە چاكە ئەنووسێ، فريشتەيەكيش لە لای چەپەيە خراپە ئەنووسێ، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ، مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلاَّ لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ ق:١٧-١٨، ئەو كاتەی هەردوو فريشتەكان بە يەك دەگەنەوە، يەك لە ڕاستەو يەك لە چەپە دانيشتوە، هەر گوفتارێكی مرۆڤ ئەيڵێ، چاودێرێكی ئامادەبوو لە لايەتی. واتە: گوفتارەكانی ئەنووسن، هەروەك كردەوەكانيشی ئەنووسن، ئيمامی (النولوی) لە ئيمامی (الطحاوی) ئەگێڕێتەوە بە بەڵگەی چەند حەديسێك: فريشتە چاودێرەكان ويستو بڕياری ناو دڵيش ئەنووسن. (شرح صحيح مسلم) ل٤٩٣ ب١.

(وَنُؤْمِنُ بِمَلَكِ الْمَوْتِ) باوەڕمان هەيە بە فريشتەی مردن (الْمُوَكَّلِ بِقَبْضِ أَرْوَاحِ الْعَالَمِينَ) كە پێی سپێردراوە گيانی گيانلەبەران دەربێنێ، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿قُلْ يَتَوَفَّاكُمْ مَلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ﴾ السجدة:١١، بڵێ: فريشتەی مردن گيانی ئێوە وەرئەگرێ كە مراندنی ئێوەی دراوەتە دەست، ئينجا لە ڕۆژی قيامەت زيندوو ئەبنەوەو ئەگەڕێندرێنەوە لای خوای خۆتان. ئينجا بزانە: زانايانی ئيسلام بە فريشتەی مردن ئەڵێن: (عزرائيل). (نَثْرُ اللآلي) ل٦٤.

هەروەها بزانە: بە فەرمانی خوا فریشتەی مردن گیانی گیانلەبەران دەردێنێ، ئینجا: یان ئەیداتە دەست فریشتەکانی ڕەحمەت، یان فریشتەکانی عەزاب، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا جَاءَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لاَ يُفَرِّطُونَ﴾ الأنعام:٦١، تا کاتی مردنی یەکێکیان دێ: فریشتەکانی ئێمە ئەیگەنێو گیانی وەرئەگرنو کەمتەرخەمی ناکەن. بڕوانە (شرح الطحاوية) ل٥٦٢ ب٢.

## ﴿ باسی ڕۆژی دوایی (اَلْيَوْمُ الآخِرُ) ﴾

**پێشەکی** بزانە: هەرکەسێك بمرێ، ئەوە ژیانی دونیای کۆتایی دێو پێ ئەنێتە ژیانێکیتر کە پێی ئەگوترێ: ژیانی ڕۆژی دوایی، کەواتە: ڕۆژی دوایی (اَلْيَوْمُ الآخِر) لە مردنەوە دەست پێئەکا، بڕوانە (فتح المبين) ل٦٣. ئینجا بزانە: ئەم ژیانەی ڕۆژی دوایی دوو قۆناغە:

**یەکەم:** زیندووبوونەوەی ناو قەبر، واتە: دوای مردن ﴿عَنْ عُثْمَانَ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّ الْقَبْرَ أَوَّلُ مَنَازِلِ الآخِرَةِ فَإِنْ نَجَا مِنْهُ فَمَا بَعْدَهُ أَيْسَرُ مِنْهُ، وَإِنْ لَمْ يَنْجُ مِنْهُ فَمَا بَعْدَهُ أَشَدُّ مِنْهُ﴾ رواه الترمذي بسند حسن، گۆڕ –واتە: زیندووبوونەوەی دوایمردن– یەکەم قۆناغی هەوارگەکانی ڕۆژی دوایییە، جا ئەگەر بەندە لەم قۆناغە ڕزگار ببێ، لە قۆناغەکانیتر ئاسانتر ڕزگاری ئەبێ، ئەگەر ڕزگار نەبێ، ئەوە لە قۆناغەکانیتر توندتر گرفتار ئەبێ. ئینجا بزانە: لەم زیندووبوونەوەدا جیاوازی نیە: مردووەکە نێژرابێ، یان سوتێنرابێ، یان پارچە کرابێ، یان لە سەر زەوی فڕێدرابێ...هتد.

**دووەم:** زیندووبوونەوەی قیامەت، کە بە (نَفْخُ الصُّور)ی دووەم دەست پێئەکا، هەروەك لەمەودوا باسی ئەکەین، ئینجا بزانە: ئەم ژیانەی دوای مردن، تا زیندووبوونەوەی قیامەت، پێی ئەگوترێ: (بَرْزَخ)، واتە: پەردەی نێوان دونیاو زیندووبوونەوەی قیامەت، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمِنْ وَرَائِهِمْ بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ المؤمنون:١٠٠، لە بەردەم ئەو مردووانە پەردەیەك هەیە تا ئەو ڕۆژەی زیندوو ئەکرێنەوە. بڕوانە (النهاية لإبن الأثير): مادة (بَرْزَخ).

## ﴿ باسی ئازارو پرسیاری ناو گۆڕ ﴾

ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(وَبِعَذَابِ الْقَبْرِ) باوەڕمان هەیە بە ئازاری گۆڕ، واتە: ئازاری (بَرْزَخ)ی دوای مردن، جا مردووەکە نێژرابێ، یان نا (لِمَنْ كَانَ لَهُ أَهْلاً) بۆ ئەو مردووەی بڕیاری ئازاردرانی درابێ، پێغەمبەرﷺ دوعای ئەکرد: ﴿اَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، خوایە خۆم ئەپارێزم بە تۆ لە ئازاری ناو گۆڕ.

وسُؤال مُنكَرٍ ونكيرٍ في قَبرِه عنْ رَبِّه ودينِه ونَبيِّه على ما جاءَ تْ به الأخبارُ عــن رســول اللهﷺ وعَنِ الصَّحابَة رضوان الله عليهم. والقَبرُ رَوضَةٌ منْ رياضِ الْجنَّة أوْ حُفرةٌ منْ حُفرِ النّيرانِ.

---

(وسُؤال مُنكَرٍ ونكيرٍ في قَبْرِه) باوەڕمان هەیە بە پرسیارکردنی (مُنكَر)و(نكير)-هەردوو فریشتەی ناو گۆڕ- لە مردوو: (عنْ ربِّه) خوای وی کێیە؟ (ودينِه) ئایینی چییە؟ (ونبيِّه) پێغەمبەری کێیە؟ واتە: چونکە ئەم سێیانە بنچینەی ئایینن (على ما جاءَ تْ بـه الأخبارُ عنْ رسُولِ اللهﷺ) بە بەڵگەی چەند حەدیسێکی (صَحيح) کە لە پێغەمبەرەوە هاتوەﷺ (وعَنِ الصَّحابَةِ رضوانُ الله عليهِمْ) وە لە سەحابەکانیشەوە هاتوە، هەروەکو پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إذَا قُبِرَ الْمَيِّتُ أتَاهُ مَلَكَان أسْوَدَان أزْرَقَان يُقَــالُ لأحَــدِهمَا: الْمُنكَــرُ، وَللآخَرِ: النَّكيرُ...الحَديثَ﴾ رواه ابن حبان والترمذی وقال حسن غريب، کاتێ مردوو خرایە ژێر خاک، دوو فریشتەی ڕەش و شین دێنە لای، یەکێکیان پێی ئەگوترێ: (مُنكَر)، ئەویتر پێی ئەگوترێ: (نكير)... تا کۆتایی حەدیسەکە.

(وَالْقَبْرُ) گۆڕ، واتـە: ژیـانی (بَـرزخ)ی دوای مـردن (رَوْضَـةٌ مـنْ ريـاض الْجنَّـة) باغێکـه لـه باغـەکانی بەهەشـت بـۆ پیاوچـاکان (أوْ حُفْـرَةٌ مـنْ حُفَـرِ النِّيران) یـان خەندەقێکـه لـه خەندەقەکانی ئاگر بۆ پیاوخراپان، هەروەکو پێغەمبەرﷺ ئەفـەرموێ: ﴿إنَّماالْقَبْرُ رَوْضَةٌ منْ رِيَاضِ الْجنَّة، أوْ حُفْرَةٌ منْ حُفَرِ النَّارِ﴾ رواه الترمذی وقال حسن غريب.

﴿وَعَنِ البَراءِ رضي الله عنه في حَديثه الطّويل...قالَ النَّبيُّﷺ: إسْتَعيذُوا باللهِ منْ عذابِ الْقَبْــرِ، ثلاثَ مَرَّات، ثُمَّ قَالَ إنَّ الْمُؤْمنَ إذَا وُضعَ في قَبْرِه وَتَولَّى عَنْهُ أصْحَابُهُ-وَهُوَ يَسْــمَعُ خَفْقَ نعَالِهِمْ-يَأتِيه مَلَكَان فَيُجْلِسَانه فَيَقُولان لَهُ: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: رَبِّيَ اللهُ. فَيَقُــولان لَهُ: مَا دينُكَ؟ فَيَقُولُ: دينيَ الإسْلاَمُ. فَيَقُولاَن لَهُ: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذي بُعِــثَ فــيكُمْ؟ فَيَقُولُ: هُوَ رسُولُ اللهِﷺ...فَذَلكَ قَوْلُ الله عز وجل: ﴿يُثَبِّتُ اللهُ الَّذينَ آمَنُــوا بــالْقَوْلِ الثَّابت في الْحَيَاةِالدُّنْيَا وَفي الآخرَةِ﴾. فَيُنَادي مُنَاد منَ السَّمَاء أنْ قَدْ صَــدَقَ عَبْــدي، فَأفْرِشُوهُ منَ الْجَنَّة وَألْبِسُوهُ منَ الْجَنَّة وَافْتَحُوا لَهُ بَابًا إلَىالْجَنَّة. قَالَ: فَيَأتيه منْ رَوْحهَا وَطيبهَا وَيُفْتَحُ لَهُ فيه مَدَّ بَصَرِه. وَإنَّ الْكَافرَ أو الْمُنافقَ: إذَا وُضعَ في قَبْــرِه وَعَــادَتْ رُوحُهُ في جَسَده، يَأتيه مَلَكَان، فَيُجْلسَانه فَيَقُولان لَهُ: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ هَــاهْ لا أدْري. فَيَقُولان لَهُ: مَا دينُكَ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ هَاهْ لاَ أدْري. فَيَقُولان: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذي بُعثَ فيكُمْ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ هَاهْ لاَ أدْري. فَيُنَادي مُنَاد منَ السَّمَاء: أنْ كَــذَبَ عَبْــدي فَأفْرِشُوهُ منَ النَّار وَألْبِسُوهُ منَ النَّار وَافْتَحُوا لَهُ بَابًا إلَى النَّار. قَالَ: فَيَأتيه مــنْ حَرِّهَــا وسَمُومِهَا وَيُضَيَّقُ عَلَيْه قَبْرُهُ حَتّى تَخْتَلفُ فيه أضْلاعُهُ...﴾الحَديثَ، رواه أحمد وأبوداود بسند حسن، واتە: پێغەمبەرﷺ سێ جار فەرمووی: خۆتـان بـه خـوا بپـارێزن لـه ئـازاری

گۆڕ. ئینجا فەرمووی: کاتێ ئیماندار خرایە ناو گۆڕەکەیو هاوڕێکانی گەڕانەوە، گوێی لە دەنگی پێڵاوەکانیانە، دوو فریشتە-(مُنْكَرٌ وَنَكِيرٌ)- دێنە لایو دایئەنیشێننو لێی ئەپرسن: خوای تۆ کێیە؟ ئەڵێ: خوای من (الله)یە. ئینجا لێی ئەپرسن: ئایینت چییە؟ ئەڵێ: ئایینم ئیسلامە. ئینجا لێی ئەپرسن: ئەو پیاوەی -واتە: (مُحَمَّد)- ناردرابوە لای ئێوە چی بوو؟ ئەڵێ: پێغەمبەری خوا بووﷺ. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەم وەڵامە ڕاستە واتەی ئەم ئایەتەیە: ﴿يُثَبِّتُ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ﴾ إبراهيم:٢٧، کە خوای گەورە ئەفەرموێ: خوای گەورە زوبانی ئیمانداران ڕاست ئەکا بۆ گوتەی ڕاست لە دونیاو لە ڕۆژی دوایی. ئینجا فەرمووی: یەکێك لە ئاسمان بانگ ئەکا: کە خوا ئەفەرموێ: بەندەی من ڕاستی گوت، کەوابوو: لە بەهەشت بۆی ڕابێخنو لە بەرگی بەهەشت بیکەنە بەرو دەرگەیەکی بۆ لای بەهەشت بۆ بکەنەوە. ئینجا بۆنە خۆشەکەی بەهەشتی بۆ دێو بەقەد بینایی چاوی گۆڕەکەی بۆ بەرفراوان ئەکرێ.

هەروەها کاتێ (کافر)، یان (مُنافق) خرایە ناو گۆڕەکەیو گیانەکەی هاتەوە ناو لاشەکەی، دوو فریشتە-(مُنْكَرٌ وَنَكِيرٌ)- دێنە لایو دایئەنیشێننو لێی ئەپرسن: خوای تۆ کێیە؟ ئەڵێ: هاه هاه نازانم. ئینجا لێی ئەپرسن: ئایینت چییە؟ ئەڵێ: هاه هاه نازانم. ئینجا لێی ئەپرسن: ئەو پیاوەی ناردرابوە لای ئێوە-واتە: (مُحَمَّدٌ)- چی بوو؟ ئەڵێ: هاه هاه نازانم. ئینجا لە ئاسمانەوە یەکێك بانگ ئەکا: کە خوای گەورە ئەفەرموێ: بەندەی من درۆی کرد، کەوابوو: لە دۆزەخ بۆی ڕابێخنو لە ئاگر بیکەنە بەرو دەرگەیەکی بەرەو ئاگر بۆ بکەنەوە. ئینجا گەرمایيو پشووە گەرمەکەی دۆزەخی بۆ دێو گۆڕەکەی لە سەر بەرتەسك ئەکرێ، تا پەراسووەکانی تێك ئەچەقنەوە.

ئیمامی (النواوي) ئەفەرموێ: لەلای (أهل السُّنَّة): ئەم ئازارە بۆ گیانو لاشەی مردووەکەیە، جا: یان هەموو لاشەکەی، یان هەر بەشێکیی پاش ئەوەی گیانی دێتەوە ناو. (شرح صحيح مسلم) ل٣١٩ ب١٠.

هەروەها (إبن أبي العِزّ) ئەفەرموێ: ئەم پرسیارو ئازارەی گۆڕ: بۆ گیانو لاشەی مردووەکەیە، بە یەکدەنگی (أهل السُّنَّة والجَماعة)، ئینجا ئەفەرموێ: ئەم ئازاردانە، ئازاری (بَرْزَخ)ە، هەرکەسێ مستەحەقی سزادان بێ، ئەوە بەشی خۆی لەم ئازارە ئەگاتێ، جیاوازی نیە: نێژرابێتە ناو گۆڕ، یان نا، درندە خواردبێتی، یان سووتابێ تا ئەبێتە خۆڵەمێش، یان لە قنارە درابێ، یان لە دەریادا خنکابێ، هەموو ئەوانە: گیانو لاشەکەیان ئازار ئەبینێ. (شرح الطحاوية) ل٥٧٩ ب٢.

﴿ئاگاداری﴾: مەبەستی ئەم فەرموودەیە: لاشەیەکی (بَرْزَخي)یە، ئێمەش چۆنیەتی ئەم لاشەیە نازانین، چونکە-جگە لە چەند جۆرە کەسێك- بە زۆری وا ڕوو ئەدا: لاشەی دونیای

نامێنێ: بە هۆی سوتان، یان ڕزینو بوونەوە خاك...هتد، تا ڕۆژی (قیامَة)ش دروست ناکرێتەوە. هەروەها لە حەدیسەکەی ڕابردوداو لە حەدیسی کوژراوەکانی غەزای (بدْر)دا، بۆمان دەرئەکەوێ: کە مردوو ئاگادارە: لە کردارو گوفتاری زیندووان، بەڵام ئێمە چۆنیەتی ئەم ژیانە (بَرْزَخی)یەش نازانین، کەوابوو: گیانی مردوو–لە دوای مردن– جۆرە پەیوەندییەکی بە لاشەی دونیایەوە هەیە، جا ئەگونجێ–والله أعلم– ئەم پەیوەندییە بە هۆی (کلینجە)وەبێ، چونکە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿لَيسَ مِنَ الإنْسَانِ شَيْءٌ إلاَّ يَبْلَى إلاَّ عَظْمًا وَاحِدًا: وَهُوَ عَجْبُ الذَّنَبِ، وَمِنْهُ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، هەر پارچەیەکی ئادەمیزاد هەیە، گشتی لەناو ئەچێ، تەنها یەك ئێسقان نەبێ: کە ناوی (کلینجە)یە، هەر لەو (کلینجە)یەش ئادەمیزاد دروست ئەکرێتەوە لە ڕۆژی قیامەت.

(کلینجە): ئێسقانێکی بچووکە ئەکەوێتە کۆتایی زنجیرەی پشتی مرۆڤ.

هەروەها بزانە: ئەم جۆرە کەسانە پرسیاریان لە ناو گۆڕدا لێناکرێ: پێغەمبەران عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ، شەهیدانی ڕێگەی خوا، ئێشکگرانی سەنگەری ئیسلام، مردووەکانی شەو و ڕۆژی هەینی. هەروەها ئەوەش بزانە: ئازاری ناو گۆڕ تەنها کافرو تاوانباران ئەگرێتەوە، ئینجا هەندێ کەس تەنها ماوەیەك ئازار ئەدرێ، هەندێکیش تا ڕۆژی دوایی، هەروەها بزانە: لاشەی پێغەمبەران عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلامُو شەهیدان نارزێو نابێتەوە خاك، گیانی پێغەمبەران عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ لە (عِلِّيِّينَ)، گیانی شەهیدان لە ناو باڵندە سەوزەکانی بەهەشتدایە، بۆ دڵنیایی بڕوانە (شرح الطحاوية) ل٥٧٨ تا ٥٨٨ ب٢و (نَثْرُ اللآلى) ل٢٣٤ تا ٢٣٨.

## ﴿ باسی تێکچوونی دونیاو زیندووبوونەوەی قیامەت ﴾

بزانە: هەر کاتێك خوای گەورە ویستی دونیا وێران بکا، فەرمان ئەکاتە فریشتەیەك–کە ناوی (إسْرافيل)ە– فوو ئەکاتە (صُور)و ئەم دونیایە بە ئاسمانو زەمینەوە وێران ئەکا، گشت گیانلەبەرێك ئەمرێ جگە لە چەند کەسێك نەبێ: کە خوا حەز ئەکا نەمرن، ئینجا جاری دووەم فوو ئەکاتەوە (صُور)و گشت گیانلەبەرێك زیندوو ئەبێتەوە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ إلاَّ مَنْ شَاءَ اللهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ﴾ الزمر:٦٨، فوو ئەکرێتە (صُور)، هەر چی لە ئاسمانو زەمینە گیانی دەرئەچێ، جگە لەو کەسانەی خوا حەز بکا: نەمرن، ئینجا دووبارە فووێکیتری ئەکرێتێو گشتیان زیندوو ئەبنەوەو چاوەڕوان ئەکەن چیان بە سەر دێ؟. ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما: سُئِلَ النَّبِيُّﷺ مَا الصُّورُ؟ قَالَ: قَرْنٌ يُنْفَخُ فِيهِ﴾ رواه الترمذي وأبوداود بسند حسن، پرسیار لە پێغەمبەرﷺ کرا: (صُور) چییە؟ فەرمووی: قۆچێکە فووی ئەکرێتێ.

وَنُؤْمِنُ بِالْبَعْثِ، وَجَزَاءِ الأَعْمَالِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَالْعَرْضِ وَالْحِسَابِ، وَقِرَاءَةِ الْكِتَابِ، وَالثَّوَابِ وَالْعِقَابِ، وَالصِّرَاطِ، وَالْمِيزَانِ.

---

ئینجا بزانە: فووکردن=(نَفْخُ الصُّورِ)ی یەکەم-کە دونیا ویران ئەکا- لە قورئانی پیرۆزدا بە چەند ناوێك هاتوە: وەکو (السَّاعَة، الآزِفَة، الحَاقَّة، الغَاشِيَة، الواقِعَة، القَارِعَة، الرَّاجِفَة). هەروەها فووکردن=(نَفْخُ الصُّورِ)ی دووەم-کە خەلکی پێ زیندوو ئەبێتەوە- ئەویش بە چەند ناوێك هاتوە: وەکو (يَوْمُ الْبَعْثِ، يَوْمُ الْقِيَامَةِ، يَوْمُ الدِّينِ، يَوْمُ الْفَتْحِ، يَوْمُ التَّلَاقِ، يَوْمُ الْحَسْرَةِ، يَوْمُ الْجَمْعِ، يَوْمُ التَّغَابُنِ، يَوْمُ الْخُرُوجِ، يَوْمُ التَّنَادِ، الرَّادِفَة، الطَّامَّةُالْكُبْرَى، الصَّاخَّة).

ئینجا بزانە: (الْيَوْمُ الآخِر)=ڕۆژی دوایی، بە هەردووکیان ئەگوترێ، ئیمامی (النووی)و (القَسْطَلانی) فەرموویانە: لە چەند گێڕانەوەیەکدا هاتوە: کە نێوان هەردوو فووکردنەکە چل ساڵە. بڕوانە (شرح صحیح مسلم) ل٤٢١ ب١٠و (إرْشاد الساری شرْح البخاری) ل٣٢٣ ب٧.

ئینجا بزانە: لەم زیندووبوونەوەی (قیامَة)، لاشەکەی دونیا بە تەواوی دروست ئەکرێتەوەو گیانی دێتەوە ناو ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضی الله عنهما: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ مَحْشُورُونَ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً ثُمَّ قَرَأَ: (كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ)﴾ الأنبياء:١٠٤، رواهُ البخاري ومُسْلِم، ئەی خەلکینە: ئێوە حەشر ئەکرێن بۆ لای خوا: بە پێخواسی‌و بە ڕووتی‌و بە سوننەت نەکراوی، خوای گەورە ئەفەرموێ: هەروەك دروستکردنی یەکەم، دووبارە دروستی ئەکەینەوە. ئیمامی (النـواوی)و (الآلوسی) فەرموویانە: هەروەك یەکەم جار گشت ئەندامەکانی کۆ ئەکرێنەوەو گیانی دێتەوە ناو و یەك پارچەشی لە دەست ناچێ، تا ئەو پارچە چەرمەی سەر ئەندامی نێرینەش-کە لە دونیا لێ‌کراوەتەوە- ئەیدرێتەوە. بڕوانە (شرح صحیح مسلم) ل٣١١ ب١٠و (نَثْرُ اللآلی) ل٢٤٦.

ئینجا بزانە: بەم فووکردنە=(نَفْخُ الصُّورِ)ی دووەم، قۆناغە پڕ ترسەکانی‌تری قیامەت دەست پێ‌ئەکرێن، هەروەك ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَنُؤْمِنُ بِالْبَعْثِ) باوەڕمان بە زیندووبوونەوەی (قیامة) هەیە، هەروەك باسمان کرد (وَجَزَاءِ الأَعْمَالِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) باوەڕمان بە سزای کردەوەکان هەیە لە ڕۆژی قیامەت (وَالْعَرْضِ) باوەڕمان هەیە: بە بردنمان بۆ بەردەست خوای گەورە بۆ پرسیار لێکردن (وَالْحِسَابِ) باوەڕمان بە پرسیارو لێکۆڵینەوەی (قیامة) هەیە (وَقِرَاءَةِ الْكِتَابِ) باوەڕمان بە خوێندنەوەی نووسراوی کردەوەکانمان هەیە (وَالثَّوَابِ وَالْعِقَابِ) باوەڕمان بە پاداشت‌و سزای کردەوکانمان هەیە (وَالصِّرَاطِ) باوەڕمان بە پردی (جَهَنَّمْ) هەیە (وَالْمِيزَانِ) باوەڕمان بە تەرازووی (قیامة) هەیە، ئینجا بە پشتیوانی خوا ئەم باسانە بە پووختی ڕوون ئەکەینەوە:

## ﴿ باسی وەستانی گۆڕەپانی مەحشەر (الحَشْرُ فِي المَوْقِف) ﴾

بزانە: کە ئەم خەڵکە زیندوو کراوە، بەم شێوەیە (حَشْر) ئەکرێن، واتە: لە گۆڕەپانی (مَحْشَر)–کە پێی ئەگوترێ: (المَوْقِف)– کۆ ئەکرێنەوە: ﴿عَنْ بَهْزِ بن حَكِيم عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ: قَالَ: يَقُولُ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّكُمْ مَحْشُورُونَ رِجَالاً وَرُكْبَانًا وَتُجَرُّونَ عَلَى وُجُوهِكُمْ﴾ رواه الترمذي بسند صحيح، ئێوە ئەبرێرێنە گۆڕەپانی مەحشەر: هەندێك بە سواری، هەندێك بە پیادە، هەندێك لە سەر ڕوو ڕائەکێشرێن.

ئینجا بزانە: ئەم گۆڕەپانەی (مَحْشَر) زەمینێکیترە جگە لەم زەمینەی ئێستا، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ﴾ إبراهيم:٤٨، لە ڕۆژی دوایی ئەم زەمینە بە زەمینێکیتر ئەگۆڕدرێ. ﴿عَنْ سَهْلِ بن سَعْدٍ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ كَقُرْصَةِ نَقِيٍّ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، ئەم خەڵکە لە سەر زەمینێکی سپیباتی وەکو کولێرەی سوورکرایەوە، حەشر ئەکرێ. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٢٥٢ ب١٠.

ئینجا بزانە: مرۆڤ لە دونیادا شوێنکەوتەی کام گرۆ و کام سەرکردە بوبێ، لە ڕۆژی دواییش لەگەڵ هەمان گرۆ و هەمان سەرکردەدا حەشری ئەکرێ، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَوْمَ نَدْعُو كُلَّ أُنَاسٍ بِإِمَامِهِمْ﴾ الإسراء:٧١، لە ڕۆژی (قيامَة) هەموو خەڵکێك لەگەڵ پێشەوای خۆیاندا بانگ ئەکەین. هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿اَلْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم. هەم دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يُحِبُّ رَجُلٌ قَوْمًا إِلاَّ حُشِرَ مَعَهُمْ﴾ رواه الطبراني بإسناد جيد، واتە: مرۆڤ لە دونیادا کێی خۆشویستبێ، حەشری لەگەڵ ئەویدا ئەکرێ. بڕوانە (التَّرْغِيب وَالتَّرْهِيب) ل٢٨ ب٤و (التاج) ل٨٠ ب٥.

کەوابوو: ئەی موسوڵمانی بەڕێز: هەر ئێستا بزانە: کێ پێشەواتە؟ لەگەڵ کام کۆمەڵی؟ کێت خۆش ئەوێ؟ ڕۆژی دوایی گلەیی لە کەس مەکە!!.

## ﴿ باسی سەختیی (المَوْقِف) گۆڕەپانی مەحشەر ﴾

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿تُدْنَى الشَّمْسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنَ الْخَلْقِ حَتَّى تَكُونَ مِنْهُمْ كَمِقْدَارِ مِيلٍ، فَيَكُونُ النَّاسُ عَلَى قَدْرِ أَعْمَالِهِمْ فِي الْعَرَقِ: فَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى كَعْبَيْهِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى رُكْبَتَيْهِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى حَقْوَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يُلْجِمُهُ الْعَرَقُ إِلْجَامًا، وَأَشَارَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِيَدِهِ إِلَى فِيهِ﴾ رواهُ مُسْلِم، لە مەیدانی مەحشەر–کە خەڵك وەستاوە– ڕۆژ لێیان نزیك ئەبێتەوە بە ئەندازەی میلێك، ئینجا ئەم خەڵکە لە بەر گەرمایی و پاڵەپەستە ئارەقەی لێئەچکێتە خوارەوە، هەرکەسە بە گوێرەی کردەوەکانی لە گۆمی ئارەقەدا نقوم ئەبێ: هەندێك تا گوزینگ، هەندێك تا ئەژنۆ، هەندێك تا پشتێندی، هەندێك تا دەم و لووتی ئارەقە لغاوی ئەکا. (شرح صحيح مسلم) ل٣١٢ ب١٠.

ئینجا بزانە: لە ڕۆژی دواییدا، خزمایەتیو پلەو پایەی دونیا سوودی نیە، هەروەها بزانە: چەند جۆرە کەسێك لە حەدیسی (صَحیح)دا باسیان کراوە: کە لەم سەختاییە ئەپارێزرێنو خوای گەورە لە سێبەری (عَرْش)ی خۆی دایان ئەنێ.

## ﴿ تکا گەورەکەی پێغەمبەرﷺ لە گۆرەپانی (مَحْشَر) ﴾

﴿عَنْ أَنَس بن مَالِكٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: يَجْمَعُ اللهُ النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَهْتَمُّونَ لِـذَلِكَ فَيَقُولُونَ: لَوِ اسْتَشْفَعْنَا إِلَى رَبِّنَا حَتَّى يُرِيحَنَا مِنْ مَكَانِنَا هَذَا، قَالَ: فَيَأْتُونَ آدَمَ، ثُمَّ نُوحًا، ثُمَّ إِبْرَاهِيمَ، ثُمَّ مُوسَى، ثُمَّ عِيسَى عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ...وَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُم يَقُـولُ: لَسْـتُ هُنَاكُمْ، قَالَ النَّبِيُّ: فَيَأْتُونِي، فَأَسْتَأْذِنُ رَبِّي فَيُؤْذَنُ لِي﴾...الحديث بتمامه رواه البخاري ومُسْلم، ئەم خەڵکە لە مەیدانی مەحشەر خوای گەورە کۆیان ئەکاتەوە، هەوڵ ئەدەنو ئەڵێن: وا باشە داوای تکا بکەین لە لای خوا، تاکو لەم ڕاوەستانە بمانحەسێنێتەوە. ئینجا ئەچنە لای حەزرەتی باب (آدم)و (نوح)و (إبراهيم)و (موسى)و (عيسى) عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ، تاکو لە لای خوا تکایان بۆ بکەن، جا هەرکەسەیان ئەڵێ: من لەو پلەیە نیم. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئینجا دێنە لای من، منیش ئیزن لە خوا وەرئەگرمو خوا ئیزنم ئەدا. واتە: تکایان بۆ ئەکەمو خوای گەورە تکام وەرئەگرێو دادگای (مَحْشَر) دەست پێئەکا.

ئینجا بزانە: ئەم تکایە پێی ئەگوترێ: (الشَّفاعَة العُظْمَى)، هەم: (الْمَقَامُ الْمَحْمُود)، هەروەك لە باسی (شَفاعَة)دا ڕوونمان کردەوە، بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل١٥٦ ب٢و (فتح الباري) ل٥٢٠ ب١١.

## ﴿ باسی (اَلْعَرْض) بردنە لای خودا بۆ پرسیار (السُّؤال) ﴾

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَى مِنكُمْ خَافِيَـةٌ﴾ الحاقة:١٨، لە ڕۆژی قیامەت ئەهێندرێنە لای خوا بۆ پرسیار لێکردن، هەر کارێکی بە پەنهانیش کردوتانە، لێتان ناشاردرێتەوەو گشتی ئەهێندرێتەوە بەرچاوتان. ئینجا کە ئەم خەڵکە هێندرا مەیدانی مەحشەر، لە بەر دەست خوای گەورە ڕائەگیرێو پرسیاریان لێئەکا، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَلَنَسْأَلَنَّ الَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْأَلَنَّ الْمُرْسَلِينَ﴾ الأعراف:٦، ئێمە پرسیار لەو کەسانە ئەکەین کە پێغەمبەرمان بۆ ناردون، پرسیار لە پێغەمبەرانیش ئەکەین. ﴿عَنْ أَبِـي بَـرْزَةَ الأَسْلَمِيِّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: لَا تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ عُمُـرِهِ: فِـيمَ أَفْنَاهُ؟ وَعَنْ عَمَلِهِ: فِيمَ فَعَلَ؟ وَعَنْ مَالِهِ: مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَ أَنْفَقَهُ؟ وَعَنْ جِسْـمِهِ: فِـيمَ أَبْلَاهُ؟﴾ رواه الترمذي بسند صحيح، قاچەکانی بەندە لە ڕۆژی قیامەت لە شوێن خۆی لاناچێ تا پرسیاری لێئەکرێ: تەمەنی چۆن بردۆتە سەر؟ کردەوەی بۆچی کردوە؟ ماڵی خۆی لە کوێ هێناوەو لە چیی سەرف کردوە؟ لاشەی خۆی لە چی بەکار هێناوە؟.

جا هەرکەسێك وەڵامی ڕاست نەداتەوەو دان نەهێنێ بە کردەوەکانی، ئەوە گشت ئەندامەکانی شاهیدیی لە سەر ئەدەن، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ النور:٢٤، لە ڕۆژی دوایی شاهیدی لە سەر خەڵك ئەدەن: زوبانیانو دەستەکانیانو قاچەکانیان: بەوەی کردوویانە.

## ﴿ باسی دەفتەری کردەوەکان (صُحُفُ الأعْمال) ﴾

لە دوای (العَرْض)=وەستان لە بەر دەست خوای گەورەو پرسیار لێکردن، هەموو کەسێك لە ڕۆژی دوایی دەفتەری کردەوەکانی=(صُحُفُ الأعْمال)-کە لە دونیادا فریشتەکانی ڕاستەو چەپە نووسیبویان- وەرئەگرێتەوەو خوای گەورە فەرمانی پێ ئەکا: ﴿اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا﴾ الإسراء:١٤، دەفتەری کردەوەکانت بخوێنەوە، خودی خۆت بەسە: کە لێکۆڵینەوە لەگەڵ خۆت بکەی. ئینجا بزانە: ئەوەی لە دونیادا خوێندەوار بوبێ، یان خوێندەوار نەبوبێ، دەفتەری کردەوەکانی هەر بە خۆی ئەخوێنێتەوە. (نَثْرُ اللآلي) ل٢٥٦و(تحفة المريد) ل٩٦.

ئینجا ئەم خەڵکە لە وەرگرتنەوەی دەفتەرەکانیان دوو جۆرن: هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا وَيَنْقَلِبُ إِلَى أَهْلِهِ مَسْرُورًا، وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ وَرَاءَ ظَهْرِهِ فَسَوْفَ يَدْعُو ثُبُورًا وَيَصْلَى سَعِيرًا﴾ الإنشقاق:٧-١٢، هەرکەسێك دەفتەری کردەوەکانی بە دەستی ڕاستە بدرێتەوە، ئەمە لێکۆڵینەوەیەکی کەمی لەگەڵ ئەکرێو بە دڵخۆشی ئەچێتە بەهەشت، بەڵام هەرکەسێك لە لای پشتەوەی دەفتەرەکەی بدرێتەوە-یان بە دەستی چەپە وەریبگرێ- ئەوە هاواری قوڕبەسەری ئەکاو، ئەچێتە دۆزەخ.

(الباجوري) ئەفەرموێ: ئیمانداری بێتاوان بە دەستیڕاستەی دەفتەرەکەی وەرئەگرێتەوە، کافریش بە دەستی چەپەی لە لای پشتەوەی وەرئەگرێتەوە. (الماوَرْدي) فەرموویەتی: ئیمانداری تاوانباریش بە دەستی ڕاستەی وەرئەگرێتەوە، هەندێکیش ئەڵێن: هەر خوا ئەزانێ. (تحفة المريد) ل٩٦.

## ﴿ باسی لێکۆڵینەوەی ڕۆژی قیامەت (الحساب) ﴾

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُمْ﴾ الغاشية:٢٥-٢٦، بێگومان گەڕانەوەی ئەم خەڵکە هەر بۆ لای ئێمەیە، ئینجا لێکۆڵینەوەی کردەوەکانیان لە سەر ئێمەیە. ﴿عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَيْسَ أَحَدٌ يُحَاسَبُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلاَّ هَلَكَ. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَلَيْسَ قَدْ قَالَ اللهُ تَعَالَى: (فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ

فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا)؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّمَا ذَلِكَ الْعَرْضُ، وَلَيْسَ أَحَدٌ يُنَاقَشُ الْحِسَابَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلاَّ عُذِّبَ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەرکەسێك لە ڕۆژی قیامەت لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکرێ تووشی سزای دۆزەخ ئەبێ. (عائشة) فەرمووی: ئەدی خوا نەیفەرمووە: هەرکەسێك بە دەستی ڕاستە دەفتەری کردەوەکانی بدرێتەوە لێکۆڵینەوەیەکی کەمی لەگەڵ ئەکرێ؟. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەم لێکۆڵینەوە کەمە تەنها پرسیارکردنە لە کردەوەکان، هەرکەسێك لێکۆڵینەوەی تەواوی لەگەڵ بکرێو چاوپۆشیی لێنەکرێ، ئەوە تووشی سزا ئەبێ. (شرح صحیح مسلم) ل٣٢٦ ب١٠و(فتح الباري) ل٤٩٠ ب١١.

(الباجُوری) ئەفەرموێ: ئەم لێکۆڵینەوەیە لە دوای وەرگرتنەوەی دەفتەری کردەوەکانە، ئیماندارو کافرو جنۆکەو ئادەمیزاد ئەگرێتەوە، تەنها ئەو کەسانە ناگرێتەوە، کە جیا کراونەتەوەو لە حەدیسدا هاتووە: کە بە بێلێکۆڵینەوە ئەچنە بەهەشت. (تحفة المرید) ل٩٢. ئەمەش حەدیسەکەیە: ﴿عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رضي الله عنه: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: وَعَدَنِي رَبِّي أَنْ يُدْخِلَ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعِينَ أَلْفًا لاَ حِسَابَ عَلَيْهِمْ وَلاَ عَذَابَ، مَعَ كُلِّ أَلْفٍ سَبْعُونَ أَلْفًا، وَثَلاثُ حَثَيَاتٍ مِنْ حَثَيَاتِهِ﴾ رواه الترمذی بسند حسن، خوای گەورە وەعدی داومێ: حەفتا هەزار کەس لە ئوممەتم بە بێلێکۆڵینەوەو سزادان بباتە بەهەشت، هەر هەزارێکیش حەفتا هەزار کەسیتری لەگەڵە، هەروەها: وەعدی سێ وەجبەیتریشی پێ داوم بە گۆڵمەکەی خۆی. بڕوانە (فتح الباري) ل٥٠٠و ٥٠٤ ب١١.

## ﴿ باسی تەرازووی ڕۆژی قیامەت (المیزان) ﴾

هەر کاتێك دەفتەری کردەوەکان وەرگیرانەوەو لێکۆڵینەوە تەواو بوو: تەرازوو دائەنرێ، تاکو ئەندازەی کردەوەکان دەرکەوێ، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ الأنبياء:٤٧، ئێمە تەرازووی دادپەروەری دائەنێین لە ڕۆژی قیامەت. ئینجا بزانە: ئەم تەرازووە–وەکو تەرازووی دونیا– دوو لای هەیە، نووسراوی کردەوەکانی پێئەکێشرێ ﴿فَقَدْ جاءَ فِي حَدِيثِ البطاقة الطَّويل: (فَتُوضَعُ السِّجِلاَّتُ فِي كِفَّةٍ وَالْبِطَاقَةُ فِي كِفَّةٍ، فَطَاشَتِ السِّجِلاَّتُ وَثَقُلَتِ الْبِطَاقَةُ)...﴾ رواه أحمد والترمذی بسند حسن، نەوەدو نۆ دەفتەرەکانی خراپە لە ناو لایەکی تەرازوو دائەندرێن، پسوولەکەی (لاإِلَهَ إِلاَّالله)ش لە ناو لایەکیتر دائەندرێ، جا هەموو دەفتەرەکان هەڵئەستنو سووك ئەبن، پسوولەکەش دائەکەوێو گران ئەبێ. بڕوانە (شرح الطحاوية) ل٦٠٩ ب٢و(تحفة المريد) ل٩٦و٩٧.

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَاضِيَةٍ، وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ﴾ القارعة: ٦-٩، لە تەفسیری ئایەتەکان (جابر) لە حەدیسێکدا ئەگێڕێتەوە: تەرازوو لە ڕۆژی قیامەت دائەندرێو چاکەو خراپەی پێئەکێشرێ: جا هەرکەسێك بە قەد دەنکە گلێرەیەك چاکەی گرانتر بێ، ئەچێتە بەهەشت، هەرکەسێکیش بە قەد دەنکە گلێرەیەك خراپەی گرانتر بێ، ئەچێتە دۆزەخ، هەرکەسێکیش چاکەو خراپەی بە ئەندازەی یەکتر بن، ئەوە لە (أعْراف) ئەمێنێتەوە–شوێنێکە لە نێوان بەهەشتو دۆزەخ– واتە: ماوەیەك ئەمێنێتەوە، ئینجا ئەچێتە بەهەشت. بڕوانە تەفسیری ئایەتی ﴿وَعَلَى الأَعْرَافِ رِجَالٌ﴾ الأعراف:٤٦، هەروەها (حُذَيْفَة) ئەفەرموێ: حەزرەتی(جُبْرائيل) بەڕێوەبەری تەرازووە لە ڕۆژی قیامەت. (تَفسيرالقُرْطُبِي) ل٢١١ ب٧و (فتح الباري) ل٦٥٩ ب١٢.

## ﴿ باسی تۆڵە وەرگرتنی ڕۆژی قیامەت (القصاص) ﴾

بزانە: هەرکەسێك لە دونیادا مافی کەسێکی لە سەر بێ: دەربارەی خوێن، یان ئابڕوو، یان ماڵ، یان ئازاردان، وە لە دونیادا ئەم مافەی نەدابێتەوەو خاوەنی مافەکەی ڕازی نەکردبێ، ئەوە لە ڕۆژی قیامەت ئەو مافەی لێوەرئەگیرێتەوە لە تۆڵەی دونیا، بەم شێوەیە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّ الْمُفْلِسَ مِنْ أُمَّتِي مَنْ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِصَلَاةٍ وَصِيَامٍ وَزَكَاةٍ، وَيَأْتِي قَدْ شَتَمَ هَذَا وَقَذَفَ هَذَا وَأَكَلَ مَالَ هَذَا وَضَرَبَ هَذَا، فَيُعْطَى هَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ وَهَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ، فَإِنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ قَبْلَ أَنْ يُقْضَى مَا عَلَيْهِ، أُخِذَ مِنْ خَطَايَاهُمْ فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّارِ﴾ رواهُ مُسْلِم، (مُفْلِسْ) مالوێرانی ڕاستەقینە لە ئوممەتی من ئەو کەسەیە: کە لە ڕۆژی قیامەت دێتە دادگای خودا، نوێژی کردوەو ڕۆژووی گرتوەو زەکاتی داوە، لە هەمان کاتیشدا: جنێوی بە کەسێك داوەو ئابڕووی کەسێکی بردوەو ماڵی کەسێکی خواردوەو خوێنی کەسێکی ڕێشتوەو لە کەسێکی داوە، ئینجا چاکەکانی ئەم تاوانبارە ئەدرێنە ئەم ستەم لێکراوانە، ئینجا ئەگەر چاکەکانی نەمانو مافەکانیشی هەر لەسەر مابون: ئەوە خراپەی خاوەن مافەکان ئەخرێنە سەر خراپەکانی ئەم ستەمکارە، ئینجا فڕێ ئەدەنە ناو دۆزەخ. واتە: چونکە لە ڕاستیدا هەر خۆی ستەمکارەو هەر بە هۆی ستەمکاریەکەی خۆی ئەسوتێ، ئەمە ڕاڕەوی (أهل السنّة)یە. بڕوانە (شرح صحیح مسلم) ل١٢و ١٤ ب١٠.

ئینجا بزانە: لە ڕستەی ﴿ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّارِ﴾ وەها دەرئەکەوێ: کە ئەم تۆڵە وەرگرتنەی مەیدانی (مَحْشَر) جیایە لەگەڵ تۆڵە وەرگرتنی نێوان بەهەشتو دۆزەخ، کە پێغەمبەر ﷺ

ئەفەرموێ: ﴿يَخلُصُ الْمُؤمنُونَ منَ النَّار فَيُحبَسُونَ عَلَى قَنطَرَة بَيْنَ الْجَنَّة وَالنَّار، فَيُقْتَصُّ لبَعْضهمْ منْ بَعْض: مَظالمُ كَانَتْ بَيْنَهُمْ فِي الدُّنْيا، حَتَّى إذا هُذِّبُوا وَنُقُّوا أُذنَ لَهُمْ في دُخُول الْجَنَّة﴾ رواه البخاري، كە ئیمانداران لە پردی دۆزەخ ڕزگار بون، لە سەر پردێكی‌تر لە نێوان بەهەشتو دۆزەخ ڕائەگیرێن، ئینجا تۆڵەیان بۆ لە یەكتری وەرئەگیرێتەوە: هی ئەو ستەمانەی لە دونیادا لە نێوانیاندابوە، ئینجا كە پاك بونەوەو هیچ داوایەكیان لە سەر نەما، ئیزن ئەدرێن بچنە بەهەشت. كەوابو: ئەم پردەش جیایە لەگەڵ پردی دۆزەخ=(الصِّراطْ)، ئەم تۆڵەیەش لەگەڵ تۆڵەی حەدیسەكەی‌تر جیایە، چونكە ئەوان هیچ چاكەیان نامێنێ‌و بە هۆی ستەمەكانیان ئەچنە دۆزەخ، بەڵام ئەمانە لە دۆزەخ ڕزگاربوونەو بۆ بەهەشت ئەڕۆن، كەواتە: بەم تۆڵەیە گشت چاكەكانیان لە دەست ناچێ، بڕوانە (فتح الباری) ل٤٨٦ ب١١.

## ﴿باسی پردی دۆزەخ=(الصِّراطْ)﴾

بزانە: كە قۆناغەكانی (الْمَوْقِفْ)=گۆڕەپانی مەحشەر كۆتایی هاتن، پردێك لە سەر دۆزەخ دائەندرێ، تاكو ئەم خەڵكە بە سەر پردەكەدا ڕابرێ بۆ بەهەشت، ئینجا بەر لە پردەكە تاریكاییەك هەیە: لەوێوە ئیماندارو (مُنافِق) لێك جیا ئەبنەوە، تەنها ئیماندارەكان بە ئەندازەی كردەوە باشەكانیان ڕووناكییان ئەدرێتێ‌و بە سەر پردەكەدا تێئەپەڕن، بڕوانە (فتح الباری) ل٥٥٢ ب١١و(شرح الطحاوية) ل٦٠٥ ب٢.

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَإِنْ مِنْكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَقْضِيًّا، ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا وَنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴾ مريم:٧١-٧٢، هەموو كەسێكتان ئەبێ بە ناو دۆزەخدا ڕابرێ، خوای گەورە بڕیاری دلوەو براوەتەوە، ئینجا ئەوانەی خۆیان لە تاوان پاراستوە ڕزگاریان ئەكەین، ستەمكارەكانیش لە ناو دۆزەخدا ئەهێڵینەوە.

ئیمامی (النواوی) ئەفەرموێ: مەبەست بە چوونە ناو دۆزەخ: تێپەڕبوونە بە سەر پردی دۆزەخدا، كە پردێكە لە سەر دۆزەخ داندراوە، دۆزەخییەكان لێی ئەكەونە خوارەوە، ئەوانی‌تریش ڕزگار ئەبن. (شرح صحیح مسلم) ل٣٩٢ ب٩.

﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ: فِي حَدِيثِهِ الطَّوِيلِ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ...ثُمَّ يُضْرَبُ الْجِسْرُ عَلَى جَهَنَّمَ وَتَحِلُّ الشَّفَاعَةُ، فَيَقُولُونَ: اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ. قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ وَمَا الْجِسْرُ؟ قَالَ: دَحْضٌ مَزِلَّةٌ فِيهِ خَطَاطِيفُ وَكَلاَلِيبُ وَحَسَكٌ، فَيَمُرُّ الْمُؤْمِنُونَ كَطَرْفِ الْعَيْنِ وَكَالْبَرْقِ وَكَالرِّيحِ وَكَالطَّيْرِ وَكَأَجَاوِيدِ الْخَيْلِ وَالرِّكَابِ، فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ، وَمَخْدُوشٌ، وَمَكْدُوسٌ فِي نَارِ جَهَنَّمَ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، ئینجا پرد لە سەر دۆزەخ دائەندرێ‌و

وَالْجَنَّةُ وَالنَّارُ مَخْلُوقَتَانِ لاَ تَفْنَيَانِ أَبَداً وَلاَ تَبِيدَانِ، وَأَنَّ اللهَ تَعالَى خَلَقَ الْجَنَّةَ وَالنَّـارَ قَبْـلَ الْخَلْقِ، وَخَلَقَ لَهُما أَهْلاً:

---

کاتێ شەفاعەت دێو ئەڵێن: خوایە سەلامەت بکە سەلامەت بکە. گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم پردە چىيە؟ فەرمووی: پردێکی لووسەو قاچ لێی ڕائەزەلێ، لەم لاو لەو لا قولابو دڕکی پێوەیە، ئیمانداران بە سەریدا ڕائەبرن: هەندێك وەك بە چاوچوقانێك، وەك بروسك، وەك با، وەك باڵندە، وەك سوار ئەسپی چاك، ئینجا ئەم خەڵكە سێ بەشە: هەیە بە سەلامەتی ڕزگاری ئەبێو هیچ قولابێك نایگرێ. هەیە قولابەکان ئەیگرنو برینداری ئەکەنو بەرێئەدەنو ڕائەبرێ. هەیە بە کۆمەڵ بە سەر یەکدا فڕێئەدرێنە ناو دۆزەخ. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٢٢٢ ب٢.

## ﴿ باسی بەهەشتو دۆزەخ-(اَلْجَنَّةُ وَالنَّارُ)﴾

ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَالْجَنَّةُ) بەهەشت: کە شوێنی پاداشتی ئیماندارانە (وَالنَّارُ) ئاگری دۆزەخ: کە شوێنی سزای کافرو ئیمانداری تاوانبارە (مَخْلُوقَتَان) هەردووکیان ئێستا هەنەو دروستکراون. خوای گەورە دەربارەی بەهەشت ئەفەرموێ: ﴿وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ الحديد:٢١، پێشبڕکێ بکەن بۆ بەهەشتێك کە بەرینیی بە قەد بەرینی ئاسمانو زەمینە، ئامادە کراوە بۆ ئیمانداران. دەربارەی دۆزەخ ئەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾ آل عمران:١٢١، خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن کە بۆ کافران ئامادە کراوە. جا ئەمە بە یەکدەنگی (أهل السنّة)یە، بەڵام (مُعْتَزِلَة) ئەڵێن: بەهەشتو دۆزەخ تا ڕۆژی دوایی دروست ناکرێن. جا ئەم گوتەی ئەوان بەم دوو ئایەتەو بە چەند ئایەتو حەدیسێکیتر پوچەڵ ئەکرێتەوە، چونکە ووشەی (أُعِدَّتْ) ئامادە کراوە، بۆ شتێك بەکار دێ: کە ئێستا هەبێ. بڕوانە (شرح الطحاوية) ل٦١٤و٦١٥ ب٢و(تحفة المريد) ل٩٩.

(لاَ تَفْنَيانِ أَبَداً) هەرگیز بەهەشتو دۆزەخ تێك ناچن (وَلاَ تَبِيدَانِ) لەناو ناچنو هەر ئەمێنن، خوای گەورە لەبارەی هەردووکیان ئەفەرموێ: ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ البيّنة:٦و٨، کافرەکان بە یەکجاری لە دۆزەخدا ئەمێننەوە، ئیماندارەکانیش بە یەکجاری لە بەهەشتدا ئەمێننەوە. ئینجا بزانە: ئیمانداری تاوانبار، کە سزای تاوانەکانی تەواو بوو، یان شەفاعەتی بۆ کرا، لە دۆزەخ دێتە دەرەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ: لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ، وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ ذَرَّةٍ مِنْ إِيمَانٍ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، هەرکەسێك شادەی هێنابێو بە گرانایی زەرڕەیەك باوەڕی لە ناو دڵدا بێ، لە ئاگر دێتە دەرەوە، بڕوانە (شرح الطحاوية) ل٦٢٩ ب٢.

(فَإِنَّ اللهَ تَعالَى خَلَقَ الْجَنَّةَ وَالنَّار قَبْلَ الْخَلْقِ) خوای گەورە بەهەشتو دۆزەخی دروست کردوون پێش دروستکردنی خەڵك (وَخَلَقَ لَهُما أَهْلاً) بۆ بەهەشتو بۆ دۆزەخ خاوەنی

فَمَنْ شاءَ مِنْهُمْ إلى الْجَنَّة فَضْلاً مِنْهُ، وَمَنْ شاءَ مِنْهُمْ إلى النَّار عَدْلاً مِنْهُ، وَكُلٌّ يَعْمَلُ لِما قَدْ فُرِغَ مِنْهُ، وَصائِرٌ إلى ما خُلِقَ لَهُ، وَالْخَيْرُ وَالشَّرُّ مُقَدَّران على الْعِباد.

---

دروست كردون (فَمَنْ شاءَ مِنْهُمْ إلى الْجَنَّة فَضْلاً مِنْهُ) هەر يەكێك كە خواى گەورە حەز بكا: لەم خەڵكە ئەيباتە بەهەشت بە ڕەحمو گەورەيى خۆى (وَمَنْ شاءَ مِنْهُمْ إلى النَّار عَدْلاً مِنْهُ) وە هەر يەكێكيش كە خواى گەورە حەز بكا: لەم خەڵكە ئەيباتە دۆزەخ بە دادپەروەرى خۆى (وَكُلٌّ يَعْمَلُ لِما قَدْ فُرِغَ مِنْهُ) هەركەسێك لە بەهەشتىو لە دۆزەخى كار ئەكا بۆ هێنانەجێى ئەو بڕيارەى لە (أزل)دا بۆى بڕاوەتەوە (وَصائِرٌ إلى ما خُلِقَ لَهُ) ئەچێتە ئەو شوێنەى بۆى دروستكراوە ﴿عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إنَّ اللهَ خَلَقَ لِلْجَنَّةِ أَهْلاً خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِي أَصْلاَبِ آبَائِهِمْ، وَخَلَقَ لِلنَّارِ أَهْلاً خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِي أَصْلاَبِ آبَائِهِمْ﴾ رواهُ مُسْلم، خواى گەورە دانيشتووانى بەهەشتى بۆ بەهەشت دروست كردون هێشتا هەر لە پشتى باوكو باپيرانياندابوون، دانيشتووانى دۆزەخى بۆ دۆزەخ دروست كردون هێشتا هەر لە پشتى باوكو باپيرانياندابوون.

(وَالْخَيْرُ وَالشَّرُّ مُقَدَّرانِ على الْعِباد) چاكەو خراپە ئەندازەى بۆ دانراوە: لە سەر بەندەكان ﴿عَنْ عَبْدِ اللَّه بنِ عَمْرو رضي الله عنهما: فِي حَدِيثِهِ الطَّوِيل: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ...فَإِنَّ صَاحِبَ الْجَنَّةِ يُخْتَمُ لَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَإِنْ عَمِلَ أَيَّ عَمَلٍ، وَإِنَّ صَاحِبَ النَّارِ يُخْتَمُ لَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ وَإِنْ عَمِلَ أَيَّ عَمَلٍ﴾ رواه الترمذي بسند صحيح، بێگومان مرۆڤى بەهەشتى دواكردەوەى بەهەشتيانە ئەبێ، هەرچەند لە پێشدا كردەوەى خراپيشى كردبێ، مرۆڤى دۆزەخى دواكردەوەى دۆزەخيانە ئەبێ، هەرچەند لە پێشدا كردەوەى باشيشى كردبێ.

ئينجا بزانە: بەهەشت لە سەرەوەى هەر حەوت ئاسمانەكانەو لە بن (عَرْش)ى خوايە، خواى گەورە ئەفەرموێ: ﴿عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى عِنْدَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَى﴾ النجم:١٤و١٥، بەهەشت لەلاى (سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى)يە. هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا اللهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِ اللهِ، مَا بَيْنَ الدَّرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللهَ فَاسْأَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الْجَنَّةِ وَأَعْلَى الْجَنَّةِ أُرَاهُ، وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ، وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الْجَنَّةِ﴾ رواه البخاري، لە بەهەشتدا سەد پلە هەيە، خواى گەورە بۆ (مُجاهد)انى ڕێگەى خوا ئامادەى كردون، نێوان هەردوو پلەيەك وەكو نێوان ئاسمانو زەمينە، جا ئەگەر لە خوا پاڕانەوە، داواى (الفِرْدَوْس)ى لێبكەن چونكە (الفِرْدَوْس) لە هەموو بەهەشتەكان گەورەترەو لە سەرەوەى هەموو بەهەشتانەو (عَرْش)ى خوا لە سەرەوەى بەهەشتە، لە (الفِرْدَوْس)دا هەر چوار ڕووبارەكانى بەهەشت هەڵئەقوڵێن. واتە: (عَرْش)ىخوا بانى بەهەشتە.

وَالإستطاعَةُ الَّتي يَجبُ بها الْفعلُ منَ نحْوِ التَّوْفيقِ الَّذي لايَجُوزُ انْ يُوصَفَ الْمَخْلُوقُ بـــه فَهِيَ مَعَ الْفعْلِ،

---

ئینجا بزانه: بەهەشت هەشت دەرگەی هەنە، ئەمە ناوەکانیانە: ﴿بَابُ الصَّـلاةِ، بَـابُ الْجهاد، بَابُ الصَّدَقَة، بَابُ الرَّيَّان للصَّائمينَ، بَابُ الْحَجِّ وَالْعُمْرَة، بَابُ الذِّكْر. بَـابُ الصَّبْر، بَابُ الشُّكْر﴾، بڕوانە (التَّاج الجامع للأُصـول) ل٥ ب٢و (الْحـاوى للفتـاوى) ل١٩٩ ب٢. هەروەها لە قورئانو لە حەدیسدا ئەم ناوانە بۆ بەهەشت هـاتون: ﴿الْجَنَّـــة، جَنَّـــةُ عَدْن، جَنَّةُالْمَأْوَى، الْفرْدَوْس، جَنَّةُالنَّعيمْ، دَارُالْحَمْد، دارُالسَّـــلاَم، دارُالْمُقامَـــة، دارُ الْحَيَوان، الْمَقامُ الأمين، مَقْعَدُ صدْق، قَدَمُ صدْق، عَلِّيين﴾. (حـادىالأرواح لإبـن القـيم) ل٦٥–٧٠و(وَالنَّثر اللآلى) ل٦٩و ٢٤٣و (تحفة المريد) ل٩٩.
هـەروەها بزانـە: شـوێنی دۆزەخ دیـار نـەکراوەو حـەوت نهـۆمی هەنـە، خـوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ، لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ لِكُلِّ بَابٍ مِـــنْهُمْ جُـــزْءٌ مَقْسُـومٌ﴾الحجر:٤٣–٤٤، بێگومان دۆزەخ شوێنی ئامادەکراوی ئەوانە بە تێکڕایی، دۆزەخ حەوت دەرگەی هەنە، هەر دەرگەیەك بەشە تاوانبارێکی بۆ تەرخان کراوە.
ئەمەش نـاوی نهۆمـەکانی دۆزەخـە: ﴿جَهَنَّمُ، لَظَى، الْحُطَمَة، السَّعير، سَقَر، الْجَحـــيمْ، هاوِيَة﴾ ئینجا بزانە: (جَهَنَّمْ) نهۆمی سەرەوەیە، بۆ ئیمانداراني تاوانبار داندراوە، (هَاوِيَة) نهۆمی هەرە خوارەوەیە بۆ مرۆڤی (مُنافق) داندراوە، بڕوانە (تحفةالمريد) ل٩٩.

## ﴿توانینی بەندە دوو بەشە﴾

بزانە: توانینی بەندە دوو بەشە، **یەکەم:** ئەو توانینەی کردەوەی پێئەکا، ئەمەیان لەگەڵ کردارەکەدایە. **دووەم:** ئـەو توانینـەی داوای کـردەوەی پـێ لێئـەکرێ، ئەمـەیان لـە پـێش کردارەکەدایە. دەربارەی توانینی یەکەم، ئیمامی (الطحاوى) ئەفەرموێ:
(وَالإسْتِطاعَةُ) توانینی بەندە (الَّتي يَجِبُ بِهـا الْفِعـلُ) ئـەو جـۆرە توانینـەی کـردەوەی پـێ وەدەست دێ (مِنْ نَحْوِ التَّوْفيق) بەشێکە لەو هێزو ڕێگـە ئاسـانکردنەی خـوای گـەورە لـە بەندەدا دروستی ئەکا بۆ کاری چاکە (الَّذى لايَجُوزُ أنْ يُوصَـفَ الْمَخْلُـوقُ بِـه) ئـەو جـۆرە هێزەی بەندە توانای دروستکردنی نیە (فَهِيَ مَعَ الْفِعْلِ) ئەو توانینـە لەگـەڵ کردەوەدایـە، جا ئەگەر بەندە ویستی چاکە بکـا، خـوای گـەورە توانـای چاکەکردنی ئـەداتێ، ئەگـەر ویستی خراپەیەك بکا، خوای گەورە توانای خراپەکردنی ئەداتێ، کەوابوو: بەندە هـەر بـە خـۆی توانـای چـاکەکردن لـە دەسـت خـۆی ئـەداو سزادانی ئەکەوێتـە سـەر؟ چـونکە توانایەکەی لە خراپـە بـەکار دێنـێ، هـەر لەبـەر ئەوەیـە خـوای گـەورە بـە خراپـە باسـی کافرەکان ئەکاو ئەفەرموێ: ﴿مَا كَانُوا يَسْتَطِيعُونَ السَّمْعَ وَمَا كَانُوا يُبْصِرُونَ﴾ هود:٢٠، توانای گوێ لێبوونیان نـەبو و نەیانئـەبینی. واتـە: مەبەسـت ئـەوە نیـە: ئەنـدامی گـوێو

وأمَّا الإسْتطاعَةُ منْ جهَة الصَّحَّة وَالْوُسْع وَالْتَّمكُّن وَسَلامَة الآلات فَهِيَ قَبْلَ الْفعْل، وبهـا يَتعلَّقُ الْخطابُ وَهُوَ كَما قالَ تَعالَى: [لاَ يُكَلِّفُ اللهُ نفساً إلاَّ وُسْعَها].

---

چاویان نـەبو، بـەڵکو مەبەست ئەوەیـە: هێـزی ڕاستـەقینەی خۆیـان بـۆ گـوێ لێبـوون دیـتن بـەکار نـەهێناوە. بڕوانـە (شـرح رمضـان) ل٢٠١و (شـرح الطحاویـة) ل٦٣٥ ب٢.

دەربارەی توانینی دووەم، ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَأمَّا الإسْتطاعَةُ) بەڵام توانینی بەندە (مِنْ جهَة الصِّحَّة) لـە ڕووی تەندروستیو (وَالْوُسْع) لە ڕووی هەبوونو (وَالْتَّمكُّن) لە ڕووی گونجان (وَسَلامَة الآلاَت) لە ڕووی ساغی ئامێرەکـان (فهـيَ قَبْـلَ الفعْـل) ئـەم توانینـە لـە پـێش کردارداـیـە (وَبهـا يَتعلّـقُ الخطـابُ) فـەرمانو قەدەغەکردنی خوا، پەیوەندی بەم توانینەی دووەمەوە هەیە (وَهُوَ كَما قـالَ تعـالى) ئـەو فـەرمانو قەدەغەکردنـەی وەك خـوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿لاَ يُكَلِّـفُ اللهُ نَفْسـاً إلاَّ وُسْعَها﴾ البقرة:٢٨٦، خوای گەورە داوا لە هیچ کەسێك ناکـا، تـەنها بـە گـوێرەی توانـای خۆی نەبێ. وە هەروەکو خـوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَـنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً﴾ آل عمران:٩٧، خوای گەورە واجبێکی لە سەر خەڵك هەیە: کە حەج کردنی ماڵی خوایە، لە سەر ئەو کەسە واجبە: کـە توانـای ڕێگـەی هـەبێ. واتـە: ئازوقـەو سـواریو...هتـد. کـەوابوو: هەرکەسێك ئـەم جـۆرە توانایـەی نـەبێ، داوالێکردنـی خـوا نایگرێتەوە. بڕوانە (شرح رمضان) ل٢٠٥و (شرح الطحاوية) ل٦٣٣و ٦٣٤ ب٢.

﴿بەندە سەرپشکە لە وەدەستهێنانی کردەوەکانی﴾

بزانە: دەربارەی کردەوەکانی بەندە، دوو کۆمەڵی (أهْل البدْعَة) باوەڕیـان جیایـە لەگـەڵ باوەڕی (أهل السّنّة والجَماعة).

١-( جَبْريَّـة )-( جَهْميَّـة ) ئـەڵێن: بەنـدە هـیچ دەسـەڵاتێکی نیـە: لـە دروسـتکردنو وەدەستهێنانی کردەوەکانی، سەرپشکیش نیە لە کردنو نەکردن، بەڵکو ناچـارەو خـوای گەورە بە ویستی خۆی (إجْبار)=زۆری لێئەکا: لە هەموو کردەوەکانیدا.

٢-( مُعْتَزلَة ) ئەڵێن: بەنـدە بـە خـۆی کردەوەکـانی خـۆی لـە نەبوونـەوە دروسـت ئـەکاو وەدەستیان دێنێ، واتە: خوای گەورە کردەوەکانی بەندە دروسـت ناکـا، بـەڵکو هێزێکـی داوەتە بەندە تاکو کردەوەی پێ دروست بکا.

٣-( أهل السّنّة والجَماعة ) ئەفەرموون: کردەوەکانی بەندە، گشتی (خَلْق)=دروسـتکراوی خوایەو (كَسْب)=وەدەستهێنراوی بەندەیە، واتە: خوای گەورە لـە نەبوونـەوە کردەوەکـە دروسـت ئـەکا، بەنـدەش وەدەسـتی دێنـێ بـەو هێـزەی خـوا تێیدا دروسـت ئـەکا، لـەم وەدەستهێنانەدا بەندە سەرپشکەو خوا زۆری لێناکـا، بڕوانـە (فـتح البـاري) ل٦٠١ ب١٢و (تحفة المريد) ل٥٦.

ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ: .

(وَأَفْعالُ العِبادِ) کردەوەکانی بەندە–چاکەو خراپە– (خَلْقٌ لِلّهِ) دروستکراوی خوایە، واتە: خوا لە نەبوونەوە ئەو کردەوانە دروست ئەکا، هەروەك ئەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ﴾ الصافات:٩٦، خوای گەورە ئێوەو کردەوەکانی ئێوەی دروست کردوە.

(وَكَسْبٌ مِنَ العِبادِ) هەر هەمان کردەوەش (كَسْب)=وەدەستهێنراوی بەندەیە، واتە: بەندە وەدەستی دێنێ بەو هێزەی خوا تێیدا دروست ئەکا، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ﴾ البقرة:٢٨٦، پاداشی وەدەستهێنانی چاکە بۆ خۆیەتی‌و سزای وەدەستهێنانی خراپە لە سەر خۆیەتی. کەواتە: بەندە لە کردن‌و نەکردنی چاکەو خراپە سەرپشکە، ئەم سەرپشکی‌یە پێی ئەگوترێ: (إِخْتِيار)، واتە: سەربەخۆیی‌و زۆر لێنەکردن.

**ڕوونکردنەوە:** ئاشکرایە: ئەگەر کەسێك لە سەربان بکەوێتە خوارەوە، ئەوە دیارە: هیچ بە ویست‌و دەسەلاتی خۆی نیەو گشتی لە دەست خوای گەورەدایە، بەلام ئەگەر بەخۆی خۆی فڕێبداتە خوارەوە، ئەوە دیارە: لەم کارەدا سەربەخۆیەو بە ویست‌و دەسەلاتی خۆی، خۆی فڕێداوە، کەوابوو: لەم دوو بەشەدا بۆمان دەر کەوت: کە خوای گەورە ویست‌و توانایەکی لە بەندەدا دروست کردوە بۆ وەدەستهێنانی کردەوەکانی، هەروەها بەندەی خۆی کردۆتە سەرپشك بۆ کردن‌و نەکردنی چاکەو خراپە، جا ئەم سەرپشکی‌یە پێی ئەگوترێ: (إِخْتِيار)، واتە: سەربەخۆیی‌و زۆر لێنەکردن، ئینجا ئەگەر بەندە بە ویستی خۆی ئەم هێزەی لە وەدەستهێنانی چاکە بەکار هێنا، خوای گەورە چاکەکە دروست ئەکاو پاداشتی ئەداتێ، وە ئەگەر لە وەدەستهێنانی خراپەی بەکار هێنا، خوای گەورە خراپەکە دروست ئەکاو سزای ئەدا، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ نَارًا﴾ الكهف:٢٩، هەرکەسێك حەز ئەکا: با ئیمان بێنێ‌و، هەرکەسێك حەز ئەکا: با کافر بێ، ئێمە ئامادەمان کردوە بۆ کافرەکان ئاگری دۆزەخ.

کەوابوو: گشت کردەوەیەکی بەندە لە دوو لاوە تەماشای ئەکرێ، یەکەم: لەلای خواوە بە (خَلْقُ اللهِ)=دروستکراوی خوا ناوئەبرێ‌و بەندە دەسەلاتی دروستکردنی نیە. دووەم: لەلای بەندەوە بە (كَسْبُ العَبْدِ) ناو ئەبرێ، واتە: وەدەستهێنراوی بەندە، لەم وەدەستهێنانەدا خوای گەورە بەندەی خۆی کردۆتە سەرپشك بۆ کردن‌و نەکردن.

## ﴿داوالیکردنی خوا بە گوێرەی توانای بەندەکانە﴾

ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَلَمْ يُكَلِّفْهُمُ اللهُ تَعالَى) خوای گەورە داوای لە بەندەکانی خۆی نەکردوە (إلاَّ مَا يُطيقُونَ) تەنها ئەو داوایە نەبێ: کە توانای جێبەجێ‌کردنیان هەیە، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ:

وَلاَ يُطِيقُونَ إلاّ مَا كَلَّفَهُمْ، وَهُوَ تَفْسِيرُ (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ)، نَقُولُ: لاَ حِيلَةَ لأحَد وَلاَ حَرَكَةَ لأحَد وَلاَ تَحَوُّلَ لأحَد عَنْ مَعْصِيَةِ اللهِ إلاَّ بمَعُونَةِ اللهِ، وَلاَ قُوَّةَ لأحَد عَلَى إقَامَةِ طَاعَةِ اللهِ وَالثَّبَاتِ عَلَيْهَا إلاَّ بتَوْفِيقِ اللهِ. وَكُلُّ شَيْءٍ يَجْرِي بمَشِيئَةِ اللهِ تَعَالَى وَعِلْمِهِ وَقَضَائِهِ وَقَدَرِهِ، غَلَبَتْ مَشِيئَتُهُ الْمَشِيئَاتِ كُلَّهَا،

---

﴿لاَ يُكَلِّفُ اللهُ نَفْساً إلاَّ وُسْعَهَا﴾ البقرة:٢٨٦، خوای گەورە داوا لە هیچ کەسێك ناکا، تەنها بە گوێرەی توانای ئەو کەسە نەبێ. ئینجا بزانە: مەبەست بە داوالێکردنی خوا: فەرمانکردن‌و قەدەغەکردنی خولیە (وَلاَ يُطِيقُونَ إلاَّ مَا كَلَّفَهُمْ) بەندەکانیش تەنها ئەوەندە توانایەیان هەیە: کە خوا تێیانیدا دروست کردوەو بەشێکە لە ڕێگەی ئاسانکردن (وهُو) توانین بە واتەی ڕێگە ئاسانکردن (تَفْسِيرُ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ) راڤەی ئەم ڕستە پیرۆزەیە (نَقُولُ) ئێمە ئەڵێین: واتەی (لاَ حَوْلَ) ئەمەیە: (لاَ حِيلَةَ لأحَدٍ وَلاَ حَرَكَةَ لأحَدٍ وَلاَ تَحَوُّلَ لأحَدٍ عَنْ مَعْصِيَةِ اللهِ إلاَّ بمَعُونَةِ اللهِ) هیچ کەسێك هیچ فێڵێك‌و هیچ لادان‌و هیچ جولانی نیە: کە خۆی لە گوناه لابدا تەنها بە یارمەتی‌و ڕزگارکردنی خوا نەبێ، هەروەها لە واتەی (وَلاَ قُوَّةَ) ئەڵێین: (وَلاَ قُوَّةَ لأحَدٍ عَلَى إقَامَةِ طَاعَةِ اللهِ وَالثَّبَاتِ عَلَيْهَا إلاَّ بتَوْفِيقِ اللهِ تَعَالَى) هیچ کەسێك هیچ هێزێکی نیە: لە سەر ئەنجامدانی خوا پەرستی‌و مانەوە لە سەر خوا پەرستی، تەنها بە ڕێگە ئاسانکردنی خوا نەبێ.

ئینجا بزانە: ئەمەی ڕابردوو، دەربارەی ئەو توانینە بوو: کە کردەوەی پێ ئەکرێ‌و بەشێکە لە ڕێگە ئاسانکردن، واتە: بە گوێرەی ئەم توانینە خوای گەورە داوا لە مرۆڤ ئەکا، بەڵام ئەگەر لە ڕووی تەندروستی‌و ساغی ئەندام‌و ئامێر تەماشای توانین بکەین، ئەوە فەرمان‌و قەدەغەکردنی خوا گشت کەسێك ئەگرێتەوە، چونکە بەندە زیاتر لە داوالێکردنی خوا، توانای کردنی فەرمان پێکراو و نەکردنی قەدەغەکراوی هەیە، بەڵام کە خوای گەورە داوای زیاتری نەکردوە، مەبەستی بارسووکی‌و ئاسانکردنی ئایینە، هەروەك ئەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ اللهُ أنْ يُخَفِّفَ عَنْكُمْ﴾ النساء:٢٨، خوای گەورە ئەیەوێ بارتان سووك بکا. بڕوانە (شرح الطحاوية) ل٦٥٥و٦٥٦ ب٢.

(وَكُلُّ شَيْءٍ يَجْرِي بمَشِيئَةِ اللهِ تَعَالَى) هەر شتێکی ببێ، بە گوێرەی حەزکردنی خوای گەورە ئەبێ (وَعِلْمِهِ) بە گوێرەی زانستی خوا ئەبێ (وَقَضَائِهِ وَقَدَرِهِ) بە گوێرەی قەزاو قەدەری خوا ئەبێ، هەروەك پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿كُلُّ شَيْءٍ بِقَدَرٍ حَتَّى الْعَجْزُ وَالْكَيْسُ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، هەموو شتێك بە بڕیارو ئەندازە دلنانی خوایە، تا تەمبەڵی‌و گێلی‌و چوستی‌و چالاکیش. (غَلَبَتْ مَشِيئَتُهُ الْمَشِيئَاتِ كُلَّهَا) حەزکردنی خوا، زاڵ بوە بەسەر هەموو حەزکردنێکدا، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تَشَاءُونَ إلاَّ أنْ يَشَاءَ اللهُ﴾ الإنسان:٣٠، ئێوە هیچ شتێك حەز ناکەن، تەنها ئەو شتە نەبێ: کە خوا حەز بکا.

وَغَلَبَ قَضَاتُهُ الْحِيَلَ كُلَّهَا، يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ وَهُوَ غَيْرُ ظَالِم أبداً تقدّس عَنْ كُلّ سُوء وحَيْن، وَتَنَزَّهَ عَنْ كُلّ عَيْبٍ وَشَيْنٍ [لاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ]. وَفِي دُعَاءِ الأحْيَاءِ وَصَدَقَاتِهِمْ مَنْفَعَةٌ للأمْوَاتِ.

---

(وَغَلَبَ قَضَائُهُ الْحِيَلَ كُلَّهَا) قەزاو قەدەری خوا زاڵ بوە بە سەر هەموو فێڵێکدا (يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ) هەرچی حەز بکا ئەیکا (وَهُوَ غَيْرُ ظَالِم أبَداً) خوای گەورە هیچ کاتێك ستەمکار نیە، هەروەك ئەفەرموێ: ﴿وَلاَ يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾ الكهف:٤٩، خوای تۆ ستەم لە هیچ کەس ناکا.
هەروەها پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿لَوْ أَنَّ اللهَ تَعالَى عَذَّبَ أَهْلَ سَمَاوَاتِه وَأَهْلَ أَرْضِه لَكان غَيْرَ ظَالِمٍ لَهُمْ، وَلَوْ رَحِمَهُمْ لَكَانَتْ رَحْمَتُهُ إيَّاهُمْ خَيْرًا لَهُمْ مِنْ أَعْمَالِهِمْ﴾ حديث حسن رواه أبوداود، ئەگەر خوای گەورە دانیشتووانی ئاسمانەکانیو زەمینەکەی سزا بدا، ستەمکار نیە لێیان، وە ئەگەر رەحمیان پێبکا، رەحم پێکردنی باشترە بۆ ئەوان لە کردەوەکانیان.
کەوابوو: خوای گەورە بە ویستی خۆی دەستکاری دروستکراوی خۆی ئەکاو هیچ کەس مافی رەخنە گرتنی نیە ﴿لاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ﴾ الأنبياء:٢٣، لەو کارەی خوا ئەیکا، پرسیاری لێناکرێ: بۆ وات کرد؟ بەڵام بەندەکان پرسیاریان لێئەکرێ. کەواتە: ئەگەر خەڵك دوستێکی گوێڕایەڵی خۆی سزا بدا، ئەوە بە ستەمکار دائەنرێ؟ چونکە لە ڕاستیدا خاوەنی وی نیە، بەڵام ئەگەر خوای گەورە بەندەیەکی خواپەرست سزا بدا، بە ستەمکار دانانرێ؟ چونکە هەر خۆی خاوەنی بەندەکەیە، بڕوانە (فَتحُ البارى) ل٥٥١ ب١٣.

## ﴿ باسی دوعاکردنو خێرکردن بۆ مردوو ﴾

ئیمامی (الطحاوى) ئەفەرموێ:
(وَفِي دُعَاءِ الأحْيَاءِ) لە دوعاکردنی زیندوواندا، هەم (وَصَدَقَاتِهِمْ) لە خێرکردنی زیندوواندا (مَنْفَعَةٌ لِلأمْوَاتِ) سوود هەیە بۆ مردووان، واتە: ئەگەر زیندوو دوعا، یان خێر بۆ مردوو بکا، سوودی پێ ئەگاو پلەی بەرز ئەبێو تاوانی پێ لە سەر لائەچێو سزا نادرێ، بگەڕێوە باسی (تۆبە). ئیمامی (النواوى)و (إبن أبىالعز) فەرموویانە: زانایانی (أهل السنّة) یەکدەنگن: کە دوعاکردن بۆ مردوو، خێرکردن بۆ مردوو، حەج کردن بۆ مردوو، ئەیگاتێو سوودی لێوەرئەگرێ، بەڵام دەربارەی ئەو خواپەرستیانەی بە لاشەیە: وەکو ڕۆژوو و نوێژو قورئان خوێندنو...هتد، لە ڕاڕەوی ئاشکرای ئیمامی (شافعی)و ئیمامی (مالك)دا: ناگاتە مردوو و سوودی لێوەرناگرێو لە ڕاڕەوی ئیمامی (حَنَفی)و ئیمامی (أحمد)و کۆمەڵێك لە زانایانی (سَلَفْ) دا ئەیگاتێو سوودی لێوەرئەگرێ. بڕوانە (شرح صحیح مسلم) ل١١٩ب١ و(شرح الطحاوية) ل٦٦٤ب٢.
١- دەربارەی دوعاکردن خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلإخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بالإيْمَانِ﴾ الحشر:١٠، ئەو موسوڵمانانەی لە دوای

ئەوان هاتون، ئەڵێن: خوایە لە ئێمە خۆش بەو لەو برایانەی ئێمەش خۆش بە: کە پێش ئێمە کەوتون بە ئیمانەوە. واتە: دوعاکردن ڕەوایە، چونکە خوای گەورە مەدحی ئیماندارانی پێکردوە، کەوابوو: جیاوازی خزمو بێگانە نیە، چونکە دەربارەی خزم پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إذَا مَاتَ ابنُ آدَمَ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إلاَّ مِنْ ثَلاَثٍ: صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَــهُ﴾ رواهُ مُسْلِم، هەر کاتێك ئادەمیزاد مرد، پاداشتی کردەوەی خۆی ئەبڕێتەوە، تەنها لە سێ کردەوەی نەبێ: خێرێکی نەبڕاوە، یان زانستێکی سوودبەخش، یان منداڵێکی باش کە دوعای بۆ بکا. هەم دەربارەی بێگانە پێغەمبەرﷺ کاتێ مردووی ئەناشت، لە سەر گۆڕەکەی ئەوەستاو ئەیفەرموو: ﴿إسْتَغْفِرُوا لأخِيكُمْ وَاسْأَلُوا لَهُ التَّثْبِيتَ، فَإنَّهُ الآنَ يُسْأَلُ﴾ رواه أبوداود بسند قويّ، داوا لە خوا بکەن لەم برایەتان خۆش بێو دوعای بۆ بکەن: وەڵامی فریشتەکان بداتەوە، چونکە ئێستا پرسیاری لێئەکرێ.

٢- دەربارەی خێرکردن بۆ مردوو، پیاوێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ، گوتی: ﴿يَا رَسُولَ اللهِ إنَّ أُمِّي افْتُلِتَتْ نَفْسُهَا، وَلَمْ تُوصِ، وَأظُنُّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ تَصَدَّقَتْ، أفَلَهَا أجْرٌ إنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، ئەی پێغەمبەری خوا، دایکم کتوپڕ مردوەو وەسێتی نەکردوە، وا تێئەگەم: ئەگەر فریاکەوتبا خێرێکی ئەکرد، ئایا ئەگەر من خێری بۆ بکەم خێرەکەی ئەگاتێ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ. واتە: ئەیگاتێ.

ئیمامی (النواوی) ئەفەرموێ: موسوڵمانان یەکدەنگن: کە لە سەر میراتگر واجب نیە خێر بۆ مردووەکەی بکا، بەڵکو سوننەتە، بەڵام ئەو مافانەی لە سەر مردووەکەنو مافێکی ماڵین: وەکو قەرزی ئادەمیزادانو قەرزی خوا: وەکو زەکاتو حەجو نەزرو کەففارەتو فیدیەی ڕۆژوو، ئەوانە گشتی واجبە لە میراتی مردووەکە بدرێنەوە، جا ئەگەر مردووەکە میراتی لە پاش بەجێنەمابو: ئەوە لە سەر میراتگر واجب نیە بۆی بداتەوە، بەڵکو سوننەتە: میراتگرەکە، یان کەسێکیتر بۆی بداتەوە. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٨٩ ب٧ و(تحفة المحتاج) ل٧٢ ب٧.

## ﴿ باسی دوعاکردن ﴾

ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَاللهُ تَعَالَى يَستَجِيبُ الدَّعَوَاتِ) خوای گەورە دوعا قبوڵ ئەکا (وَيَقْضِي الْحَاجَاتِ) پێویستیەکانی خەڵك پێك ئێنێ، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَإذَا سَألَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إذَا دَعَانِ﴾ البقرة:١٨٦، هەر کاتێك بەندەکانی من دەربارەی من پرسیاریان لێکردی؟ پێیان بڵێ: من لێیان نزیکم دوعای دوعاچی وەرئەگرم هەر کاتێك لێم بپاڕێتەوە.

وَيَمْلِكُ كُلَّ شَيْءٍ وَلاَ يَمْلِكُهُ شَيْءٌ، وَلاَ غِنَى عَنِ اللهِ تَعَالَى طَرْفَةَ عَيْنٍ، وَمَنِ اسْتَغْنَى عَنِ اللهِ طَرْفَةَ عَيْنٍ فَقَدْ كَفَرَ وَصَارَ مِنْ أَهْلِ الْحَيْنِ، وَاللهُ يَغْضَبُ وَيَرْضَى، لاَ كَأَحَدٍ مِنَ الْوَرَى. وَنُحِبُّ أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَلاَنُفْرِطُ فِي حُبِّ أَحَدٍ مِنْهُمْ، وَلاَ نَتَبَرَّأُ مِنْ أَحَدٍ مِنْهُمْ.

---

هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَدْعُو بِدَعْوَةٍ لَيْسَ فِيهَا إِثْمٌ وَلاَ قَطِيعَةُ رَحِمٍ إِلاَّ أَعْطَاهُ اللهُ بِهَا إِحْدَى ثَلاَثِ خِصَالٍ: إِمَّا أَنْ يُعَجِّلَ لَهُ دَعْوَتَهُ، أَوْ يَدَّخِرَ لَهُ مِنَ الْخَيْرِ مِثْلَهَا، أَوْ يَصْرِفَ عَنْهُ مِنَ الشَّرِّ مِثْلَهَا﴾ رواه أحمد بسند صحيح، هەر مرۆڤێك لە خوا بپاڕێتەوەو داوای شتێکی لێبکا، داوایەکەشی گوناهکاریو بێڕەحمی تێدا نەبێ، خوای گەورە دوعایەکەی قبوڵ ئەکا بە یەکێك لەم سێ شێوەیە: یان خودی داواکراوەکەی ئەداتێ لە دونیادا، یان بە وێنەی داواکراوەکەی چاکەی ئەداتێ لە قیامەتدا، یان بە ئەندازەی داواکراوەکەی خراپەی لە سەر لائەدا.

(وَيَمْلِكُ كُلَّ شَيْءٍ) خوای گەورە خاوەنی هەموو شتێکەو دەسەڵاتی بە سەردا هەیە (وَلاَ يَمْلِكُهُ شَيْءٌ) هیچ شتێك دەسەڵاتی بە سەر خوادا نیە (وَلاَ غِنَى عَنِ اللهِ تَعَالَى طَرْفَةَ عَيْنٍ) چاوچوقانێکیش دەوڵەمەندی لە خوا نیە، واتە: هەموو کات پێویستی بە خوا هەیە (وَمَنِ اسْتَغْنَى عَنِ اللهِ طَرْفَةَ عَيْنٍ) هەرکەسێك بڵێ، یان باوەڕی وابێ: کە پێویستی بە خوا نیە، هەرچەند ماوەی چاوچوقانێکیش بێ (فَقَدْ كَفَرَ) ئەوە کافر ئەبێ (وَصَارَ مِنْ أَهْلِ الْحَيْنِ) ئەچێتە گەڵ چینی ماڵوێرانان (وَاللهُ يَغْضَبُ) خوای گەورە توڕە ئەبێ (وَيَرْضَى) ڕازی ئەبێ (لاَ كَأَحَدٍ مِنَ الْوَرَى) ئەم توڕەبوونو ڕازیبوونەی خودا وەکو توڕەبوونو ڕازیبوونی خەڵك نیە، چونکە (بُغْض) توڕەبوونو (رِضَى) ڕازیبوون هەردووکیان سیفەتی خوای گەورەنە، کەوابوو: وەکو سیفەتەکانی خەڵك نینە، بڕوانە (شرح الطحاوية) ل٦٨٥ ب٢.

## ﴿ باسی سەحابەکانی پێغەمبەر ﷺ ﴾

**پێناسە:** (صَحابِی)=سەحابە: ئەو موسوڵمانەیە: لە کاتی موسوڵمانەتیدا پێغەمبەری ﷺ لە کاتی پێغەمبەرایەتیدا بە زیندوویی دیتبێ، یان پێغەمبەر ﷺ ئەوی دیتبێو بە موسوڵمانیش مردبێ، جا ئادەمیزاد بێ، یان فریشتە بێ، یان جنۆکە بێ. بڕوانە (فتح المبين) ل١٧٩.

ئیمام (إبن الصلاح) ئەفەرموێ: کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، ژمارەی سەحابەکان (١٢٤٠٠٠) سەدو بیستو چوار هەزار سەحابە بوو. بڕوانە (مُقَدِّمَة عُلُوم الْحَدِيث) ل١٤٩ و(نَثْر اللآلي) ل١٤٩.

ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(وَنُحِبُّ أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ ﷺ) ئێمەی (أهل السُّنَّة) گشت سەحابەی پێغەمبەرمان ﷺ خۆش ئەوێ (وَلاَ نُفْرِطُ فِي حُبِّ أَحَدٍ مِنْهُمْ) لە خۆشویستنی هیچ سەحابەیەك لە سنوور دەرناچین هەروەکو (شيعَة) لە خۆشویستنی ئیمامی (عَلي)و (حسن)و (حسين)دا، لە سنوور دەرچوون (وَلاَ نَتَبَرَّأُ مِنْ أَحَدٍ مِنْهُمْ) دژایەتی هیچ سەحابەیەك ناکەین.

﴿ئاگاداری﴾: (شيعة) دژايەتی ئيمامی (أبوبكر)و ئيمامی (عُمَر)و ئيمامی (عُثمان)و زۆربەی سەحابەكان ئەكەن(١٧)، بەلام ئيمەی (أهل السنّة) گشتيان بە دۆستی خۆمان ئەزانين، چونكە خوای گەورە –بە بێ‌جياوازی– لە هەموويان ڕازی بووەو وەعدەی پاداشتی بەهەشتی پێ‌داون، هەروەك ئەفەرموێ: ﴿وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ التوبة:١٠٠، واتە: سەحابە پێشينەكانی يەكەم لە كۆچكەرەكان‌و يارمەتيدەران‌و ئەوانەی شوێن ئەوانيش كەوتون بە چاكە، خوای گەورە لێيان ڕازی بووە، ئەوانيش لە خوا ڕازی بونە، خوا بۆ ئەوانی ئامادە كردوە چەند بەهەشتێكی وەها: كە ڕووباری لە ژێر ئەڕوا‌و بە يەكجاری تێيدا ئەمێننەوە، ئەمە سەرفرازی‌يەكی گەورەيە.

(وَنُبْغِضُ مَنْ يُبْغِضُهُمْ) ئيمەی (أهل السنّة) ڕقمان لەو كەسەيە: كە ڕقی لە سەحابەكان دێ‌و (وبِغَيْرِ الْخَيْرِ يَذْكُرُهُمْ) وە بە خراپە باسيان ئەكا، چونكە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿لاَ تَسُبُّوا أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِي فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَوْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلاَ نَصِيفَهُ﴾ رواهُ البخاري ومُسلِم، جنێو بە هيچ سەحابەيەكی من مەدەن، چونكە هەر يەكێكتان ئەگەر بە وێنەی كێوی (أُحُد) زێڕ ببەخشێ، هێشتا ناگاتە خێری مستێكی ئەوان‌و نيو مستی ئەوانيش. واتە: چونكە ئەوان لە كاتی تەنگانەو پێويستی‌دا بۆ بنياتنانی ئەم ئايينە پيرۆزە گيان‌و ماڵيان بەخشيوەو بە گيان‌و ماڵ يارمەتی پێغەمبەريانﷺ داوە، كەوابوو: جارێكی‌تر ئەم سەربەرزی‌يە بە دەست كەسی‌تر ناكەوێ.
بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٤٢٧ ب٩.

(١٧)- (شيعة) زۆرترين‌و بەهێزترينی ئەو گرۆهانەن: كە لەگەڵ (أهل السنّة والجماعة)دا ڕووبەڕوو ئەبنەوەو لە زۆربەی باسەكانی (عقيدة)و لقەكانی ئايينداً لەگەڵ (أهل السنّة والجماعة) جياوازن، دروشمی بەرگری‌كردن لە (أهلُ البيْت)، واتە: خزمەكانی پێغەمبەرﷺ بەرز ئەكەنەوە.
مێژوونووسانی ئيسلام ئەڵێن: دامەزرێنەری بنچينەی (شيعة) پياوێكی جولەكە بوو: ناوی (عَبْدُالله بن سَبأ)ی خەڵكی (يمن) بوو، بە فێڵ ئيسلامەتی خۆی ئاشكرا كردو بانگەوازی‌ی بۆ زێدەڕۆيی لە ئيمامی (علي)دا دەكرد، تاكو پەرتەوازە بخاتە ناو ئوممەتی ئيسلام، بەلام (شيعة) دان بەم ڕاستی‌يەدا نانێن، هەروەك (مُرْتَضَى العَسْكَرِي)–كە زانايەكی(شيعة)يە– لە لاپەڕە ٣٢و٤٥ ب١ی كتێبی (عَبْدُالله بن سَبأ)دا گێڕاويەتيەوەو لەمەودواش ڕەددی كردۆتەوە.
ئينجا بزانە: (شيعة) لە ناو خۆياندا زۆربەشن، بەشە هەرە زۆرەكانيان باوەڕيان نيە بە (الخُلَفاء الرَّاشِدين) واتە: ئيمامی (أبوبكر)و ئيمامی (عُمَر)و ئيمامی (عُثمان)، ئەڵێن: لە ڕاستی‌دا ئيمامی (علي) جێنيشين–(خليفة)ی پێغەمبەرﷺ بوو، بەلام ئەم سێيانە (خلافة)يان لێ‌زەوت كرد، هەروەها ئەگەر حەديسێك لە ڕێگەی (أهلُ البيْت)ەوە نەهاتبێ باوەڕی پێ‌ناكەن: كەواتە: باوەڕيان بە كتێبی حەديسی (أهل السنّة) نيەو نوێژی نيوەڕۆو عەسر بە يەكەوە ئەكەن‌و نوێژی مەغريب‌و عيشا بە يەكەوە ئەكەن هەرچەند لە سەفەريش نەبن، هەروەها باوەڕيان بە (إجْماع) يەكدەنگی (أهل السنّة) نيە، ئينجا بۆ شارەزابوون لە مەزهەب‌و عەقيدەی (شيعة) بڕوانە (معالمُ المدرستَيْن) دانراوی (مُرْتَضَى العَسْكَرِي)، يان هەر كتێبێكی‌تری (شيعة)، ڕوونكەرەوە.

وَلاَ نَذْكُرُهُمْ إلاَّ بِخَيْرٍ، وَحُبُّهُمْ دِينٌ وَإِيمَانٌ وَإِحْسَانٌ، وَبُغْضُهُمْ كُفْرٌ وَنِفَاقٌ وطُغْيَانٌ. وَنُثْبِتُ الْخِلاَفَةَ بَعْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ: أَوَّلاً لأبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ تَفْضِيلاً لَهُ وَتَقْدِيمًا عَلَى جَمِيعِ الأُمَّةِ، ثُمَّ لِعُمَرَ بنِ الْخَطَّابِ ﷺ،

---

(وَلاَ نَذْكُرُهُمْ إلاَّ بِخَيْرٍ) تەنها بە چاکە نەبێ، باسی سەحابەکان ناکەین‌و بێدەنگ نەبین لەو جەنگو ناکۆکی‌یەی لە نێوانیاندا ڕووی دلوە، چونکە هەموویان دادپەروەرن‌و بە هۆی (إجتهاد) ئەم جەنگە ڕووی داوە، بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٢٥٠ ب٩.

(وَحُبُّهُمْ دِينٌ وَإِيمَانٌ وَإِحْسَانٌ) خۆشویستنی سەحابەکان، نیشانەی ئایین‌و ئیمانی تەواو و چاکەیە (وَبُغْضُهُمْ كُفْرٌ وَنِفَاقٌ وَطُغْيَانٌ) ڕق لێبوونەوەی سەحابەکان نیشانەی (کفر)و (نفاق)و لە سنوور دەرچوونە، هەروەك پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿آيَةُ الإِيمَانِ حُبُّ الأَنْصَارِ، وَآيَةُ النِّفَاقِ بُغْضُ الأَنْصَارِ﴾ رواهُ البخاري ومُسْلِم، نیشانەی ئیمانی تەواو: خۆشویستنی سەحابەکانی یارمەتیدەرە، نیشانەی (نفاق)و دڵپیسی: ڕق لێهاتنی سەحابەکانی یارمەتیدەرە. واتە: چونکە ئەوان لە (مَدِينَة) جێگەی پێغەمبەر ﷺ سەحابە کۆچکەرەکانیان کردۆتەوەو خۆیان کردۆتە گیانفیدای ئەم ئایینەو ماڵی خۆیان لەگەڵ کۆچکەران بەش کرد، ئەم کردەوانەی ئەوان بووە هۆی ئاشکرابوونی ئیسلام، کەوابوو: تەنها ئیماندار بەسەرکەوتنی ئیسلام دڵخۆش ئەبێ، (مُنافق)ش دڵتەنگ ئەبێ. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٣٨٨ ب١.

## ﴿ باسی هەر چوار خەلیفەکانی پێغەمبەر ﷺ =( الخُلَفاء الرَّاشِدِين )﴾

دەربارەی (خَلِيفَة)ی یەکەم ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(وَنُثْبِتُ الْخِلاَفَةَ بَعْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ) ئێمەی (أهل السُّنَّة) باوەڕمان هەیە: بە (خِلاَفَة)= جێنشینی پێغەمبەر ﷺ لە دوای وەفاتکردنی (أَوَّلاً لأَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ) کە یەکەمین (خَلِيفَة) جێنیشی پێغەمبەر ﷺ (أبُوبَكر الصِّدِّيق) بوو (تَفْضِيلاً لَهُ) چونکە حەزرەتی (أبُوبَكر) گەورەترەو (وَتَقْدِيمًا عَلَى جَمِيعِ الأُمَّةِ) لە پێشترە بۆ جێنشینی پێغەمبەر ﷺ لە هەموو ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ، ئیمامی (النواوي) ئەفەرموێ: (أهل السُّنَّة) یەکدەنگن: کە حەزرەتی (أبُوبَكر) لە هەموو سەحابەکان گەورەترە. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٢٤٨ ب٩ و(نَثْرُ اللآلي) ل١٤٩.

ئینجا بزانە: ئیمامی (أبُوبَكر) لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ هەڵبژاردرا بە (خَلِيفَة) جێنیشی پێغەمبەر ﷺ ماوەی دوو ساڵو سێ مانگو بیست ڕۆژ فەرمانڕەوایی موسوڵمانانی کرد، ئینجا لە تەمەنی (٦٣) ساڵیدا، لە ساڵی (١٣)ی کۆچیدا، وەفاتی کرد، لە تەنیشت پێغەمبەر ﷺ نێژرا، بڕوانە (نَثْرُ اللآلي) ل١٥٦و١٥٧.

دەربارەی (خَلِيفَة)ی دووەم ئەفەرموێ: (ثُمَّ لِعُمَرَ بنِ الْخَطَّابِ ﷺ) ئینجا لە دوای ئیمامی (أبُوبَكر)، دووەمین (خَلِيفَة)=جێنیشی پێغەمبەر ﷺ حەزرەتی (عُمَر)ی کوڕی (خَطَّاب)

بوو، هەر بە دانانی ئیمامی (أبوبكر)-پێش وەفاتکردنی- لە ڕۆژی وەفاتیدا بووە (خَلیفَة)-جێنیشی پێغەمبەر ﷺ، ماوەی دە ساڵو شەش مانگو چوار ڕۆژ فەرمانڕەوایی موسوڵمانانی کرد، ئینجا لە تەمەنی (٦٣) ساڵیدا لە ساڵی (٢٣)ی کۆچیدا بە دەستی (أبولُؤلُؤة)ی ئاگرپەرست شەهید کرا، لە تەنیشت پێغەمبەر ﷺو ئیمامی (أبوبكر) نێژرا. بڕوانە (نَثْرُ اللآلی) ل١٦٠و ١٦١.

دەربارەی (خَلیفَة)ی سێیەم ئەفەرموێ:

(ثُمَّ لِعُثْمَانَ بِن عَفَّانَ ﷺ) لە دوای ئیمامی (عُمَر)، سێیەمین (خَلیفَة)-جێنیشی پێغەمبەر ﷺ حەزرەتی (عُثْمان)ی کوڕی (عَفّان) بوو، لە دوای شەهیدکردنی ئیمامی (عُمَر) هەڵبژێردرا بە (خَلیفَة)، ماوەی دوانزە ساڵ دوانزە ڕۆژ کەم، فەرمانڕەوای موسوڵمانان بوو، ئینجا لە تەمەنی (٨٢) ساڵیدا، لە ساڵی (٣٥)ی کۆچیدا، لە ماڵی خۆیدا، بە دەستی چەند کەسێکی ئاژاوەچی شەهید کراو لە (بَقیع) نێژرا، بڕوانە (نَثْرُ اللآلی) ل١٦٥.

ئینجا بزانە: (شیعَة) دان ناهێنن: بە جێنیشینیی (أبوبكر)و (عُمَر)و (عُثْمان)، ئەڵێن: ئەم سێیە بە زۆرداری (خلافَة)-جێنشینییان لە ئیمامی (عَلی) زەوت کردوە.

دەربارەی (خَلیفَة)ی چوارەم ئەفەرموێ:

(ثُمَّ لِعَلِيِّ بنِ أبیطالِب ﷺ) ئینجا لە دوای ئیمامی (عُثْمان) چوارەمین (خَلیفَة)-جێنیشی پێغەمبەر ﷺ حەزرەتی (عَلی) کوڕی (أبیطالِب)ی مامی پێغەمبەر ﷺ بوو کە مێردی (فاطمَة)ی کیژی پێغەمبەر ﷺو باوکی (حسن)و (حسین) بوو، لە دوای شەهیدکردنی ئیمامی (عُثْمان) هەڵبژێردرا بە (خَلیفَة)، ماوەی چوار ساڵو دە مانگ فەرمانڕەوای موسوڵمانان بوو، ئینجا لە تەمەنی (٦٣) ساڵیدا لە ساڵی (٤٠)ی کۆچیدا شەهید کرا: بە دەستی پیاوێکی (خَوارِج) کە ناوی (عَبْدُ الرّحمن بن ملجم) بوو، لە (نَجَف)ی خاکی (عێراق) نێژراوە، بڕوانە (نَثْرُ اللآلی) ل١٧٤و ١٧٥.

(وَهُمْ) ئەم چوارانە پێیان ئەگوترێ: (الْخُلَفَاءُ الرَّاشِدُونَ)-هەر چوار (خَلیفَة)کەی لە سەر ڕێگەی ڕاستن (وَالأَئِمَّةُ الْمَهْدِیُّونَ) چوار پێشەوایەکەی شارەزا لە ئایینی ئیسلام، هەروەك پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللهِ وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ وَإِنْ تَأَمَّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ، فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ فَسَيَرَى اخْتِلافًا كَثِيرًا، فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ فَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ﴾ رواهُ أبوداود والترمذي بسند حسن صحيح، ئامۆژگاریتان ئەکەم: فەرمانی خوا جێبەجێ بکەنو خۆتان لە قەدەغەکراوی خوا بپارێزنو گوێڕایەڵو ملکەچ بن هەرچەند کۆیلەیەکیش فەرمانڕەواییتان بکا، چونکە هەرکەسێك لە ئێوە بژیێ ناکۆکیو پەرتەوازەیەکی زۆر

وَأَنَّ الْعَشَرَةَ الَّذِينَ سَمَّاهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَبَشَّرَهُمْ بِالْجَنَّةِ نَشْهَدُ لَهُمْ بِالْجَنَّةِ عَلى ما شَهِدَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ -وَقَوْلُهُ الْحَقُّ- وَهُمْ: أَبُوبَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمانُ، وَعَلِيٌّ، وطَلْحَةُ، والزُّبَيْرُ، وسَعْدٌ، وسَعِيدٌ، وعَبْدُ الرَّحْمنِ بن عَوْفٍ، وَأَبُوعُبَيْدَةَ بن الْجَرَّاحِ وَهُوَ أَمِينُ هذه الأُمَّةِ.

---

ئەبینێ، کەوابوو: ئێوە ڕێبازی منو ڕێبازی هەر چوار خەلیفەکانی دوای من بگرن -ئەو چوارانە لە سەر ڕێی ڕاستنو شارەزای ئایینی ئیسلامن- ڕێبازی ئەم چوارانە بە ددان بگرنو لێی لامەدەن ئاگاداری خۆتان بن: لەو شتانەی تازە لە ئاییندا پەیدا ئەکرێن، چونکە ئەم شتە تازەیە (بدْعَة)یەو گشت (بدْعَة)یەکیش گومڕابوونە.

ئینجا بزانە: ڕیزی گەورەیی ئەم چوارانە -یەك لە دوای یەك- وەکو ڕیزی (خلاَفَة)یە، هەروەها لە دوای پێغەمبەرﷺ فەرموودەی ئەم چوارانە لە پێشترە: لە هی هەموو کەسێکی تر، فەرموودەی ئیمامی (أبوبکر)و ئیمامی (عُمَر)ش لە پێشترە لە هی ئیمامی (عُثْمان)و ئیمامی (عَلی)، چونکە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿اِقْتَدُوا بِالَّذِينِ مِنْ بَعْدِي: أَبِيبَكْرَ وَعُمَرَ﴾ رواه الترمذي بسند حسن، شوێنکەوتەی هەردوو جێنیشەکەی دوای من بن: کە (أبوبکر)و (عُمر)ن، بڕوانە (فتح المبين) ل١٩٦.

## ﴿ باسی دە سەحابەکەی موژدە پێدراو بە بەهەشت =(العَشَرَةُ المُبَشَّرَةُ)﴾

ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَأَنَّ الْعَشَرَةَ الَّذِينَ سَمَّاهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ) ئەو دە سەحابانەی پێغەمبەرﷺ ناوی هێناونو (وَبَشَّرَهُمْ بِالْجَنَّةِ) موژدەی بەهەشتی پێداون (نَشْهَدُ لَهُمْ بِالْجَنَّةِ) ئێمەش شاهیدی چوونە بەهەشتیان بۆ ئەدەین (عَلى مَا شَهِدَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ) لە سەر شاهیدیەکەی پێغەمبەرﷺ (وَقَوْلُهُ الْحَقُّ) بێگومان فەرموودەی پێغەمبەرﷺ ڕاستە، ئەو دە سەحابەیە ئەچنە بەهەشت (وَهُمْ) ئەو دە سەحابەیە ئەم بەڕێزانەن (أَبُوبَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ، وَعَلِيٌّ) -کە هەر چوار خەلیفەکانن-(وَطَلْحَةُ، وَالزُّبَيْرُ، وَسَعْدٌ، وَسَعِيدٌ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بنُ عَوْفٍ، وَأَبُوعُبَيْدَةَ بنُ الْجَرَّاحِ وَهُوَ) حەزرەتی (أَبِيعُبَيْدَةَ) (أَمِينُ هَذِهِ الأُمَّةِ) رواهُ الشيخان، ئەمینداری ئوممەتی پێغەمبەرەﷺ ﴿عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: عَشَرَةٌ فِي الْجَنَّةِ: أَبُوبَكْرٍ فِي الْجَنَّةِ، وَعُمَرُ فِي الْجَنَّةِ، وَعُثْمَانُ فِي الْجَنَّةِ، وَعَلِيٌّ فِي الْجَنَّةِ...إِلَى آخِرِ الْعَشَرَةِ﴾ رواه الترمذي وأبوداود بسند صحيح، واتە: ئەم دە کەسانە ئەچنە بەهەشت ﷺ أجْمَعين.

ئینجا بزانە: هەر چوار خەلیفەکان لە هەموو سەحابەکان گەورەترن بە گوێرەی ئەو ڕیزەی خۆیان: کەباسمان کرد، ئینجا شەش موژدە پێدراوەکەیتر، ئینجا ئامادەبووانی جەنگی (بدْر)، ئینجا جەنگی (أُحُدْ)، ئینجا (بَيْعَةُالرِّضْوان)، واتە: پەیمان بەستەی ژێر درەختەکە، بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٢٤٩ ب٩.

وَمَنْ أَحْسَنَ الْقَوْلَ فِي أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَأَزْوَاجِهِ الطَّاهِرَاتِ مِنْ كُلِّ دَنَسٍ، وَذُرِّيَّاتِهِ الْمُقَدَّسِينَ مِنْ كُلِّ رِجْسٍ، فَقَدْ بَرِئَ مِنَ النِّفَاقِ.

## ﴿ باسی ژنەكانی پێغەمبەر ﷺ ﴾

بزانە: ژنەكانی پێغەمبەر ﷺ پێیان ئەگوترێ: (أُمَّهاتُ الْمُؤْمِنِين) دایكەكانی ئیمانداران، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ﴾ الأحزاب:٦، پێغەمبەر ﷺ لە پێشترە بۆ ئیمانداران: لە گیانی خۆیان، ژنەكانی پێغەمبەریش دایكەكانی ئیماندارانن. ئینجا بزانە: یەكەمین و گەورەترین ژنی پێغەمبەر ﷺ حەزرەتی (خَدیجَة)یە، كە یەكەمین موسوڵمانی سەر ڕووی زەمینە، هەر لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ لە (مَكّة) وەفاتی كرد.

هەروەها بزانە: كە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی كرد، نۆ ژنی لە دوا بەجێمان كە ئەمانەن: (عَائشَة، حَفْصَة، أُمّ حَبِيبَة، سَوْدَة، أُمّ سَلَمَة، صَفيَّة، مَيْمُونَة، زَيْنَب، جُوَيْرِيَّة،رضي الله عنهن). بڕوانە (نَثْرُ اللآلي) ل١٥١و١٧٨و١٧٩و١٨٤.

ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(وَمَنْ أَحْسَنَ الْقَوْلَ) هەركەسێك گفتوگۆی جوان بێ (فِي أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ) دەربارەی سەحابەكانی پێغەمبەر ﷺ (وَأَزْوَاجِهِ الطَّاهِرَاتِ مِنْ كُلِّ دَنَسٍ) وە دەربارەی ژنەكانی پێغەمبەر ﷺ كە پاكن لە هەموو ڕەوشتێكی ناشیرین (وَذُرِّيَّاتِهِ الْمُقَدَّسِينَ مِنْ كُلِّ رِجْسٍ) وە دەربارەی نەتەوەی پێغەمبەر ﷺ كە پاككراون لە چڵكی تاوان (فَقَدْ بَرِئَ مِنَ النِّفَاقِ) ئەوە بەڕاستی پاك ئەبێتەوە لە تاوانی (نفاق) ﴿عَنْ زَيْدِ بنِ أَرْقَمَ رضي الله عنه: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: ...إِنِّي تَارِكٌ فِيكُمْ ثَقَلَيْنِ: أَوَّلُهُمَا كِتَابُ اللهِ فِيهِ الْهُدَى وَالنُّورُ، فَخُذُوا بِكِتَابِ اللهِ وَاسْتَمْسِكُوا بِهِ...وَأَهْلُ بَيْتِي أُذَكِّرُكُمُ اللهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي...ثَلاثاً﴾ رواهُ مُسْلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من دوو شتی گەورەو گران لە دوای خۆم بۆ ئێوە ئەهێڵمەوە: یەكەمیان: قورئانی پیرۆز ڕووناكی تێدایەو شارەزای ڕێگەی ڕاستتان ئەكا. دووەم: خێزانەكانمو نەتەوەی خۆم، بە خواتان ئەترسێنم: دەربارەی خێزانەكانی منو نەتەوەی من باش بنو ڕێزیان لێ بنێن.

ئینجا بزانە: لە (صحیح مسلم)دا هاتوە: كە (أَهْلُ البَيْت)ی پێغەمبەر ﷺ ژنەكانیشی ئەگرێتەوەو ئەو كەسانەش ئەگرێتەوە: كە زەكاتیان پێناچێ، ئەمەش بە پلەی یەكەم ئیمامی (عَلِي)و (فَاطِمَة)ی ژنیو (حَسَن)و (حُسَين)ی كوڕیان ئەگرێتەوە. بڕوانە (شرح صحیح مسلم) ل٢٨٥و٢٩٩ ب٩. هەروەها بزانە: ئەو (سَيِّد)انەی ئێستا لە كوردستانن، ئەوانیش نەتەوەی (حسن)و (حسین)ن، كەوابوو: واجبە ڕێزیان لێبندرێ.

وَعُلَمَاءُ السَّلَف مِنَ السَّابِقِينَ وَمَنْ بَعْدَهُمْ مِنَ التَّابِعِينَ أَهْلُ الْخَيْرِ وَالأَثَرِ وَأَهْلُ الْفِقْهِ وَالنَّظَرِ، لاَ يُذْكَرُونَ إِلاَّ بِالْجَمِيلِ، وَمَنْ ذَكَرَهُمْ بِسُوءٍ فَهُوَ عَلَى غَيْرِ السَّبِيلِ.

## ﴿ باسی منداڵەکانی پێغەمبەر ﷺ ﴾

بزانە پێغەمبەرﷺ سێ کوڕی هەبون، یەکەمیان: (قاسم). دووەمیان: (عبدالله) کە پێی ئەگوترا: (طاهر)و (طَيِّب). سێیەمیان: (إبراهيم)، هەرسێکیان بە منداڵی لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ مردن. هەروەها چوار کیژیشی هەبون، یەکەمیان: (زَيْنَب). دووەمیان: (رُقَيَّة). سێیەمیان: (فاطمَة). چوارەمیان: (أُمّ كَلْثُوم). جگە لە (فاطمَة) گشتیان لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ مردن‌و نەتەوەی نێرینەیان نەبو، بەڵام (فاطمَة)-کە ژنی ئیمامی (علي) بوو- بە شەش مانگ لە دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، دوو کوڕیشی هەبون: بە ناوی (حسن)و (حسين). ئینجا بزانە: منداڵەکانی پێغەمبەرﷺ جگە لە (إبراهيم) گشتیان لە حەزرەتی (خَدِيجَة) بون، بەڵام (إبراهيم) لە کەنیزەیەك بوو: بە ناوی (مارِيَة). بڕوانە (كفايَةُ العَوام بحاشية الباجوري) ل٩١و٩٢.

## ﴿ باسی پێشینە باشەکان=(السَلَفُ الصَالِحُ) ﴾

بزانە: (السَلَفُ الصَالِحُ)=پێشینە باشەکان: زانایانی ئەو سێسەد ساڵەنە: کە پێغەمبەرﷺ شاهیدی بۆ داون‌و ئەفەرموێ: ﴿خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُم﴾ رواهُ البخاري ومُسْلم، چاکترینی ئوممەتم: سەدەی خۆمە، ئینجا سەدەی دوای ئەوان، ئینجا سەدەی دوای ئەوان. ئیمامی (النواوی)و (القسطلانی) فەرموویانە: مەبەست چینی (صَحابَة)و (تابِعين)و (تابِعُ التَّابِعِين)ن، بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٤١٩ ب٩و (إرشادُ الساري شَرح البخاري) ل٨٠ ب٦.

هەر بە بەڵگەی ئەم حەدیسە ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَعُلَمَاءُ السَّلَف مِنَ السَّابِقِينَ) زانایانی (سَلَفْ) لە چینی پێشوو (وَمَنْ بَعْدَهُمْ مِنَ التَّابِعِينَ) ئەوانەی دوای ئەوانیش هاتون (أَهْلُ الْخَيْرِ وَالأَثَرِ) ئەوان خاوەنی چاکەو ئاسەواری چاکن (وَأَهْلُ الْفِقْهِ وَالنَّظَرِ) خاوەنی تێگەیشتن‌و لێکۆڵینەوەن لە قورئان‌و حەدیس (لاَ يُذْكَرُونَ إِلاَّ بِجَمِيلِ) نابێ باسیان بکەین تەنها بە باسکردنێکی جوان نەبێ (وَمَنْ ذَكَرَهُمْ بِسُوءٍ) هەر کەس بە خراپە باسی زانایانی ئەو سێسەدەیە بکا: (فَهُوَ عَلَى غَيْرِ السَّبِيل) ئەو کەسە لە سەر ڕێگەی ڕاست نیە، چونکە لە ڕاڕەوی (أهل السّنَّة)دا واجبە: موسوڵمان بەم ئایەتە پیرۆزە ڕەفتار بکاو دوعا بۆ پێشینە باشەکان بکا، کە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالإِيمَانِ وَلاَ تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلاًّ لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ الحشر:١٠، واتە: ئەو موسوڵمانانەی لە

دوای ئەوان هاتون، ئەڵێن: خوایە لە ئێمە خۆش بەو لەو کەسانەش خۆش بە: کە پێش ئێمە کەوتون بە ئیمانەوە، خوایە ڕق و قینە نەخەیە دڵمان بەرامبەر ئەو کەسانەی ئیمانیان هێناوە، خوایە تۆ زۆر بە ڕەحمی و نیعمەت بەخشی.

جا ئەی موسوڵمانی بەڕێز-بۆ نموونە- بە بەڵگەی ئەم حەدیسە: پێناسەی (السَّلَفُ الصَّالِحْ) پێشەوایانی هەر چوار مەزهەبەکانیش ئەگرێتەوە، چونکە گشتیان لەم سێ سەدەیەدا ژیاون، بەم شێوەیە:

١- ئیمامی (حَنَفی-أبِیحَنیفَة) لەساڵی (٨٠ ) تا (١٥٠)ی کۆچی، واتە: لە سەدەی یەکەم و دووەمدا ژیاوە.

٢- ئیمام (مالك) لە ساڵی (٩٣) تا (١٧٩)ی کۆچی، واتە: لە سەدەی یەکەم و دووەمدا ژیاوە.

٣- ئیمامی (شافعی) لە ساڵی (١٥٠) تا (٢٠٤)ی کۆچی، واتە: لە سەدەی دووەم و سێیەمدا ژیاوە.

٤- ئیمام (أحْمَدْ) لە ساڵی (١٦٤) تا (٢٤١)ی کۆچی، واتە: لە سەدەی دووەم و سێیەمدا ژیاوە. بڕوانە (نُورُ الأبْصار) ل٢٠٥و ٢٠٨و ٢١٢و ٢٢٥.

ئیمامی (اللقاني) ئەفەرموێ:

﴿ فَكُلُّ خَيْرٍ فِي اتِّباعِ مَنْ سَلَفْ * وَكُلُّ شَرٍّ فِي ابْتِداعِ مَنْ خَلَفْ ﴾

هەموو چاکەیەك لە شوێنکەوتنی زانایانی (سَلَفْ)-پێشینەدایە، هەموو خراپەیەکیش لەو شتە سەیرانە دایە: کە لە دواهاتووەکان پەیدای ئەکەن و بەڵگەیان بە دەستەوە نیە. (تحفة المريد) ل١١٤.

کەوابو: ئەگەر فەریکە خوێندەوارێکی ئەم سەردەمە گوتی: ئێمەش وەکو ئەوچوار ئیمامانە پیاوین و لە قورئان و حەدیس بە خۆمان ڕێگەی ڕاست ئەدۆزینەوە و شوێنکەوتەی ئەوان نابین، لە وەڵامی دا بڵێ: ئەم حەدیسەم بەڵگەیە: کە پێغەمبەرﷺ بە ووشەی (خَيْرُ أُمَّتي) شاهیدی بۆ ئەو ئیمامانە داوە، بەڵام کێ شاهیدی تۆیە: کە تۆ پیاوی ئەو مەیدانەی؟!!!.

## ﴿باسی (وَلی)و (كَرامَة)﴾

**پێناسە**: (وَلی)-دۆستی نزیك لە خوا، ئەو ئیماندارەیە: بەردەوام لە خوا بترسێ و فەرمانی جێبەجێ بکاو قەدەغەی نەشکێنێ، زۆریش سوننەت و زیکری خوا بکا. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلَّا الْمُتَّقُونَ﴾ الأنفال:٣٤، دۆستەکانی خوا تەنها لە خواترسەکانن. بڕوانە (فتح المبين) ل٢٤٠.

وَلاَ نُفَضِّلُ أَحَداً مِنَ الأَوْلِيَاءِ عَلَى أَحَدٍ مِنَ الأَنْبِيَاءِ عَلَيْهِمُ السَّلاَمُ، وَنَقُولُ: نَبِيٌّ وَاحِدٌ أَفْضَلُ مِنْ جَمِيعِ الأَوْلِيَاءِ، وَنُؤْمِنُ بِمَا جَاءَ مِنْ كَرَامَاتِهِمْ وَصَحَّ عَنِ الثِّقَاتِ مِنْ رِوَايَاتِهِمْ،

---

ئیمامی (الشعراني) دەفەرموێ: کاروپیشەی (أولیاء)=دۆستانیخوا ئەوەیە: بە شەریعەتی پێغەمبەرﷺ ڕەفتار دەکەن، جا هەر کاتێك لە ڕێگەی شەرع دەرچوون بە هیلاك دەچن‌و یارمەتی خوای گەورەیان لێدەبڕێ، کەوابوو: بۆیان ناگونجێ ڕاستەوخۆ هیچ لە خودا وەربگرن. بڕوانە (الیَواقیت والجَواهر) ل٦٤ ب٢.

خوایگەورە لە حەدیسێکی (قُدسی)دا ئەفەرموێ: ﴿مَنْ عادَى لِي وَلِيّاً فَقَدْ آذَنْتُهُ بالْحَرْبِ﴾ رواهُ البخاري، هەرکەسێك دژایەتی دۆستێکی من بکا-چونکە دۆستی منە- بە ڕاستی ئاگاداری ئەکەمەوە: کە خۆم جەنگی لەگەڵ ئەکەم. هەروەها خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُدَافِعُ عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ الحج:٣٨، خوای گەورە بەرگری ئەکا لەو کەسانەی ئیمانیان هێناوە. (الطوفی) ئەفەرموێ: چونکە دۆستی خوا=(وَلی) بە هۆی خواپەرستی‌و لەخواترسان خوای گەورەی کردۆتە دۆستی خۆی، خوای گەورەش بە هۆی پاراستن‌و یارمەتیدان ئەیکاتە دۆستی خۆی. بڕوانە (فتح الباري) ل٤١٦و ٤١٧ ب١١.

ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَلاَ نُفَضِّلُ أَحَداً مِنَ الأَوْلِيَاءِ) هیچ (وَلی)ێك بە گەورەتر دانانێین (عَلَى أَحَدٍ مِنَ الأَنْبِيَاءِ) لە سەر هیچ پێغەمبەرێك-عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ- بەڵکو هیچ (وَلی)ێك ناشگاتە پلەی بچووکترین (صَحابَة)ی پێغەمبەرﷺ، وە گەورەترین سەحابەش-کە حەزرەتی (أبوبَكر)ە- ناگاتە پلەی هیچ پێغەمبەرێك، کەوابوو: بە هیچ جۆرێك (وَلی) لەگەڵ هیچ پێغەمبەرێك یەکسانیش نیە لە گەورەییدا. بڕوانە (نَثْرُ اللآلی) ل١٤٥.

(وَنَقُولُ) ئێمەی (أهل السنّة) ئەڵێین: (نَبِيٌّ وَاحِدٌ) تەنها یەك پێغەمبەرﷺ (أَفْضَلُ مِنْ جَمِيعِ الأَوْلِيَاءِ) گەورەترە لە هەموو (أولیاء)کان: بە گەورەو بچووکیانەوە (وَنُؤْمِنُ بِمَا جَاءَ مِنْ كَرَامَاتِهِمْ) باوەڕمان هەیە بەو (کَرامَە)تانەی لە سەر دەستی (وَلی)یەکان دێنەجێ (وَصَحَّ عَنِ الثِّقَاتِ مِنْ رِوَايَاتِهِمْ) کە لە ڕێگەی ڕاست بە هۆی باوەڕپێکراوان بۆمان گێڕدراوەتەوە.

**پێناسە**: (کَرامَة) ڕێزلێنان: کارێکە وەکو (مُعْجِزَة) لە سنووری توانای ئادەمیزاددا نیە، خوای گەورە لە سەر دەستی دۆستانی خۆی ئەیهێنێتە جێ‌و داوای پێغەمبەرایەتیش ناکەن. واتە: (کَرامَة) ڕێزلێنان‌و بەڵگەیەکە: کە ئەم ئایینە ڕاستەو بە ئەنجامدانی ئایین بەندە ئەبێتە دۆستی خوا. کەوابوو: ئەگەر موسوڵمانێك ئەم (کَرامَة)ی دەست نەکەوت، ئەوە پلەی پێدانابەزێ لەلای خواو پێویستە لە سەر ڕێگەی ڕاست هەر بەردەوام بێ. بۆ پێناسەو ڕوونکردنەوەی (کَرامَة). بڕوانە (شرح الطحاوية) ل٧٤٦ تا ٧٥٣ ب٢.

وَنُؤْمِنُ بِأَشْرَاطِ السَّاعَةِ: مِنْ خُرُوجِ الدَّجَّالِ، وَنُزُولِ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلامُ مِنَ السَّمَاءِ، وَنُؤْمِنُ بِطُلُوعِ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَخُرُوجِ دَابَّةِ الأَرْضِ مِنْ مَوْضِعِهَا.

---

(الباجُوري) ئەفەرموێ: کۆمەڵە زۆرەکەی (أهل السُّنَّة) ئەڵێن: ئەگونجێ (کرامة) لە دوای مردنی (وَلی)یەکەش دەربکەوێ، لەو چوار مەزهەبانە کەس نەیفەرمووە: (کَرَامَة) لە دوای مردن دەرناکەوێ. ئینجا ئەفەرموێ: بەڵگەی بوونی (کَرَامَة): قورئانی پیرۆزە، وەکو ڕووداوی (مَـرْيَم)ی دایکی(عیسَى)پێغەمبەرﷺو چیرۆکی (أَصْحَابُ الكَهْف)و...هتد، هەروەها بەڵگەش ئەو (کَرَامَة)تانەیە کە لە سەحابەکان هاتووەتە دی: وەکو ئیمامی (عُمَر) لە (مَدِينَة)وە بۆ (نَهَاوَنْدْ)-کە مانگێك دوورە- بانگی کرد: (يَا سَارِيَةُ الْجَبَلَ الجَبَل). واتە: هۆ (سارِيَة) ئاگاداری چیایەکە بە دوژمن پشتتان لێنەستێنێ. جا لەوێوە (سارِيَة) گوێی لێبو و هێرشی بردە سەر چیایەکەو دوژمنی بەزاند. بڕوانە (تحفة المريد) ل٨٢و٨٣.

کەوابوو: ئەی برای موسوڵمان، ڕێز لە دۆستە مردووەکانی خوای گەورەش بنێو بە سووکی ناویان مەهێنەو لە پلەیان کەم مەکەوە، نەوەکو خوا جەنگت لەگەڵ بکا.

## ﴿باسی نیشانەکانی دونیا وێرانبوون-( أَشْرَاطُ السَّاعَة )﴾

بزانە: نیشانەکانی دونیا وێرانبوون دوو جۆرن: جۆرێکیان گەورەنە، جۆرێکیان بچووکن:

دەربارەی **نیشانە گەورەکان** ئیمامی (الطحاوی) ئەفەرموێ:

(وَنُؤْمِنُ بِأَشْرَاطِ السَّاعَةِ) باوەڕمان هەیە: بە نیشانەکانی دونیا وێرانبوون: (مِنْ خُرُوجِ الدَّجَّالِ) وەك هاتنی دەججالو (وَنُزُولِ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ-عليه السلام- مِنَ السَّمَاءِ) هاتنە خوارەوەی عیسی پێغەمبەرﷺ لە ئاسمان (وَنُؤْمِنُ بِطُلُوعِ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا) باوەڕمان هەیە: بە دەرکەوتنی ڕۆژ لە لای ڕۆژئاواوە (وَخُرُوجِ دَابَّةِ الأَرْضِ مِنْ مَوْضِعِهَا) باوەڕمان هەیە بە هاتنە دەرەوەی ئاژەڵی زەوی لە شوێنی خۆی لە (مَكَّة)ی پیرۆز.

﴿عَنْ حُذَيْفَةَ بن أَسِيد الْغِفَارِيِّ رضي الله عنه قَالَ: اطَّلَعَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَيْنَا، فَقَالَ: مَا تَذَاكَرُونَ؟ قَالُوا: نَذْكُرُ السَّاعَةَ. قَالَ: إِنَّهَا لَنْ تَقُومَ حَتَّى تَرَوْنَ قَبْلَهَا عَشْرَ آيَاتٍ: فَذَكَرَ الدُّخَانَ، وَالدَّجَّالَ، وَالدَّابَّةَ، وَطُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَنُزُولَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ، وَيَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ، وَثَلاثَةَ خُسُوفٍ: خَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ، وَخَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ، وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ. وَآخِرُ ذَلِكَ نَارٌ تَخْرُجُ مِنَ الْيَمَنِ تَطْرُدُ النَّاسَ إِلَى مَحْشَرِهِمْ﴾ رواهُ مُسْلِم،

پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: دونیا وێران نابێ، تا لە پێش وێرانبوونیدا دە نیشانە نەبینن:

١-(الدُّخَانَ): دوکەڵێك لە سەر زەمین بڵاو ئەبێتەوە، ماوەی چل ڕۆژ ئەمێنێتەوە، کافرەکان هەناسەیان پێ تەنگ ئەبێو موسوڵمانان پێ تووشی پەسیو ئەبن. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٣٥٤ ب١٠و (فتح الباری) ل٧٣٦ ب٨.

٢-(الدَّجَّالَ): پیاوێکی فێڵبازو کافرەو چاوی ڕاستەی کوێرەو لە نێوان چاوانی نووسراوە: (کافر)، ماوەی چل ڕۆژ ئەمێنێتەوە: ڕۆژی یەکەمی بە قەد ساڵێکە، دووەمی بە قەد مانگێکە، سێیەمی بە قەد حەفتەیەکە، ڕۆژەکانی‌تریشی وەك ئێستایە، لەو ماوەیەدا خەڵکی گومڕا ئەکا، ئینجا حەزرەتی (عیسَی)پێغەمبەرﷺ ئەیکوژێ. بڕوانە (صحیح مسلم بشرح النواوي) ل٣٨٨و ٣٩٧ ب١٠.

٣-(الدَّابَةَ): ئاژەڵێکە لە (مَكَّة)ی پیرۆز دەرئەچێو ئەنگوستیلەی حەزرەتی (سُلیمان) پێغەمبەری-علیه السلام- لە لایە، نێوچاوانی کافرەکان پێ نیشانە ئەکا، دارعەسای (مُوسی) پێغەمبەری-علیه السلام- لە لایە، نێوچاوانی ئیماندارانی پێ نیشان ئەکا، (رواه الترمذی بسند حسن في تفسیر سورة النمل) الآیة: ٨٢و (شرح صحیح مسلم) ل٣٥٤ ب١٠.

٤-(طُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا): گەڕانەوەی ڕۆژ لە لای ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات تا دەگاتە ناوەندی ئاسمان، ئینجا بەرەو ڕۆژئاوا دەگەڕێتەوە، ئینجا لەمەودواش وەکو جاران لە ڕۆژهەڵاتەوە دەردەکەوێتەوە. ئینجا بزانە: هەر کاتێك ڕۆژ لە لای ڕۆژ ئاواوە گەڕاوە، یان (الدَّابَة) هات، تۆبە قبوڵ نابێو کافریش ئیمانی لێوەرناگیرێ، ئەم دوو نیشانەش لە یەك ڕۆژدا ڕوو ئەدەن. بڕوانە (فتح الباري) ل٤٢٩-٤٣٤ ب١١ و (تحفة المحتاج) ل٤٢٠ ب١.

٥-(نُزُولَ عِیسَی ابْنِ مَرْیَمَ): هاتنە خوارەوەی (عیسَی) پێغەمبەرﷺ، لە ئاسمانەوە لە لای (منارة)کەی (دِمَشق) دائەبەزێو (دَجَّال) ئەکوژێو ماوەی چل ساڵ ئەمێنێتەوەو بە شەریعەتی ئیسلام ڕەفتار ئەکا (رواهما مسلم وأحمد).

٦-(یَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ): چینە خەڵکێکن دونیا داگیر ئەکەنو برسیەتی بڵاو ئەکەنەوە، ئینجا حەزرەتی عیسی پێغەمبەرﷺ دوعایان لێئەکاو خوای گەورە لەناویان ئەبا، بڕوانە (فتح الباري) ل١٣٦ ب١٣.

٧-٨-٩-(ثَلاثَةَ خُسُوفٍ) سێ ڕووچونی زەمین: یەکیان لە ڕۆژهەڵات، یەکیان لە ڕۆژئاوا، یەکیان لە جەزیرەی عەرەب، (شرح صحیح مسلم) ل٣٥٥ ب١٠.

١٠-(آخِرُ ذَلِكَ نَارٌ تَخْرُجُ مِنَ الْیَمَنِ) دوایین نیشانە، ئاگرێکە لە وڵاتی (یەمن)ەوە دەرئەچێو (تَطْرُدُ النَّاسَ إِلَی مَحْشَرِهِم) خەڵکی بەرەو (شامْ) ڕاو ئەنێو لەوێ کۆیان ئەکاتەوە. (فتح الباري) ل٤٦١ ب١١.

**نیشانە بچووکەکانیش** زۆرن: وەکو پەیدابوونی (مُحَمَّد الْمَهْدی)، بڵاوبوونەوەی کوشتنو بێناموسیو نەزانی، کەمبوونی پیاو و زۆربوونی ئافرەت، فەرمانڕەوایی ناکەس بەچە، دەوڵەمەندبوونی ڕووتو ڕەجاڵەکان، ئازاردانی دایکانو...هتد. بڕوانە (التاج الجامع للأصول) ل٣٣١ تا ٣٤٤ ب٥.

وَلاَ نُصَدِّقُ كَاهِناً وَلاَ عَرَّافاً وَلاَ مَنْ يَدَّعِي شَيْئاً يُخَالِفُ الْكِتَابَ وَالسُّنَّةَ وَإِجْمَاعَ الأُمَّةِ.

## ﴿ باوەڕ بە فاڵچی ناکەین ﴾

ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(وَلاَ نُصَدِّقُ كَاهِناً) ئێمەی (أهل السنّة) باوەڕ بەو کەسە ناکەین کە ئەڵێ: من زانستی نادیار=(عِلْمُ الغَيْب) ئەزانم (وَلاَ عَرَّافاً) هەروەها باوەڕیش بە فاڵچی ناکەین کە ئەڵێ: بە هۆی فاڵگرتنەوە شوێنی دزراو و ونبوو، بەختەوەریو بەدبەختیو...هتد ئەزانم، چونکە ئەم شتانە گشتی زانستی نادیارنو زانستی نادیاریش=(عِلْمُ الغَيْب) تایبەتی خوای گەورەیە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ فَلاَ يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا، إِلاَّ مَنِ ارْتَضَى مِنْ رَسُولٍ﴾ الجن:٢٦-٢٧، خوای گەورە زانای زانستی نادیارە، هیچ کەسێك شارەزای نادیاری خۆی ناکا، تەنها ئەو پێغەمبەرە نەبێ: کە خۆی هەڵیبژێریو پێی رازیبێ زانستی نادیاری بداتێ.

پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ أَتَى عَرَّافًا فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ، لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاَةُ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً﴾ رواهُ مُسْلم، وفي رواية الإمام أحمد: ﴿مَنْ أَتَى عَرَّافًا أَوْ كَاهِنًا فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ، فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍﷺ﴾ هەرکەسێك بچێتە لای فاڵچیو پرسیاری لە شتێك لێبکا، ئەوە خێری نوێژی چل شەوی بۆ نانووسرێ. لە حەدیسێکیتردا ئەفەرموێ: هەرکەسێك بچێتە لای فاڵچی، یان لای ئەو کەسەی زانستی نادیار ئەڵێ، باوەڕیشی پێکرد، بەڕاستی ئەوە کوفری کردوە بەو قورئانەی بۆ پێغەمبەرﷺ هاتۆتە خوارەوە. بۆ ئەم باسە بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٧٤ ب٩.

## ﴿ باسی (إجْماع) یەکدەنگی زانایانی ئیسلام ﴾

بزانە: (إجماع)=یەکدەنگی زانایانی ئایین، بەڵگەی سێیەمی شەریعەتی ئیسلامە لە دوای قورئانو حەدیس، کەولبوو: واجبە ڕەفتاری پێبکەین، هەروەك ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(وَلاَ مَنْ يَدَّعِي شَيْئاً) هەروەها باوەڕ بەو کەسە ناکەین: کە داوای شتێك ئەکا (يُخَالِفُ الْكِتَابَ وَالسُّنَّةَ وَإِجْمَاعَ الأُمَّةِ) داوایەکەشی دژ بە قورئانو حەدیسو یەکدەنگی زانایانی ئوممەتی ئیسلام بێ، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا﴾ النساء:١١٥، هەرکەسێك دژ بە ڕێبازی پێغەمبەرﷺ بێ، پاش ئەوەی ڕێگەی ڕاستی بۆ ڕوون بوەوە، جگە لە ڕێگەی موسوڵمانان شوێن ڕێبازێکیتر بکەوێ، ئێمە ئەیدەینە دەست ڕێبازە گومڕایەکەی خۆیو ئەیبەینە دۆزەخ کە خراپترین شوێنە.

ئیمامی (الشافعی) ئەم ئایەتەی بە بەڵگە هێناوەتەوە: کە (إجْماع)-واتە: یەکدەنگی زانایان- بەڵگەی سێیەمی شەریعەتی ئیسلامە لە دوای قورئانو حەدیس. بڕوانە (تفسیر روح المعانی) ل١٤٦ ب٥.

هەروەها پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إنَّ اللهَ تَعالَى لا يَجْمَعُ أُمّتي عَلَى ضَلالَة ويَدُ اللهِ مَــعَ الْجَمَاعَة، وَمَنْ شَذَّ شَذَّ إِلَى النَّارِ﴾ رواه الترمذي وقال: غريب، وقال الأحوذي لكن له شواهد. خوای گەورە ئوممەتی من لە سەر گومڕایی کۆ ناکاتەوە، دەستی یارمەتی خوا لەگەڵ کۆمەڵدایە، هەرکەسێك لە کۆمەڵ جیا ببێتەوە، بەرەو ئاگر ئەڕوا (تحفةالأحوذي) ل٢٠٨ ب٣.

(وَنَرَى الْجَمَاعَةَ حَقّاً وَصَوَاباً) ئێمەی (أهل السنّة) باوەڕمان وایە: کۆمەڵبوونی موسوڵمانان واجبەو ڕاستە (وَالْفُرْقَةَ زَيْغاً وَعَذَاباً) باوەڕمان وایە: پەرتەوازەو تاکڕەوی لادانە لە ڕاستیو هۆی سزادانی قیامەتە. پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿عَلَيْكُمْ بالْجَماعَة وَإيّاكُمْ وَالْفُرْقَــةَ، فَإنَّ الشَّيْطَانَ مَعَ الْوَاحِدِ وَهُوَ مِنَ الإثْنَيْنِ أبْعَدُ، مَــنْ أرَادَ بَحْبُوحَــةَ الْجَنَّــةِ فَلْيَلْــزَمِ الْجَمَاعَةَ﴾ رواه الترمذي بسند صحيح، ئێوە هەردەم لەگەڵ کۆمەڵدا بنو پەرتەوازەو تاکڕەوی مەکەن، چونکە شەیتان لەگەڵ یەك کەس دایەو لە دوو کەسان دوورترە، هەر کەس ئاوەندی بەهەشتی ئەوێ، با هەر لەگەڵ کۆمەڵدا بێ.

هەروەها لە حەدیسێکیتردا پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿إنَّ الشَّيْطَانَ ذِئْــبُ الإنْســانِ كَذِئْبِ الْغَنَمِ يَأْخُذُ الشَّارِدَةَ الْقَاصِيَةَ، فَإيَّاكُمْ وَالشِّعَابَ، وَعَلَيْكُمْ بِالْجَمَاعَــةِ وَالْعَامّــةِ وَالْمَسْجِدِ﴾ رواه الإمام أحمد بسند صحيح، وفي رواية: ﴿فَعَلَيْكُمْ بِالْجَمَاعَة، فَإنَّما يَأْكُلُ الذِّئْبُ الْقَاصِيَةَ﴾ رواه النسائي بسند حسن، شەیتان گورگی ئادەمیزادە: مرۆڤی تاکڕەو ئەگرێ، هەروەك گورگ مەڕی لە مێگەل جیابووەوە ئەگرێ، کەوابوو: ئاگاداری خۆتان بن لامەدەنە ڕێچکەکانی تاکڕەوی، هەردەم لەگەڵ کۆمەڵو ڕێبازە گشتییەکەی موسوڵمانانو مزگەوتدابن. لە حەدیسێکیتردا ئەفەرموێ: هەر لەگەڵ کۆمەڵدا بن، چونکە گورگ تەنها مەڕی دوور لە مێگەل ئەخوا. بڕوانە (السراج المنير) ل٤٥١ ب١.

ئینجا بزانە: (شیعة)و چینێکی (خَوارج) باوەڕیان بە (اجماع)ی زانایانی (أهل السنّة) نیە، بڕوانە (حاشية البهَشتي) ل١٠٤.

(إبن أبيالعزّ) ئەفەرموێ: قورئانو حەدیسو (اجماع)-واتە: یەکدەنگی (سَلَفْ)- بووەتە بەڵگە: کە واجبە خەڵك گوێڕایەڵ بێ بۆ کاربەدەستو ئیمامی نوێژو فەرماندەی جەنگ...هتد، وە ئەبێ واز لە بۆچوونی خۆیان بهێنن، چونکە بەرژەوەندیی کۆمەڵبوونو

وَدِينُ اللهِ فِي الأَرْضِ وَالسَّمَاءِ وَاحِدٌ، وَهُوَ دِينُ الإِسْلَامِ. قَالَ اللهُ تَعَالَىٰ: [إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللهِ الإِسْلَامُ]، وَقَالَ تَعَالَىٰ: [وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلَامَ دِيناً]، وَهُوَ بَيْنَ الْغُلُوِّ وَالتَّقْصِيرِ. وَبَيْنَ التَّشْبِيهِ وَالتَّعْطِيلِ،

---

ویرانکاریی پەرتەوازە، زۆر لەو مەسەلە بچووکانە گەورەترن، ئینجا ئەفەرموێ: واجبە لە سەر گشت موسوڵمانێك –لە دوای دۆستایەتی خواو پێغەمبەرﷺ– دۆستایەتی ئیماندار بکا بە تایبەتی ئەو ئیماندارانەی میراتگری پێغەمبەرنﷺ بە ڕاستی موسوڵمانان یەکدەنگن: کە ئەو زانایانە شارەزای ئایینی ئیسلامن‌و چاکترینی موسوڵمانانن، چونکە ئەوان جێگری پێغەمبەرنﷺ لە ناو ئوممەتەکەیدا، هەر ئەوان زیندووکەرەوەی شەریعەتی پێغەمبەرنﷺ. (شرح الطحاوية) ل٥٣٤و٧٤٠ ب٢.

## ﴿ ئایینی ئیسلام ئایینی خوایە ﴾

ئیمامی (الطحاوي) ئەفەرموێ:

(وَدِينُ اللهِ) ئایینی خودا (فِي الأَرْضِ وَالسَّمَاءِ وَاحِدٌ) لە زەمینو لە ئاسماندا هەر یەك ئایینە (وَهُوَ دِينُ الإِسْلَامِ) ئایینی خوا ناوی ئیسلامە (قَالَ اللهُ تَعَالَىٰ) خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللهِ الإِسْلَامُ﴾ آل عمران:١٩، ئایینی ڕاستەقینە لە لای خوا ئایینی ئیسلامە. (وَقَالَ تَعَالَىٰ) هەروەها خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلَامَ دِيناً﴾ المائدة:٣، ڕازیمە: ئیسلام ئایینی ئێوە بێ.

پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿الأَنْبِيَاءُ إِخْوَةٌ مِنْ عَلَّاتٍ وَأُمَّهَاتُهُمْ شَتَّى، وَدِينُهُمْ وَاحِدٌ﴾ رواهُ مُسْلِم، پێغەمبەران زڕبرای یەکن‌و دایکیان لێك جیایەو ئایینیان یەك ئایینە. واتە: بنچینەی ئایینیان یەك بنچینەیە: کە یەکخوا پەرستییە، بەڵام لە لقەکانی ئاییندا لێك جیانە. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ل٢١٦ ب٩.

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾ المائدة:٤٨، هەر یەکێك لە ئێوە –ئەی پێغەمبەران– جۆرە یاساو بەرنامەیەکمان داوەتێ. بگەڕێوە باسی (تاكو تەنیایی خوا)و (باوەڕ بە پێغەمبەران) عليهمُ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ.

(وَهُوَ) ئایینی ئیسلام: ئایینێکە (بَيْنَ الْغُلُوِّ وَالتَّقْصِيرِ) لە نێوان کەمتەرخەمیو لە سنوور دەرچووندایە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ المائدة:٨٧، ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەو شتە پاکانەی خوا بۆ ئێوەی حەڵاڵ کردوە، ئێوە حەرامی مەکەن‌و لە سنوور دەرمەچوون، چونکە خوای گەورە لە سنووردەرچووەکانی خۆش ناوێ.

(وَبَيْنَ التَّشْبِيهِ وَالتَّعْطِيلِ) ئایینێکە لە نێوان وێچواندن‌و لەکارخستنی سیفەتەکانی خوادایە، واتە: ئەڵێین خوا سیفەتی هەیە، بەڵام وەکو سیفەتی خەڵك نیە، هەروەك خوای

وَبَيْنَ الْجَبْرِ وَالْقَدَرِ، وَبَيْنَ الأَمْنِ وَالْيَأْسِ. فَهذَا دِينُنَا وَإِعْتِقَادُنَا ظَاهِراً وَبَاطِناً. وَنَحْنُ بُرَءاءُ إِلَى اللهِ مِنْ كُلِّ مَنْ خَالَفَ الَّذِي ذَكَرْنَاهُ وَبَيَّنَّاهُ. وَنَسْأَلُ اللهَ تَعَالَى أَنْ يُثَبِّتَنَا عَلَى الإِيمَانِ، وَيَخْتِمَ لَنَا بِهِ، وَيَعْصِمَنَا مِنَ الأَهْوَاءِ الْمُخْتَلِفَةِ وَالآرَاءِ الْمُتَفَرِّقَةِ وَالْمَذَاهِبِ الرَّدِيَّةِ: مِثْلِ الْمُشَبِّهَةِ وَالْمُعْتَزِلَةِ وَالْجَهْمِيَّةِ وَالْجَبْرِيَّةِ وَالْقَدَرِيَّةِ وَغَيْرِهِمْ مِنَ الَّذِينَ خَالَفُوا السُّنَّةَ وَالْجَمَاعَةَ وَحَالَفُوا الضَّلاَلَةَ،

---

گەورە ئەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ الشورى:١١، هیچ شتێك هاووێنەی خوا نیەو خوا بیسەرو بینەرە. (وَبَيْنَ الْجَبْرِ وَالْقَدَرِ) ئایینێکە لە نێوان زۆرلێکردنو قەزاو قەدەردایە، واتە: بەندە سەرپشکە لە وەدەستهێنانی کردارەکانی، بەڵام خۆیو کردارەکانیشی دروستکراوی خوایە، بگەڕێوە باسی (سەرپشکی بەندە لە کردەوەکانی)دا (وَبَيْنَ الأَمْنِ وَالْيَأْسِ) ئایینێکە لە نێوان دڵنیاییو بێئومێدیدایە، هەروەك لە باسی (ترسان لە خواو تکای ڕەحمەتی خوا) ڕوونمان کردەوە.

## ﴿دوا ووتەی ئیمامی (الطحاوی)﴾

(فَهذَا) ئەوەی لەم (عَقِيدَة)دا باسمان کرد (دِينُنَا) ئایینی ئێمەی موسوڵمانە (وَإِعْتِقَادُنَا) بیروباوەڕی ئێمەی (أَهل السُّنَّة والْجَمَاعة)یە (ظَاهِراً وَبَاطِناً) بە ئاشکرایيو بە نهێنی (وَنَحْنُ بُرَءاءُ إِلَى اللهِ) ئێمە خۆمان جیا ئەکەینەوە بۆ لای خوا (مِنْ كُلِّ مَنْ خَالَفَ الَّذِي ذَكَرْنَاهُ وَبَيَّنَّاهُ) لە هەرکەسێکی دژ بەو (عَقِيدَة)یە بێ: کە باسمان کردو ڕوونمان کردەوە (وَنَسْأَلُ اللهَ تَعَالَى) لە خوا ئەپاڕێینەوە (أَنْ يُثَبِّتَنَا عَلَى الإِيمَانِ) کە لە سەر ئیمان بمانهێڵێتەوە (وَيَخْتِمَ لَنَا بِهِ) لە خوا ئەپاڕێینەوە کۆتایی تەمەنمان بە ئیمانەوە بێ (وَيَعْصِمَنَا مِنَ الأَهْوَاءِ الْمُخْتَلِفَةِ) خوا بمانپارێزێ لەو هەوەسە جیاجیایانەی (أَهْل البِدْعَة) تووشی بونە (وَالآرَاءِ الْمُتَفَرِّقَةِ) خوا بمانپارێزێ لەو ڕایە پەرتەوازە چیانەی هەیە (وَالْمَذَاهِبِ الرَّدِيَّةِ) خوا بمانپارێزێ لەو ڕاڕەوە خراپانەی (أَهْل البِدْعَة) لە سەرن: (مِثْلِ الْمُشَبِّهَةِ) وەکو ئەو کەسانەی خواو سیفەتەکانی خوا، وە خەڵك ئەچوێنن (وَالْمُعْتَزِلَةِ) وەکو (مُعْتَزِلَة) کە ئەڵێن: گوناهباری گەورە نە کافرەو نە ئیماندارە (وَالْجَهْمِيَّةِ) کە ئەڵێن: خوا سیفەتی نیەو خوا لە هەموو شوێنێکە (وَالْجَبْرِيَّةِ) کە ئەڵێن: بەندە لە کردەوەکانیدا زۆرلێکراوە (وَالْقَدَرِيَّةِ) کە باوەڕیان بە قەزاو قەدەر نیە (وَغَيْرِهِمْ مِنَ الَّذِينَ خَالَفُوا السُّنَّةَ وَالْجَمَاعَةَ) جگە لەوانەش: لەو گرۆهانەی دژ بە (أَهل السُّنَّة والجَمَاعة)نو (وَحَالَفُوا الضَّلاَلَةَ) پشتگیری (أَهْل البِدْعَة وَالضَّلاَلَة) ئەکەن وەکو: (الخَوارِج)، کە ئەڵێن: تاوانباری گەورە کافرە، (جَمَاعَة)ش لە دوای کەس ناکەنو ئەڵێن: (إجماع) یەکدەنگی زانایانی (سَلَف) بەڵگەی شەرعی نیە. هەم وەکو (شِيعَة)، چونکە دژایەتی (خَلِيفَة)کانی پێغەمبەرﷺ ئەکەن، هەم وەکو (مُجَسِّمَة) کە ئەڵێن: خوا لە سەر (عَرْش) نیشتەجێیەو

وَنَحْنُ مِنْهُمْ بُرَءاءُ وَهُمْ عِنْدَنَا ضُلاَّلٌ وَأرْدِيَاءُ، وبِاللهِ الْعِصْمَةُ وَالتَّوفِيقُ.

لاشەو ئەندامی هەیە (وَنَحْنُ مِنْهُمْ بُرَءاءُ) ئێمە لەوانە جیایینو دژی ئەوانەین (وَهُمْ عِنْدَنَا ضُلاَّلٌ وَأرْدِيَاءُ) ئەوانە گشتیان بەلای ئێمەی (أهل السُّنَّة)وە، سەرلێشێولو و پیاو خراپن هەروەك لە شوێنی خۆیدا باسی گشت ئەم گرۆهانەمان کرد: لەم (عَقِيدَة)یەدا (وَبِاللهِ الْعِصْمَةُ وَالتَّوْفِيقُ) هەر بە پشتیوانی خوای گەورەیە خۆ پاراستن لەم گرۆهانە، هەم ئاسانکردنو بردنە سەر ڕێگەی ڕاست، آمین...کۆتایی.

## ﴿ دوا ووتەی ڕوونکەرەوە ﴾

﴿يارَبَّنا لَكَ الْحَمْدُ كَمَا يَنْبَغِي لِجَلاَلِ وَجْهِكَ وَلِعَظِيمِ سُلْطَانِكَ لاَ أُحْصِي ثَناءً عَلَيْكَ أَنْـتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ﴾، دووبارە هەزار هەزار جار ﴿الْحَمْدُ للهِ حَمْداً يُوافِي نِعَمَهُ وَيُكَـافِيءُ مَزِيدَهُ، وَأُصَلِّي وَأُسَلِّمُ أَلْفَ أَلْفَ صَلاَةٍ وَسَلاَمٍ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّـدٍ إِمَـامِ (أَهْـلِ السُّـنَّةِ وَالْجَماعَةِ) وَعَلَى آلِهِ وَأَصْحابِهِ، صَلاَةً وَسَلاَماً دائِمَيْنِ مادَامَ مُلْـكُ اللهِ تَعَـالَى، آمـين﴾، سوپاس بۆ تۆ ئەی خوای گەورە: کە یارمەتیت دام (العَقِيدَةُ الطَّحاوِيَّة)–کە دانراوی ئیمامی (الطحاوي) بوو– ڕوون بکەمەوە بە زمانی شیرینی کوردی، دیسان سوپاست ئەکەم خودایە، کە ئەم ڕوونکردنەوەیە کۆتایی هات لە ڕۆژی سێشەممە (٢٦)ی (رَبِيع الأوّل) سالّی (١٤١٦)ی کۆچی، خوایە لێت ئەپاڕێمەوە ئەم ڕوونکردنەوەیە بکەی بە دانراوێکی سوودبەخش بۆ گەلی کوردی موسولّمان، خوایە: لە خۆمو دایکو باوکم خۆش بەو دوا کردەوەمان چاك بکەو بە ئیمانەوە بمانمرێنە، لە گەلّ چینی (أهل السُّنَّة والجَماعة) لە ژێر ئالاّی حەزرەتی (مُحَمَّد)ﷺ حەشرمان بکە، خوایە لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزەو بە بەهەشت شادمان بکە، آمین، منیش بەندەی بەند کراو بە داوی تاوان، خزمەتکاری (أهل السُّنَّة والجَماعة):

**عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی**

**هەولێر ـ کوردستان**

٢٦ی ربیع الأول (١٤١٦)ی کۆچی

٢٨ی گەلاوێژ (٢٦٩٥)ی کوردی

١٩ی أیلول (١٩٩٥)ی زایینی

## ﴿ ناوەڕۆکی ڕوونکردنەوەی (العقيدة الطحاوية) ﴾

## ﴿ ناوەڕۆکی ڕوونکردنەوەی (العقيدة الطحاوية) ﴾



ژمارەی سپاردن – لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان –(٩٣٣) ساڵی (٢٠٠٧)

## ئەم كتێبە:

- ڕوونكەرەوەی (العَقيدَة الطَحاوِيَّة)یە، لە سەر ڕاڕەوی (أهل السّنَّة والجَماعة) بەگوێرەی تێگەیشتنی (السَّلَف الصَّالح) لە قورئان‌و حەدیس.
- باسی (التَّوْحيد)-یەكخوا ناسین‌و (وَحْدانيَّة)-تاك‌و تەنیایی خوا: لە (ذَاتُ وَصِفات)و لە (أُلوهيَّة)و لە (رُبُوبيَّة)دا، بە درێژی ڕوون ئەكاتەوە.
- باسی (الأَسْماء وَالصِّفات)-ناو و سیفەتەكانی خوای گەورەو (آياتُ الصِّفات)و (أحاديثُ الصِّفات) ڕوون ئەكاتەوە.
- باسی كافربوون‌و هەر چوار جۆرەكانی (كُفر)ی تێدا ڕوون كراوەتەوە، بە تیشكی قورئان‌و حەدیس.
- باسی پێشەوای موسوڵمانان‌و (جهاد)و بانگەوازی ئیسلام‌و دۆستایەتی‌و دوژمنایەتی-(الْوَلاَءُ وَالْبَرَاءَة) بە زەقی ڕوون ئەكاتەوە.
- هەر كاتێك لەگەڵ (أهْل البِدْعَة وَالضَّلالَة) ڕووبەڕوو ئەبێتەوە، لە دەریای زانستی (الإعْتِقاد)ی ئیمامی (البَيْهَقي)و (شرح صحيح البخاري)و (شرح صحيح مسلم) جامەی ناو هەڵدێنجێ‌و تێنووەتیی قوتابیان ئەشكێنێ‌و پڕوشكە ئاگرەكانی (أهْل البِدْعَة) ئەكوژێنێتەوە.
- بۆ سەلماندنی هەر باسێك بە چەكی (أهل السّنَّة) مەیدان لە (أهْل البِدْعَة) ئەخوازرێتەوەو پێیان ئەڵێ: (ئەوە ئەڕێ‌و ئەوە گەڕێ)، ئەگەر چیتان لە هەنبانەدا هەیە، هەڵیڕێژن ﴿قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ بەڵگەی خۆتان بێنن ئەگەر ئێوە ڕاست ئەكەن‌و ڕێبازتان ڕاستە. تاكو بە ئەشتەری قورئان‌و حەدیس بەڵگەكانتان پوچەڵ بكەینەوە.